PHILOSOPYH & SCIENCE

4 زنجیرەی فەلسەفە و زانست

# گەشتی عەقڵ

A

THERE IS NO GOD

ANTONY FLEW







دکتۆر عمرو شریف

وەرگێڕانی

مزەفەر عەولا قەسرێی

2017



# گەشتی عەقڵ


**نوسینی**
عەمرو شەریف
**وەرگێرانی**
مزەفەر عەولا قەسرێی
**پێداچونەوەی**
د. جەعفەر گوانی
**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
**نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ**

**خــەتی بــەرگ**
نــەوزاد کۆیـی
**قەبارەی کتێب**
٢٤×١٧- ( ٣٨٥ ) لاپەڕە
**نۆرە و ساڵی چاپ**
یەکەم ١٤٣٨ ك - ٢٠١٧ ز
**تـــــیراژ**
١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی ( ٤٤٠ ) ی ساڵی ٢٠١٦ ی پێدراوە





**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com


/TafseerOffice

# گەشتی عەقل

نوسینی

دکتور عمرو شریف

وەرگێرانی

مزەفەر عەولا قەسرێی

پێداچونەوەی

د. جەعفەر گوانی

## بەرلەوەی ئەم کتێبە بخوێنیتەوە

سێر (ئەنتۆنی فلو (Sir Antony Flew)[١] مامۆستای فەلسەفەی بەریتانی، ناوێکی درەوشاوەی بوارەکانی هزر و فەلسەفە و بێباوەڕیی و دینداریییە! یەکێك بوو لە گەورەترین بێباوەڕەکانی سەردەم و، نووسینەکانی بەدرێژایی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لە سەرەوەی لیستی هزری بێباوەڕیدا بوون.

لە نۆی دێسەمبەری ساڵی٢٠٠٤جیهان سەرسام بوو بە هەواڵێك کە هێشتا لە ناوەندە فەلسەفی و زانستی و رۆشنبیری و ئاینییەکاندا دەنگ دەداتەوە، ئەنتۆنی فلو (دوای هەشتا ساڵ تەمەن) باوەڕی بەوە هێنا کە (خودا) بوونی هەیە. تۆڕی هەواڵی ئەسۆشێتد پرێس هەواڵەکەی بەم شێوەیە بڵاوکردەوە:

((بێباوەڕێکی بەناوبانگ بەبەڵگەی زانستی باوەڕ بە (خودا) دەهێنێت)).

Leading atheist now believes in God، more or less based on scientific evidence.

ئەم هەواڵە هاوڕێ و قوتابییەکانی ئەنتۆنی فلوی تووشی هیستریا کرد، بە ئەندازەیەك کە ڕاگەیاندنە سەربەخۆکانی رۆژئاوا پڕبوون لە گاڵتە پێکردنیان!

چەندین جار داوا لە ئەنتۆنی فلو کرا کە کتێبێك بنووسێت و گەشتەکەی بخاتەڕوو لە منداڵێکی باوەڕدار بۆ پیاوێکی بێباوەڕ بۆ پیرە پیاوێکی هەشتا ساڵە کە باوەڕ بە بوونی (خودا) دەکات. لە کۆتاییدا لە ساڵی ٢٠٠٧ کتێبە چاوەڕوانکراوەکەی دەرچوو:

---

(١) لە ١٩٢٣/٢/١١ لە لەندەن لەدایك بووە.

((خودایەك هەیە: چۆن دڕندەترین بێباوەڕ لەبێباوەڕی پەشیمان بووەوە))

There is a God: How the world's most notorious atheist changed his mind.

ئێمە لەم کتێبەماندا (گەشتی عەقڵ) کتێبەکەی ئەنتۆنی فلو (خودایەك هەیە) دەخەینەڕوو، پاشان پرسی پەیوەندی نێوان ئایین و عەقڵ و زانست دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە. بەوپێیەی کتێبەکەمان لە بارەی فەیلەسوفە گەورەکەیە، کە لە بێباوەڕییەوە بەرەو باوەڕبوون بە خوا ڕۆیشتووە، دوای ئەوەی چەمکی فەلسەفی و زانستییەکانی خۆی ڕاستکردەوە، لەبەر ئەوە پێویستە لەم پێشەکییە تیشکێك بخەینە سەر بێباوەڕیی هاوچەرخ و چۆنیەتی سەرهەڵدانی، هەروەها پێناسەیەکی فەلسەفە و زانست و پەیوەندییان بە ئایینەوە بکەین، تا بتوانین شانبەشانی ئەو گەشتە زانستییە بەتام و چێژە بڕۆین.

یەکەم: سەرهەڵدانی بێباوەڕیی هاوچەرخ و خاسیەتەکانی[1] بۆ ئەوەی ئەندازەی ئەو ئازارە بزانین کە بێباوەڕانی جیهانی ڕۆژئاوا بەهۆی هەڵوێستی نوێی ئەنتۆنی فلو تووشی بوون، پێویستە ئەو بارودۆخە بزانین کە لە ئەوروپا دەوری سەرهەڵدانی بێباوەڕی هاوچەرخی داوە.

چیرۆکەکە پێش چەند سەدەیەك دەستپێدەکات...

تا پێنج سەد ساڵی ڕابردوو، سەرچاوەی سەرەکی زانست لە ئەوروپا کتێبی پیرۆز بوو، بە هەردوو (پەیمانی کۆن: تەورات و، پەیمانی نوێ: ئینجیل)، هەروەها پیاوانی ئایین لە کڵێسای کاسۆلیکی بۆچوونە زانستییەکانی (ئەرستۆ) و (پەتلیمۆس)[2] یان دەربارەی گەردوون و هەسارەی زەوی و فیزیا و کیمیا و مێژووی سرووشتیی.. وەردەگرت و بە چەمکە پیرۆزەکانەوە دەیانبەستەوە.

---

(١) لە پێشەکی کتێبی (الدین والعقل الحدیث)ی فەیلەسوفی ئەمریکی والتەر ستیس وەرگیراوە.

(٢) پەتلیمۆس ptolemy: لە شاری تیبەی میسر لە ساڵی ٨٥ی زایینی لەدایك بووە و، لەشاری ئەسکەندەریە لە ساڵی ١٦٥ی زایینی مردووە. زانایەکی گەردوونی و بیرکاری و جوگرافی بووە و، یەکێك بووە لە بەناوبانگترین زانایانی مێژووی کۆن. بۆچوونە گەردوونییەکانی تا سەدەکانی ناوەڕاست هەر بڵاو بوون.

بە پشت بەستن بەم سەرچاوانە، مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپا بەم شێوەیە وێنەی جیهانی دەکێشا:

١- زەوی لە چەقی گەردووندا وەستاوە و خۆر و مانگ و هەسارەکانی دی بە دەوریدا بەشێوەی بازنەیی دەخولێنەوە.

٢- خوا جیهانی لە ساڵی ٤٠٠٤ پ.ز دروستکردووە و، ئەم بەروارەش کڵێسا لە کۆکردنەوەی تەمەنی نەوەکانی پێشو؛ لە کوڕەکانی ئادەمەوە دەستی کەوتووە، هەروەك لە تەوراتدا لە (سفرالتکوین)دا هاتووە[١].

٣- کۆتایی جیهان (ڕۆژی قیامەت) لە بەروارێکی زۆر دوور نییە، ساڵی ٤٠٠٤ ز. بۆ ئەوەی کە ژیانی مەسیح بکەوێتە ناوەڕاستی مێژووی جیهان.

٤- خوا لە ڕابردوودا جیهانی دروستکردووە، هەروەك چۆن مرۆڤەکان خانو و ئامراز و کەلوپەل دروست دەکەن. تاکە جیاوازی ئەوەیە کە خەڵك ئەو کەلوپەلانەی دروستیان دەکەن لە کەلوپەلی تر دروستی دەکەن.

٥- هەموو شتێك لە جیهاندا بەپێی نەخشەیەکی خودایی دەڕوات، هەموو شتێك لە گەردووندا ئامانجێکی هەیە. خۆر بۆ ئەوە دروستبووە تا لە ڕۆژدا ڕووناکی بۆ مرۆڤ فەراهەم بکات، لە شەویشدا مانگ ئەم کارە دەکات، هەروەها پەلکەزێڕینە بۆ ئەوەیە ئەو بەڵێنە بە بیر مرۆڤ بێنێتەوە کە بە نوح پێغەمبەری دابوو، بەوەی جارێکی تر بە لافاو ڕەگەزی مرۆڤایەتی لەناو نەبات.

ئەگەر شتی پیس و زیانبەخش بوونی هەبێت، وەك جانەوەر و مار و مەگەزەکان، ئەوە بۆ ئەوەیە مرۆڤی پێ سزا بدرێت، لەسەر تاوانە سەرەکییەکە، کاتێك ئادەم بێ فەرمانی خودای کردوو لە درەختەکەی خوارد.

---

(١) پەیمانی کۆن، کتێبی پیرۆزی جولەکەیە و، وەك بەشی یەکەمی کتێبی پیرۆزیش لەلای مەسیحییەکان سەیر دەکرێت. تەوراتی موسا یەکەمین بەشی پەیمانی کۆن و گرنگترین بەشیەتی؛ بۆیە دەکرێ هەندێ جار بەتەنیا ناوی تەورات لەو بەشەش بنرێت. (سفرالتکوین) یەکەمین بەشی پێنج تەوراتەکەیە و باسی دروستبوونی بوونەوەر دەکات تا دەگاتە وەفاتی یوسفی پەیامبەر (علیه السلام).

لە کۆتاییدا، عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت هەموو نهێنییەکانی نەخشەی خودایی بزانێت. بەڵکو لەسەریەتی متمانەیەکی تەواوی بەوە هەبێت، کە هەموو شتێك ئامانجێکی هەیە.

٦- جیهان سیستەمێکی ڕەوشتی دەنوێنێت، ئەم بیرۆکەیە لە مێژووی عەقڵی و ڕۆحی ڕەگەزی مرۆڤایەتیدا زۆر گرنگە. ئەم بیرۆکەیە ئەوە دەگەیەنێت کە بنەما ڕەوشتیەکان (وەك چاکە و خراپە) خوا دیارییان دەکات، نەوەك پشت ببەستێت بە ویستی مرۆڤەکان و بەرژەوەندی و هەست و سۆزیان.

٧- لە پشت هەموو ئەمانەوە خودایەکی بەدیهێنەر هەیە، کە مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاست بەم شێوەیە وێنەی کردبوو، بەوەی عەقڵێکی هۆشیارە یان ڕووحێکە، کە لاشەیەکی ماددی نییە، بیرۆکە و بۆچوونی هەیە، لەوانەیە کاردانەوەو هەست و سۆزیشی هەبێت.

٨- پیاوانی کڵێسا واسیتە و پەیوەندی نێوان خوا و خەڵکن، لە وەرگیرانی تەوبە و دەستکەوتنی لێخۆشبوون و چوونە بەهەشت.

هەژموونی پیاوانی کڵێسا بەسەر ئایین و زانستدا هێزێکی گەورەی دەسەڵات و پارە و پوولی پێبەخشین. بۆ ماوەیێکی زۆر کڵێسای کاسۆلیکی لە ڕۆما دەسەڵاتی خۆی بەسەر گەلانی ئەوروپا و فەرمانڕەواکانی سەپاندبو، تاگەیشتبووە ئەو ئاستەی ئەوان فەرمانڕەواکانیان دادەنا و لایاندەبرد.

جا لەبەر ئەوەی هەستی ئایینی هەستێکی سرووشتییە، خەڵك ئەو هەژموونەیان قبووڵ کرد و ئازادی و هەرچی هەیانە کردیانە قوربانی بۆ بەرژەوەندی پیاوانی ئایین[1].

---

(١) دەسەڵاتی پیاوانی ئایین بەسەر خەڵکی ئاسایی و فەرمانڕەواکاندا لە مێژوودا زۆر دووبارە بۆتەوە. میسرییە کۆنەکان وەك خوا سەیری فەرمانڕەوا فیرعەونەکانی خۆیان دەکرد و وەك پەیوەندی نێوان خوا و خەڵك سەیری پیاوانی ئایینیان دەکرد، بۆیە کاتێك ئەخناتون بەرەنگاری دەسەڵاتی پیاوانی ئایین بووەوە، کوشتیان و توت عەنخ ئامونیان وەك فیرعەون و خوا لەجێ دانا!

پاشان کارەساتە گەورەکە ڕوویدا، کاتێك کۆپەرنیکۆس[1] بە حیسابە بیرکارییەکانی و گالیلۆ[2] بە تەلیسکۆبەکەی ئەومیان ئاشکرا کرد کە زەوی چەقی گەردوون نییە، بەڵکو تەنیا هەسارەیەکی سەر بە کۆمەڵەی خۆرە. ئەوان بە قورسی باجی زانست و بوێرییەکەیاندا؛ بەوەی کە کڵێسا هەڵمەتێکی بێویژدانانەی دەستپێکرد بە سزادان و کوشتنی زانایان، بەو تۆمەتەی ئەوانە جادووگەرن و خەڵك دەخەڵەتێنن.

هەروەها دۆزینەوەی مایکرۆسکۆپ لە ساڵی ١٥٩٥ کارەساتێکی تر بوو، بەوەی زانایان بۆ یەکەمجار توانیان بەکتریاکان ببینن، تا دواتریش سەلمێنرا کە بەکتریاکان هۆکاری زۆر نەخۆشین. ئەمە چۆن؟! ئەدی خوا (یان شەیتان) نین تاعون و پەتاکان بۆ مرۆڤ دێنن؟ چۆن بەکتریاکان دەتوانن ئەمە بکەن، کەواتە، دوعاکانی پیاوانی ئایین (بە کرێ) ناتوانن نەخۆشیەکان چارەسەر بکەن؟

---

(١) کۆپەر نیکۆس: فەلەکناسێکی پۆڵەندییە (١٤٧٣-١٥٤٣) بیردۆزەکەی لە کتێبی Derevolution bus or bium coelestium دا بڵاوکردەوە، کە لە ڕۆژی مردنیدا دەرچو.

(٢) گالیلۆ گالیلی: فەلەکناسی بەناوبانگی ئیتاڵی (١٥٦٤-١٦٤٢)

# ئیسحاق نیوتن و..
# سیستەمی جیهان...

بەهۆی بلیمەتی ئیسحاق نیوتن (١٦٢٤-١٧٢٧) توانا زانستییەکان گەیشتنە لوتکە، کاتێك بنچینەکانی زانستی هاوچەرخی دامەزراند. نیوتن مەسیحییەکی دامەزراو بوو، بێگومان خۆشی تووشی شۆك دەبو گەر بیزانیایە کە دۆزینەوە زانستییەکانی پایەکانی ئایین لە ڕۆژئاوادا ئاوەژوو دەکەنەوە.

نیوتن سێ یاسا بەناوبانگەکەی جووڵەی دۆزییەوە، لەگەڵ یاسای هێزی کێشکردن، لە ڕێگەی ئەم یاسایانە - بە وردی - بنچینەی کۆمەڵەی خۆر (خۆر و هەسارەکانی دەوری ) وەسف کرد.

هەر بەو یاسایانە وەسفی کەوتنی سێوەکە و، وەسفی ئەنجامی بەریەککەوتنی دوو شەمەندەفەر دەکات.

بۆیە فیزیاییەکان سیستەمی خۆر (وەك نیوتن باسی کردووە ) وەك کاتژمێری زەنبەرکی دەبینن، کە پڕ دەکرێت پاشان وازی لێدەهێنرێت و خۆی کاردەکات.

هێزی کێشکردن و، هێزی دەرکردنی ناوەندیی و یاساکانی جوڵە، بەسن بۆ پارێزگاریکردن لە کارکردنی سیستەمی کۆمەڵەی خۆر، بەبێ دەستتێوەردانی دەرەکی.

بیرۆکەی سیستماتیکی جیهان، وەك ئاگر بە پوشدا بڵاو بووەوە، ئیتر زانا و فەیلەسوفەکانی ئەوروپا هەموو شتێکیان لە ڕووی سیستماتیکەوە لێکدەدایەوە. تەنانەت تۆماس هۆبز (فەیلەسووفی بێباوەڕی بەناوبانگی بەریتانی) کاری

کۆئەندامەکانی لاشەی مرۆڤی بە کۆمەڵێك ئامراز دەچواند کە یاسای فیزیایی کاریان پێدەکەن.

نیوتن تێبینی جیاوازییەکی کەمی کردبوو لە نێوان ڕێڕەوی هەسارەکان کە حیساباتەکانی ئەو دیاری کردبو، لەگەڵ ئەو ڕێڕەوە کردەییەی تەلیسکۆب دەریدەخست. جا ئەگەر ئەو جیاوازیانە بە تێپەڕبوونی کات کەڵەکە ببن، ئەوا سیستەمی گەردوونی ئاوەژوو دەبێتەوە؛ بەجۆریك کە خۆر هەسارەکان قوت دەدات، یان ئەوەتا لەژێر کۆنترۆڵی دەردەچن و بە بۆشایی پان و بەریندا بڵاو دەبنەوە.

نیوتن بەسەر ئەو کیشەیەدا زاڵ بو بەوەی کە باوەڕی بەوە هێنا کە خوا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر ڕێچکەی هەسارەکان ڕێکدەخاتەوە! ئەمە دوایین جار بو کە زانایەکی گەورە بیرۆکەی دەستێوەردانی هێزێکی نادیار بۆ دیاردەیەکی سروشتی لێك بداتەوە.

پاشان فەلەکناسی فەرەنسی مارکێز لابلاس (١٧٤٩-١٨٢٧) سەلماندی کە ئەو لادانانەی نیوتن نەیتوانی بە یاسای سرووشتی لێکی بداتەوە کەڵەکەبوون نییە و دوای ماوەیەك یەکتر ڕەتدەکەنەوە، بۆیە پێویستی بە دەستێوەردانی خودایی نییە بۆ ڕاستکردنەوەی. لەبەر ئەوە کاتێك (ناپلیۆن) دەربارەی ڕۆڵی خوا لە سیستەمی گەردوون پرسیاری لێکرد، لابلاس وتی کە پێویست بەو گریمانەیە ناکات!!

## بێباوەڕیی سەرهەڵدەدات...

بەڵام، چۆن ئەو دۆزینەوانە و (زۆری تر) بوونە هۆی دروستبوونی ناکۆکی لە نێوان زانست و ئایین لە ئەوروپادا؟

ململانێی نێوان زانست و ئایین بەهۆی دۆزینەوەیەکی زانستی تایبەت نەبو کە لەگەڵ بیروباوەڕێکی تایبەتی ئایین تێك گیرابێت.

هەروەها ئەو بۆچونانەی کە دەبو کڵێسا بۆ زانست وازیان لێبێنێت، بەو ئەندازەیە بۆ ئایین پێویست نەبوون.

**بنچینەکانی ئایین لە سێ خاڵدا کورت دەبنەوە، کە پێی دەڵێین (دیدی ئایینی بۆ جیهان):**

١- خودایەك هەیە کە گەردوونی بەدیهێناوە.

٢- خوا نەخشەیەکی گەردوونیی یان ئامانجێکی گەردوونیی لە درووستکردنی بوونەوەردا هەیە.

٣- جیهان سیستەمێکی ڕەوشتی دەردەخات کە خوا دیاریدەکات.

بە دڵنیاییەوە لە سەرەتای شۆڕشی زانستی لە سەدەی حەڤدەهەم - تائێستاش - هیچ دۆزینەوەیەکی زانستی یان بیرۆکەیەکی لۆژیکی دەرنەکەوتووە کە لەگەڵ ئەم بنچینانەدا تێك بگیرێت، ئەو بنچینانەی ئەگەر نەبن ئایین دەڕوخێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، شۆڕشی زانستی کاریگەرییەکی وێرانکەری بۆ سەر ئایین هەبو؛ بەو پێیەی کە ڕاستەوخۆ تەوژمێکی گوماناوی بێباوەڕیی گەورەی بە

دوای خۆیدا هێنا و، سەدەی هەژدەمی کردە گەورەترین سەدەی گومان لە مێژووی هاوچەرخدا، بە جۆرێك کە پاشای ئینگلتەرا سکاڵای ئەوەی دەکرد کە نیوەی قەشەکانی کڵێساکەی بێباوەڕن!

چۆن شۆڕشی زانستی بووە هۆی لەرزاندنی دیدی ئایینی بۆ جیهان، سەرەڕای ئەوەی کە ئەگەر زەوی چەقی گەردوون بێت، یان تەنیا شوێنکەوتوویەکی کۆمەڵەی خۆر بێت، ئەمە بەهیچ شێوەیەك ڕێگر نییە لەبەردەم بوونی خودایەك کە هەموو شتێکی بەدیهێناوە؟

پرسیارێکی لۆژیکی تر: ئایا ڕاستگۆتر و دڵسۆزتر و دادگەرتر دەبین کە دەست بە یاسای جووڵەی ئەرستۆ بگرین و بە یاساکانی جوڵەی نیوتن نەیانگۆڕینەوە؟! بۆچی شۆڕشی زانستی دانی بەوە دانا کە جیهان سیستەمێکی ڕەوشتییە، هەروەك چۆن ئاینەکان دەیبینن؟

بۆچی...

بەدڵنیاییەوە سەرهەڵدانی بێباوەڕیی و نکۆڵی کردن لە (بنچینەکانی دیدی ئایینی) بە هیچ جۆرێك کێشەیەکی زانستی نەبو، بەڵکو کێشەیەکی دەروونی فەلسەفی بوو!

کلیلی تێگەیشتن لەو کێشەیە لەوەدایە کە عەقڵی مرۆڤ بەم شێوەیە کارناکات وەك لۆژیکییەکان دەیڵێن. ئەگەر کەسێك بەبیرۆکەیەکی دیاریکراو (أ) باوەڕی هەبێت، بەشێوەیەکی لۆژیکی بڕوات باوەڕ بە بیرۆکەی (ب) بێنێت، ئەوا واقیع پێمان دەڵێت کە ئەم گواستنەوە لۆژیکییە ڕیزبەڕە نەك ڕێسا! چونکە بە گشتی و زۆربەی ئەم گواستنەوە هزریانە دەروونین نەك لۆژیکی.

کەواتە، ئەو هۆکارە دەروونیە (سایکۆلۆژی)یانە چین کە بوونە هۆی دەرکەوتنی ئەم ڕەوتە گومانییە بێباوەڕییە گەورەیە؟

یەکەم: گومان لەوە دانییە کە ئەو زوڵم و ستەم و چەوساندنەوەی زانایان لە سەر دەستی کڵێسا توشی بوون، هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی زانا و بیرمەندان هەڵوێستێکی

دوژمنکارییانە لە دژی ئایین وەربگرن، کە کاریگەری لەسەر هەڵوێستی خەڵکیش دانا.

**دووەم:** ئەگەر نیوتن پەیوەندی خوا و گەردوونی گێڕابێتەوە بۆ سەردەمی درووستبوونی کۆمەڵەی خۆر و ڕۆڵێکی بۆ خودا هێشتبێتەوە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر لە ڕێکخستنەوەی خولگەکان، ئەوا لابلاس ئەو پەیوەندییە دەگێڕێتەوە بۆ سەرەتای درووستبوونی گەردوون و ڕۆڵی خوای لە ئەنجامدانی هەموو ڕۆڵێکی گەردوونی ڕەتکردۆتەوە.

بەمەش بۆچوونی کڵێسا هەرەسی هێنا دەربارەی ئەوەی کە خوا پێش شەش هەزار ساڵ گەردوونی درووستکردووە و ئادەمی باپیرەمانی بەدەستەکانی خۆی درووستکردووە، ئەو بۆچوونەی ئەوەی دەگەیاند کە پەیوەندییەکە زۆر نزیکە و خودا زۆر گرنگیمان پێدەدات.

بە هەمان شێوە هەستکردن بە نزیکی خودایی بەهێز دەکرا بە باوەڕبوون بە دەستتێوەردانی ڕاستەوخۆی خودایی لە ژیانی مرۆڤدا؛ بۆیە هەورەتریشقە دوژمنانی ئایین لەناو دەبات، بوومەلەرزە لە فەرمان دەرچووەکان سزا دەدات.. بەڵام لێکدانەوە زانستییەکان بۆ ئەم دیاردانە، هیچ بوارێکی بۆ ئەم لێکدانەوانە نەهێشتەوە.

**سێیەم:** ئەوانەی (دەیانویست دارەکە لەناوەڕاستەوە بگرن) دەیانگوت کە خودا جیهانی بەدیهێناوە و یاسا سروشتیەکانی بۆ داناون کە جیهان هەڵدەسوڕێنن. ئەمە واتای ئەوەیە کە خودای بەدیهێنەر ئیتر هیچ شتێك بۆ ئێمە ناکات و بچووکترین کاریگەری لەسەر ڕووداوەکانی جیهان نییە. بەکورتی خودایەك کە هیچ گرنگی نییە و پێویستیمان پێی نییە!

**چوارەم:** زانست سەرکەوتوو بوو لە لێکدانەوەی دیاردە سرووشتیەکان بەشێوەیەك کە پێویستی بە گەڕان بەدوای ئامانجێکدا نەبێت. هەروەك چۆن بەشێوەیەکی بەرچاو سەرکەوتوو بوو لە پێشبینی کردنی دیاردە سرووشتییەکانی وەك خۆرگیران و مانگ گیران و لافاو و ڕەشەبا. ئەمەش خزمەتێکی ڕاستەوخۆی پێشکەشی

مرۆڤ کرد، ئیتر لە ڕۆژێکی دیاریکراودا لە ترسی لافاوێکی پێشبینی کراو نەدەچووە دەریا...

لەبەرئەوە مرۆڤ باوەڕی بە سادەیی و بێهێزی لێکدانەوەی پیاوانی ئایین و پێشبینیەکانیان کرد.

**پێنجەم:** مرۆڤی سەردەمی زانست باوەڕی وابو کە سەرکەوتنی لێکدانەوەی ماددی بۆ دیاردە سرووشتیەکان و وونبونی ئامانجداریی ڕووداوەکانی گەردوون، واتا ونبوونی ئامانجی دروستبوونی گەردوون.

**شەشەم:** کاتێك هیچ ئامانجێك بۆ خودا نەمایەوە لە بەدیهێنانی مرۆڤدا و ڕۆڵی لە ژیاندا نەما، هیچ بیانووێك نەما کە ڕێسا ڕەووشتییەکانیان بۆ دابنێن (کە چی بکەن و چی نەکەن). بەم شێوەیە شۆڕشی زانستی ئەو باوەڕەی ڕووخاند کە جیهان سیستەمێکی ڕەوشتییە، ئیتر بەها ڕەووشتییەکان بەسترانەوە بە بەرژەوەندییە ماددیە ڕاستەوخۆکانی مرۆڤ.

**حەوتەم:** زانستی سەردەم دۆزینەوەی زانستی و ژیارستانی گەورەی پێشکەشی مرۆڤ کرد و خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندییەکی وای پێشکەش کرد کە ڕۆژێ لە ڕۆژان چاوەڕوانی نەدەکرد، بۆیە بیروباوەڕەکەی لە باوەڕبوون بە خودا گۆڕی بە باوەڕبوون بە زانست و توانا و داهێنانەکانی.

**هەشتەم:** لەبەر هەموو ئەمانە، بیرمەندان پرسیان: ئەگەر زانست هەنگاوێکی گەورەی نابێت سەبارەت بە تێگەیشتنی ئەو بابەتانەی بە میتافیزیکا لێکدەدرانەوە، وەك نەخۆشیەکان و هەورەتریشقە و بومەلەرزە و....، چ بەربەستێك هەیە لەبەردەم ئەوەی زانست بگاتە ئەو ئاستەی لێکدانەوە بۆ هەموو ئەو شتانە بکات کە میتافیزیکین؟ بەم شێوەیە بە تەواوی پێویستی بە ئایین و خودا هەڵوەشایەوە.

ئەو هۆكارە دەروونییانە[١] بیرمەندان و زانایان و خەڵكی ئاسایی سەدەی هەژدەهەمی خستەناو گۆمی گومانەوە، تا وای لێهات سەدەی نۆزدەهەم - بە بەراورد بە پێش خۆی - بە سەدەی گەڕانەوە بەرەو باوەڕ ناودەنرا، بەهۆی ئەو ڕەوتە ڕۆمانسییەی كە تێیدا دەركەوت. بەڵكو دەتوانین بڵێین كە عەقڵی عەلمانی هاوچەرخ بەرهەمی شۆڕشی زانستی سەدەی حەڤدەهەمە، نەوەك سەدەی نۆزدەهەم و سەدەی بیستەم.

لەگەڵ چوونە ناو سەدەی بیستەم، وتەی (ئایین تلیاكی گەلانە) دەركەوت كە كارل ماركس گوتی. مەبەستیشی ئەوە بوو كە دەوڵەمەندان و ئەرستۆكراتییەكان چەمكی ئایین بۆ بێهۆشكردنی هەژاران بەكاردەهێنن و ناچاریان دەكەن ئەم واقیعە تاڵە قبوڵ بكەن و لەبری ئەو چاوەڕێی فیردەوسی ژیانی دوای مردن بكەن.

---

(١) سەرەڕای هۆكارە عەقڵی و دەروونییەكان، كە لە سەدەی هەژدەهەمدا لە ڕكابەرێتی زانست و ئاییندا تای تەرازووی زانستیان یەكلاكردەوە، لێرەدا جۆرێك لە كەموكوڕی دەروونی Neurosis باس دەكەین، كە دەبێتە هۆی وەرگرتنی بیری بێباوەڕی لە ئاستی تاكەكەسیدا، بۆ ئەوەی لێكۆڵینەوەكەمان دەربارەی هۆكارە دەروونییە جۆراوجۆرەكانی پشت وەرگرتنی بیری بێباوەڕی بخەینەڕوو.

دوای لێكۆڵینەوەیەكی زۆر كە پسپۆڕی پزیشكی دەروونی زانكۆی نیویۆرك پۆل ڤیتز paul vits لەسەر زۆر كەسایەتی بێباوەڕی سەردەم ئەنجامی داوە گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی كە وەرگرتنی بێباوەڕی لەوانەیە هۆكارەكەی كەموكوڕییەكی دەروونی دەمارێت Atheism is aNeurosis كە ئارەزوونێكی شاراوەی لەپشتە بۆ ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی باوك و جێگرتنەوەی ( هەروەك سیگمۆند فرۆید ) دەڵێت. لە كاتێكدا لە پشت باوەڕبوون بە خواشەوە وەستاوە، بەڵام ئەمەیان بۆ هەستكردن بە ئارامی.

لەبەرئەوەی ڤیتز چەمكێكی داناوە كە ناوی ناوە (دیدی كەموكوڕی باوكایەتی Defective father hypothesis كە تێیدا پەیوەندییەك درووستدەكات لەنێوان دەسەڵاتی باوكی مرۆڤی و ئەو باوكەی لە ئاسمانە، بۆ ئەمەش چەند نموونەیەك دێنێتەوە. ئەوەتا فەیلەسووفی گەورەی فەرەنسی (ڤۆڵتێر)، كە بە یەكێك لە گومانكارە گەورەكان دادەنرێت زۆر ئازاری لە دەستی باوكی دیوە، تا ئاستێك ئازاری دیبو كە ڕەتیدەكردەوە كە ناوەكەی هەڵبگرێت. لیستەكەی فرۆید خۆیشی تێدایە و كارل ماركس و تۆماس هۆبز و ئەوانی دی.

هەروەك چۆن ڤیتز وای دەبینێت كە بێبەش بوونی منداڵ لە باوكی بەهۆی مردنەوە، لەلایەن منداڵ وەك خیانەت سەیری دەكرێت بەهۆی ئەوەی كە لە باوكیەتی بێبەشی كردووە و هەستی بێباوكی تێدا درووستكردووە، بۆ ئەمەش نمونە بە (جان پۆل سارتەر) و (بێرتراند راسل) دێنێتەوە.

پۆل ڤیتز تا نزیك تەمەنی چل ساڵی هەر بێباوەڕ بو، دوای ئەوە بووە باوەڕدار و گرنگی دا بە پەیوەندی نێوان ئایین و دەروونناسی ئەم بابەتەی لە كتێبە بەناوبانگەكەی Fath of the Psychology of Atheism بڵاوكردۆتەوە، كە لەساڵی ١٩٩٩ بڵاو كرایەوە.

لە بەرەنجامی هەموو ئەمانەش وتەی (فریدریك نیچە)[1] لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم گوتی:

ئایا خودا مردووە؟ Is God Dead? جا لە بری ئەوەی ئەم وتەیە وەك وتەی فەیلەسوفێك بمێنێتەوە کە باوەڕی پێی بوو، بەڵکو ئەم وتەیە بوو بە ناونیشانی دووبارەی ڕۆژنامەکان.

**هزری بێباوەڕی دەبێتە دوو بەشی گەورە:**

**أ- هزری بێباوەڕی بەهێز Strong (Positive) Atheism**

ئەوانەن کە بوونی خودا ڕەتدەکەنەوە و، بۆ ئەو بۆچوونەشیان بەڵگە کۆدەکەنەوە و بیردۆز بنیات دەنێن و بانگەشە بۆ بۆچوونەکەیان دەکەن.

**ب- هزری بێباوەڕی لاواز Weak (Negative) Atheism**

ئەوانەن کە هێشتا بەڵگەی تەواویان لەسەر بوونی خودا دەستنەکەوتووە. بێباوەڕانیش دەبن بە سێ کۆمەڵە:

**١-** زانا و فەیلەسووفان، کە ڕێچکەی بێباوەڕییان هەڵبژاردووە و بیردۆزی پەرەسەندنی داروینی (پەرەسەندنی زیندەوەران لەڕێی ڕێکەوت)یان کردۆتە بەڵگەی گەورەی زانستی خۆیان؛ بەو پێیەی کە ئەگەر میکانیزمی سیستەمی ماددی بۆ زیندەوەرەکان هەبێت، هیچ هۆکارێك نییە بۆ ئەوەی بڵێین زیندەوەر و گەردوون خوایەکیان هەبێ!

**٢-** شیوعییەکان، ئەوانەی دەیانەوێت کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان بکەنە کۆمەڵگای زۆرەملێیی سیستەمێکی وەك شاری مێرووله و هەنگ، ئەم ئامانجەش لەژێر سایەی بیروباوەڕە ئایینییەکان بەدی نایەت، بۆیە ئەوان پێیان وایە پێویستە ئەو بیروباوەڕانە لەناو ببرێن ئەگەر بەهێزیش بێت.

**٣-** ژمارەیەکی زۆر لە بێباوەڕە بێدەنگەکان! لەناو هەموو ئایین و کۆمەڵگا و ڕەگەزەکان، ئەوانەی گومانیان هەیە، بەڵام گومانەکەیان ناخەنە بەر گفتوگۆ.

---

(١) فریدریك نیچە: فەیلەسوفی بێباوەڕی ئەڵمانی بەناوبانگ (١٨٤٤-١٩٠٠).

هۆکاری گومانی ئەم کۆمەڵەیە بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە:

- لایەنی زانستی و فەلسەفی، کە هەڵگرانی ئەم جۆرە هزرە بێباوەڕییە بۆچوونە بەهێزەکانیان پێ دەردەبڕن.

- ئەو شێوازە داخراوەی کە بەهۆیەوە فێری ئایینەکانیان بوون، کە تێیدا مامۆستاکان هەموو ئەو لۆژیك و زانستەیان ڕەتکردۆتەوە کە پێچەوانەی بیرکردنەوەیان بووبێت، کە بە شێوازی (تەنیا بەم جۆرەیە just-so). هەروەك ئەو مامۆستایانە خۆیان بە تاکە تێگەیشتو لە زانستی خودا دەزانن و پێویستە ئەوانی دی تەسلیمی ئەو واقیعە ببن.

**هزری بێباوەڕی هاوچەرخ ئەم چەمکانە لەخۆ دەگرێت :**

١- گەردوون لەخۆیەوە درووستبووە، لە ئەنجامی چەند ڕووداوێکی هەڕەمەکی و بەبێ پێویستی بە درووستکەرێك.

٢- ژیان بەشێوەیەکی خۆکرد لە ماددەوە درووستبووە، لە ڕێگەی یاساکانی سرووشتەوە .

٣- جیاوازی نێوان ژیان و مردن جیاوازییەکی فیزیایی ڕووتە و، ڕۆژێ لە ڕۆژان زانست پەی بەو جیاوازییە دەبات.

٤- مرۆڤ جگە لە لاشەیەکی ماددی هیچی تر نییە و بە مردن لەناو دەچێت.

٥- بوونێکی ڕوون بۆ چەمکی (ڕۆح) نییە.

٦- لە دوای مردن ژیانێکی تر بوونی نییە.

٧- لە هەموو ئەو شتانەی پێشو، هیچ پێویستییەك بۆ بوونی خودا نییە.

٨- من بەو خاسیەتانە جیاوازییەك نابینم لەنێوان بێباوەڕیی هاوچەرخ و ئەو بێباوەڕییەی لە کاتی هاتنی ئایینە ئاسمانییەکان ڕووبەڕووی پێغەمبەران بۆتەوە.

**دووەم: فەلسەفە philosophy[1]**

گومان لەوە دانییە کە پەیوەندی نێوان زانست و فەلسەفە پەیوەندییەکی دێرینە. چونکە لە سەرەتادا هەردووکیان یەك بوون و ئامانجیان گەڕان بوو بەدوای ڕاستی و خزمەتی مرۆڤایەتی.

پاشان هەریەك لە زانستە سرووشتییەکان و مرۆڤایەتییەکان لە دایك (فەلسەفە) جیابوونەوە تا لەسەر پێی خۆیان بوەستن و بنچینە و ڕێباز و ئامانجی تایبەتی خۆیان هەبێت بۆ بەدیهێنانیان تێبکۆشن. زانستی سرووشتی کەوتە لێکۆڵینەوە لە دیاردەکانی گەردوون و پێکهاتەی گەردوون و یاسا و ڕێساکانی. زانای فیزیایی گرنگی دا بە لیکۆڵینەوە لە دیاردە سرووشتییەکانی ماددە و، زانای بایۆلۆجی گرنگی دەدا بە لێکۆڵینەوە لە زیندەوەرەکان، بەبێ بیرکردنەوە لە بنچینەی ماددە و ژیان و هۆکاری درووست بوونیان. زانای بیرکاریش گرنگی دەدا بە لێکۆڵینەوە لە ئەندازیاریی و حیساب (بەبێ بیرکردنەوە لە واتای کات و شوێن). هەمووشیان بە یارمەتی ئەو (عەقڵ)ەی کە پێیان بەخشراوە بیردەکەنەوە بەبێ بیرکردنەوە لە خودی عەقڵ و مەودای توانای گەیشتنی بە حەقیقەت.

سەرەڕای ئەوەش ڕەگی هەریەك لە زانستەکان بە بنچینەی یەکەمیانەوە بەستراوەتەوە، بۆیە زاناکان فەلسەفەی زانستەکان و فەلسەفەی پزیشکی و فەلسەفەی جوگرافیا و فەلسەفەی مێژوو و فەلسەفەی زمان و فەلسەفەی پەروەردە و .. هتد. دەخوێنن.

هەرچی فەیلەسووفە، دەیەوێت لە بنچینەی گەردوون و هۆکاری درووستبوونی و حەقیقەتەکەی و بنچینەی ماددە و هۆکاری درووستبوونی دەکۆڵێتەوە، هەروەها لەواتای کات و شوێن حەقیقەتی عەقڵ و توانای گەیشتنی بە حەقیقەت بکۆڵێتەوە. واتا فەیلەسووف لە وانە و توێژینەوەکانیدا لە یەك کاتدا لە عەقڵ و مەعقول دەکۆڵێتەوە.

---

(١) Philosophy: وشەیەکی یۆنانییە لە دوو بڕگە پێکهاتووە Philo = خۆشەویستی = Sophia دانایی. کەواتە پێناسەی زمانەوانیی بۆ فەلسەفە بریتییە لە: خۆشەویستی دانایی.

فەلسەفە بە تەنیا بە جیهانی سنووری هەستەوەرەکان وازناهێنێت، بەڵکو دەیەوێت (بەدیهێنەری) ئەم جیهانەش بناسێت، حەقیقەتی خوود و حەقیقەتی خاسیەتەکانی بزانێت.

مرۆڤ کێیە، حەقیقەتی چییە؟

چاکە چییە، جوانیی چییە، بۆچی چاکە چاکە و جوانیی جوانە؟ تا کۆتایی ئەو پرسیارانەی کە کۆتاییان نییە.

لەبەر ئەوەی دەگوترێت کە فەلسەفە سێ بەشی بنچینەیی لەخۆ دەگرێت:

- فەلسەفەی بوونگەرایی.
- فەلسەفەی زانیاری.
- فەلسەفەی بەهاکان.

بە ڕامان لەو سێ بەشە، بۆمان دەردەکەوێت کە ناوەڕۆکی فەلسەفە بریتییە لە (گەڕان بەدوای خودا). ڕێنێ دیکارت باسی لەوە کردووە، دەڵێت: (فەلسەفە درەختێکە، ڕەگەکانی میتا فیزیکا و بەرهەمەکەی ناسینی خودایە)). بۆیە فەلسەفە بەوە پێناسە دەکەن کە بریتییە لە: (هەوڵی عەقڵ بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و بنچینە و ئامانجی هەموو شتێك).

بزوێنەری یەکەمی مرۆڤیش بۆ گەڕان بەدوای دانایی و ئامانج، هەستکردنیەتی بە سەرسامی و لێشاوی پرسیارەکانی کاتێك بە ئەزموونێکدا تێدەپەڕێت، یان کاتێك ڕازێکی بە عەقڵدا دێت. لەبەر ئەوە ئەرستۆ گوتوویەتی: (بە سەرسوڕمان فەلسەفە دەستپێدەکات).

جا ئەگەر ئەو پرسانە گرنگی بە دواوەی سرووشت بدەن (کە پێیان دەگوترێ شتە خوایی و بیروباوەڕی و غەیبییەکان) ئەوا کاریگەرییان لەسەر ژیانی ڕۆژانەمان هەیە، هەر لەبەر ئەم هۆکارەش فەلسەفەی کرداری دەرکەوت کە گرنگی بە زۆر پرسی کرداری دەدات وەك:

- ڕێگای ژیانمان چۆنە.

- چۆن نەوەی نوێ بە پەروەردەیەکی باش پەروەردە بکەین.
- سەرکردەکانی وڵات چیان لەسەرە تا وڵات لەسەر ڕێی ڕاست بڕوات.

ئەو پرسانەش ئەوە دیاری دەکەن کە دەبێ ڕەوشت لەسەر چ شێوازێك بێت، هەروەك چۆن خۆیان لە ڕەوشت هەڵقوڵاون. کە سەرچاوەی یاسادانانن و خراپە قەدەغە دەکات و خراپەکاران رادەگرێت.

بەهۆی هزری بێباوەڕی هاوچەرخ، کە دەستی گرتبوو بەسەر عەقڵی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ ڕەنگدانەوەی بەسەر بواری فەلسەفە هەبوو، ئیدی دوو ڕێبازی فەلسەفی درووستبوون:

**کۆمەڵی یەکەم:** ئەو فەلسەفانەی گوزارشتیان دەکرد لە دیدی زانستی ماددی بۆ جیهان، لەوانە: هۆبز و هیوٚم و فەلسەفەی لۆژیکییەکانی وەك ئەلفرێد ئایەر و .. هتد.

**کۆمەڵەی دووەم:** ئەو فەلسەفانەی گوزارشتیان کرد لە دیدی ئایینی بۆ جیهان، لەوانە فەلسەفەی دیکارت و فەلسەفەی کانت[1].

---

(١) لێرەدا ڕاو بۆچوونی هەندێك لەو زانایانە دەخەینە ڕوو:

دیکارت پشتگیری لە دیدی سیستماتیکی هەموو دیاردەکانی جیهان دەکرد، جگە لە (دەروون) و(خودا). هەرچی هۆبزە ئەوا ئەو دیدەی گشتگیرتر کردووە و لەلای ئەو هەموو بوون دەگرێتەوە، تەنانەت دەروونی مرۆڤایەتیش دەخاتە بەر نەشتەری سیستمە ڕەوشتییەکەی؛ بەوەی کە لەلای ئەو چاکە ئەوەیە کە مرۆڤ ئاسودە دەکات و خراپە ئەوەیە کە خەمباری دەکات، بەو پێیەش ڕەوشت ڕێژەییە و هیچ پەیوەندییەکی بە خوداوە نییە.

هەرچی دێڤید هیومە ئەوا سیستماتیکی ڕەتدەکردەوە وەك ڕەتکردنەوەی بۆ ئامانجداری! بە هەموو جۆرێك یاساکانی سرووشتی ڕەتدەکردەوە کە دیدی سیستماتیکی بەڕێوە دەبرد! ئەو بە هەڕەمەکییەکی ڕەها سەیری هەموو بابەتەکەی دەکردو لەلای ئەو یاساکانی سرووشت تەنیا پەیوەندییەکی نێوان دیاردەکانن کە عەقڵی مرۆڤ خۆی درووستی کردوون!

لەلایەکەی تریشەوە، کانت بەربەچی هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی ڕێبازی سرووشتی ماددیگەرایی دایەوە کە یەکێك لە گەورەترین پاڵپشتەکانی خۆی بەڕێوەی دەبرد: دێڤد هیوم.

کانت کاریگەری لەسەر هەمو هزری مرۆڤایەتی دانا، تەنانەت زۆرێك لە گەورە فەیلەسوفەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ئینگلتەرا و ئەمریکا بە درێژایی سەد ساڵ دوای مردنیشی هەر لە قوتابییەکانی ئەو بوون.

لەوانەیە گرینگترین بەرهەمە هزرییەکانی کانت باسکردنی بوونی دوو جیهان بێت: جیهانی کات و شوێن، کە جیهانی دیاردە سرووشتییەکانە و زانست لێیدەکۆڵێتەوە و ڕێساکانی دەدۆزێتەوە. پاشان جیهانی بێ کات: ئەو جیهانە ئەزەلییەی زانست و عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت پێی بگات، بەڵکو ڕۆح لە ڕێگای پاکی و هەست و دیدی سۆفیگەری دەتوانێت پێی بگات.

هەروەها کانت وای دەبینێت کە هیچ بەربەستێك نییە لەبەردەم ئەوەی کە مرۆڤ لەیەك کاتدا لە دوو

جا بۆ ئەوەی تەواوکاری نێوان فەلسەفە و زانست بزانین، ئەوەی تا ئێستا زانست پێی گەیشتووە دەخەینەڕوو.

**سێیەم: زانستی سەردەم[1].**

لە سەدەی حەڤدەهەمەوە زانیاری ڕێگایەکی تری دۆزییەوە، جیاواز لە تێگەیشتنی پیاوانی ئایین، ئەویش ڕێگای زانست بوو.

ئامانجی زانست گەیشتنە بە یاسا و ڕێسا کە چەند بابەتێکی دیاریکراو بەیەکەوە دەبەستێتەوە و توانای لێکدانەوەی دەبێت بۆ ڕوودانی دیاردەیەك لە شێوەیەکی دیاریکراودا، تەنانەت گەشەکردنی ئەم دیاردەیەش لە ئاییندەدا.

زانیاری زانستی بەوە جیادەکرێتەوە کە بە شێوەیەکی لۆژیکی بەڵگەی لەسەر دەهێنرێتەوە و لە ناویدا هیچ تێکگیرانێکی عەقڵی بوونی نییە و، شیاوی هەڵسەنگاندنە لە ڕێگای تێبینی کردن و تاقیکردنەوەی زانستی.

بەمەش زانیاری زانستی بە جیاوازییەکی ڕیشەیی لە بیروباوەڕی کوێرانە (دۆگماتی Dogmatic) جیاوازە، کە بریتییە لە تەسلیم بوونی تەواوەتی بۆ ڕاستی و درووستی بابەتێك، بەبێ گوێدانە ئەوەی کە بەشێوەیەکی عەقڵی داڕێژرابێت و خرابێتە بەر تاقیکردنەوە.

بەڵام چۆن زانست دەگاتە زانیاری، لەکاتێکدا هیچ دەقێکی پیرۆزی نەبێت کە پشتی پێببەستێت؟

ڕێگای بەدەستهێنانی زانیاری (هەر زانیارییەك بێت) بە وەڵامی دوو پرسیاردا تێدەپەڕێت:

---

جیهانی جیاوازدا بژی، جیهانی کات و شوێن و جیهانی ڕۆحی بێ کۆتا. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەشە کە پێویستە مرۆڤی سەردەم پەیڕەوی بکات.

(١) لە کتێبی (الدين والعلم وقصور الفكر البشري) نووسینی: محمد الحسيني اسماعيل وەرگیراوە.

**پرسیاری یەکەم: بۆچی (ئامانج یان حیکمەت) why؟**

بۆچی گەردوون درووست بووە؟ بۆچی ژیان درووست بووە؟ بەدبەختی و ئازار بۆچی؟

زانایان گەیشتوونەتە ئەو دەرئەنجامەی کە وروژاندنی ئەم جۆرە پرسیارانە کە بەدوای ئامانجی شتەکاندا دەگەڕێت، لە دەرەوەی بازنەی زانستە، بۆیە هەندێك لە زانایان ئامانجدارێتی ڕەتدەکەنەوە و، هەندێکیشیان قەبووڵیان کردووە، بەڵام بۆ زانایانی پێشووی خۆیان لێی گەڕاون، کە (فەیلەسووفەکان)ن.

**پرسیاری دووەم: چۆن (میکانیزم یان چۆنیەتی) How؟**

ئەمەیان بواری زانستە، بەڵام بە مەرجی دەرکردنی فێڵباز و چەواشەکاران لە گۆڕەپانی زانستدا.

بۆ بەدیهێنانی ئەم مەرجەش، زانایانی ئەم یارییە چوار یاسایان داناوە، کە هەر کەسێك بیەوێت بەشداری بکات دەبێت پێیانەوە پەیوەست بێت:

**یاسای یەکەم:** ئێمە پێنج هەستمان هەیە، کە لە کاتی توێژینەوەی هەر بابەتێکی زانستی ئامرازی زانستن. بۆیە کاتێك بەو پێنج هەستەمان بەشە زۆر بچووکەکانی بچوکتر لە گەردیلە و کونە ڕەشەکان و هی ترمان هەست پێنەکرد لە بەرامبەردا زانایانی (بیرکاری) و لێکدانەوە و حیساباتی وردتر لە هەستەکانیان داهێنا وەك سەرچاوەیەك بۆ زانیاری.

**یاسای دووەم:** پێویستە بۆ بەدەستهێنانی ماریفەتی زانستی ڕێبازێکی دیاریکراو بگیرێتە بەر، کە بە ڕێبازی زانستی ناسراوە و ئەم قۆناغانەش لەخۆ دەگرێت:

١- کۆکردنەوەی زانیاری و تێبینی کردنی ئەو دیاردانەی پەیوەندییان بەو بابەتەوە هەیە کە خەریکین لێیان دەکۆڵینەوە.

٢- داڕشتنی ئەو گریمانانەی کە ئەم زانیارییانە بە یەکەوە دەبەستێتەوە.

٣- ئەنجامدانی ئەو تاقیکردنەوانەی ئەم گریمانانە دەپشکنن و تێبینیکردنی ئەنجامەکان و گەیشتن بە چەند دەرەنجامێك.

٤- لە دەرەنجامەکانەوە گەیشتن بەو یاسایانەی کردار و دیاردەیەك بەڕێوەدەبەن.

٥- لە یاساکانیشەوە گەیشتن بە بیردۆزێکی زانستی کە لە ڕووی لۆژیکییەوە گونجاو بێت و ئەو ڕووداوانەمان بۆ ڕوون بکاتەوە کە پێشتر تێبینیمان کردبوون و، توانای ئەوەشی هەبێت کە پێشبینی ڕووداوی نوێ بکات.

**یاسای سێیەم:** دوورخستنەوەی هەموو لێکدانەوەیەکی میتافیزیکی (غەیبی) بۆ هەر کێشەیەکی زانستی. زانایان ئەم جۆرە لێکدانەوانە بە بەربەستەکانی بەردەم زانست دەزانن، تەنانەت هەندێکیان دەڵێن کە دەکرێ پێشکەوتنی زانست بە تەواوەتی لەبار ببات.

بۆ نموونە ئەگەر زانست بەوە وازیان بهێنایە، کە خودا (یان شەیتان) هۆکاری نەخۆشییە، ئەوا ڤایرۆس و هۆکارەکانی تری نەخۆشی نە دەدۆزرانەوە و، زانستی پزیشکی هەر لە قۆناغی پێش هیپۆکرات[1] دەمایەوە.

**یاسای چوارەم:** پێویستە زانیارییە زانستییەکان بە بەڵگەی تاقیکراوە و عەقڵی بۆ هاوپیشە و تیۆریستەکان بخرێنەڕوو، بۆ ئەوەی هەڵبسەنگێنرێن، پاشان وەرگرتنیان یان ڕەتکردنەوەیان، ئەمەش لە ڕێگەی گۆڤارە زانستییەکان و کۆنگرە و کتێب و ئامرازەکانی تر.

لە ئەنجامی ئەو ڕێبازە توندەی زانست، دەبینین کە زانست لە پرسە زانستییەکاندا هەڵوێستی بابەتی هەڵدەگرێت، کە تێیدا زانا وەڵامی ئەوە دەداتەوە کە سرووشت پێی دەڵێت.

---

(١) هیپۆکرات Hippocrates : گەورە پزیشکی یۆنانی (٤٦٠ پ.ز-٣٧٠ پ.ز)، بە باوکی پزیشکان بەناوبانگە؛ بەهۆی ئەوەی زانستە پزیشکییەکانی لەسەر بناغەی زانستی دامەزراند. هەروەها سوێندی پزیشکی بە ناوی ئەوەوە بەناوبانگە، کە پێویستە هەموو پزیشکێك بەر لە دەست بەکاربوون سوێند بخوات کە پەیوەست بێت بە ڕەوشتی پزیشکیی بەرامبەر نەخۆش و هاوکار و پیشەکەیان.

لەکاتێکدا فەلسەفە گوزارشت دەکات لە هەڵوێستی تایبەتی و بۆچوونی تایبەتی، کە زۆر جار تێکگیران و هەڤدژی لە بۆچوونی فەیلەسوفەکاندا بەدی دەکەی.

سەرەڕای ئەوەی لە ڕووکەشدا تیکدەگیرێن، بەڵام هەریەکە لە زانست و فەلسەفە خزمەتی گەورە پێشکەش دەکەن. ئەگەر مرۆڤ پێویستی بە زانست هەبێت کە لایەنە ماددی و جەستەییەکان دەتوێژێتەوە، ئەوا پێویستی بە فەلسەفەش هەیە بۆ ئەوەی لایەنە عەقڵی و دەروونییەکانی بۆ ڕوون بکاتەوە، تا بتوانین بڵێین کە فەلسەفە و زانست دوو ڕووی یەك دراون کە مێژووی فیکری مرۆڤە.

**چوارەم: ڕۆڵی ئایین چییە؟**

بینیمان کە هەر یەکە لە زانست و فەلسەفە (عەقڵ) پێویستییە ماددی و لاشەیی و عەقڵی و دەروونییەکانی مرۆڤ تێر دەکەن و، ئەوەش پێمان دەڵێت کە بێباوەڕەکان لە ژیانێکی باش دەژین. ئیتر ڕۆڵی ئایین لەژیانی مرۆڤدا چییە؟

**لە ڕێی دیدی ئیسلام (وەکو لێی تێدەگەین) وەڵامی ئەم پرسە دەدەینەوە:**

**یەکەم:** ئایین تاکە ڕێگەی ناسینی تەواوەتی خودایە و، زانینی ئەوەی دەرهەق بە خودا درووست و نادرووستە.

ئایین تاکە ڕێگای ناساندنی مرۆڤە بە سەرچاوەکەی و کاروانی ژیان و سەرەنجام و ئامانجی درووستبوونی. ئایین تاکە ڕێگایە بۆ ڕوونکردنەوەی پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خوای خۆی.

ئەو شتانە لە ئایینەکاندا بە (بیروباوەڕ) ناسراون. ئەم بیروباوەڕە بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی هزر و هەست و سۆزی مرۆڤ نییە، بەڵکو بۆ داننانە بەو حەقیقەتانەی کە ژیانی مرۆڤ بەبێ ئەوان ڕێکخراو نابێت.

- هەروەك لە بەشەکانی تری کتێبەکە باسیان دەکەین - .

**دووەم:** ئایین ڕێباز و شەریعەت بۆ مرۆڤ دیاریدەکات، کە چۆن ژیانی ڕێکبخات و پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دی و ژینگەی دەورووبەری چۆن بێت.

مرۆڤە دیندارەکان باوەڕیان وایە کە خودا بەدیهێنەری مرۆڤە و زانایە بە لایەنە پەنهانەکانی دەروون و خاوەن توانای ڕەهایە و تواناداترە بۆ دانانی یاساکان لە میانی هێڵەکانی پانیدا.

**سێیەم:** بێگومان مرۆڤ لایەنی ڕۆحی هەیە کە دەڕوانێتە دیوی نادیاری ژیان - غەیب - لەم بارەیەوە مرۆڤی ژیارستانیەتی هاوچەرخی ڕۆژئاوا کە پشتی لە خودا کردووە دەیەوێ بە ڕێگای جۆراوجۆر ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە، لە پەنابردنە بەر فاڵچی و قاوەگرەوە و، پەرستنی شەیتان و تەنانەت حەج کردن بۆ هەرەمەکانی جیزە! کە بە (میتا فیزیکای بێ بارگرانی)ناسراوە؛ هەموو ئەمانە بۆ دۆزینەوەی جێگرەوەیەك بۆ ئایین، کە تاکە ڕێگای تێرکردنی لایەنی ڕۆحیی مرۆڤە.

لەو سێ کارەی کە پێشتر باسمان کردن، ئایین بە تەنیا ڕۆڵی تەواوەتی لە بەدیهێنانیان دەبینێت.

پاشان دێینە سەر ئەو کارانەی ئایین لە ڕێی پەیوەندی بە زانست و عەقڵەوە دەتوانێت ئەنجامیان بدات ئەوانیش:

**چوارەم:** ئایینی ڕاستەقینە هانی ئەو زانستە دەدات کە گرنگی بە لایەنە ماددی و جەستەییەکانی ژیان دەدات، هەروەك چۆن عەقڵ بۆ ئەوە ئاڕاستە دەکات کە لەبواری فەلسەفیدا توێژینەوە بکات بۆ ئەوەی پێویستییە عەقڵی و دەروونیەکان پڕ بکاتەوە.

تەنانەت ئیسلام ئایین و زانست و عەقڵ تێکەڵ دەکات و تابلۆیەکی بێ وێنە دروست دەکات. سەرنجی فەرموودەی پەروەردگار بدە:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣.

واتە: بەڵگەکانی خۆمانیان لە ئاسۆکان و دەروونیاندا نیشان دەدەین، تا بۆیان ئاشکرا دەبێت کە خودا و ڕێبازەکەی حەقە.

هەر بۆیە دەبینین کە قورئانی پیرۆز پڕە لە بانگەوازکردن بۆ بیرکردنەوە و، پڕە لە گلەیی کردن لەوانەی کە عەقڵیان بەکارناهێنن (أفلا یعقلون)؟ و بە ئاژەڵ دەیان شوبهێنێ.

**پێنجەم:** ئایینی ڕاستەقینە پێشەوا (مایسترۆ)یە کە میوزیك ژەنان (زانست و فەلسەفە) ئاڕاستە دەکات تا هەر یەکێکیان ڕۆڵی خۆی لە شوێنی دیاریکراوی خۆی بگێڕێت، ئیتر نەشاز نەخزێتە ناو ژیانی مرۆڤ، ئا ئەمە ڕۆڵی زانست و ئەمەش ڕۆڵی عەقڵ و ئەمەشیان بواری چەمکە غەیبییەکان.

بۆ نموونە، پێویستە مرۆڤ لەبەر یارمەتی ئاسمان واز لە هۆکارەکانی زانست نەهێنێت، هەروەها پێویستە چەمکە غەیبییەکان ڕەتنەکاتەوە، چونکە ناتوانێت بە ڕێگای زانستی و بە هەستەکانی ئەوە ببینێت، ئیتر هەر یەکە و بواری خۆی هەیە.

**شەشەم:** ئەگەر ئایین گرنگی بە ڕووح بدات، ئیدی ئایین ئەو ڕۆحەیە کە لەناو هەریەکە لە زانست (میکانزم) و فەلسەفە (ئامانج)دا هەیە، بەبێ ئەو ڕۆحەش مرۆڤ دەبێتە لاشەیەکی مردوو کە دەورو پشتی خۆی بۆگەن دەکات.

ئەمە وێکچواندنێکی ئەدەبی ڕەوان نییە، بەڵکو وەسفێکی زانستی وردە کە بۆ ئەو بارودۆخەی دەکەین کە توشی مرۆڤی زەمین بووە، لە ئەنجامی ئەوەی کە ڕۆح لە زانست و فەلسەفە جیاکراوەتەوە.

لێرە و لەوێ بەبێ بەندوبار زانست پێشکەوتووە:

ئەوەتا چەکی ئەتۆمی داهێناوە کە ملیۆنان کەس لەناو دەبات و بە جۆرێك ژینگە وێران دەکات، کە ئیتر چاك بوونەوەی بۆ نییە.

حەپی هۆشبەری وای داهێناوە کە ملیۆنان کەسی کردۆتە کۆیلە.

جۆری ڤایرۆسی کوشندەی داهێناوە کە ملیۆنان کەس توشی نەخۆشی کوشندە دەکات یاخود دەیانکوژێت.

فەلسەفەش بەم شێوەیە گەشەی کردووە، دابڕاوە لە بنەما ئایینییەکان، بۆ ئەوەی مرۆڤ بگەیەنێتە وەڵامگەلێکی وا کە تینوێتی نەشکێنن، بەڵکو توشی سەر لێشێوان و نامۆیی کردووە[1]. شاعیری قوتابخانەی تاراوگە -المهجر- (إيليا أبو ماضی) لە هۆنراوەیەکی ڕەوانی پڕ لە غوربەت و سەر لێشێواویدا ئاماژەی پێکردووە:

جئتُ لا أعلم مِن أين ... ولكنّي أتيتُ
ولقـد أبصـرت أمامي طريقاً فمشيتُ
وسـأبقى سـائراً شـئتُ هذا أم أبيـتُ
كيف جئت؟ كيف أبصرتُ طـريقي؟
لـــــــــــســـــــــــتُ أدري!

هاتووم نازانم لە کوێـــوە .. بـــەڵام هاتـــووم
لە بەردەمم ڕێگایەکم بینی و پێیدا ڕۆیشتم
لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبم بمەوێ یا نەمەوێ
چـــۆن هـــاتم؟ چـــۆن ئەو ڕێگـــایەم بینـــی؟
نــــــــــــــــازانــــــــــــــــم!

حەوتەم: ئەوانەی لە ژینگەیەکی ئایینیدا گەورە بوون، ئەوەی کە خەڵك بە (ئایینی لەدایك بوون) ناوی دەبەن، عەقڵ و زانست - بۆ ئەوانەی بیردەکەنەوە - ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن لە بەرزکردنەوەی ئاستی ئایینی لەدایك بوون بەرەو قەناعەتی عەقڵی پاشان دڵنیایی پاشان لە خودا ترسان:

﴿ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ﴾ فاطر: ٢٨

واتە: بێگومان بەندە زاناکان زیاتر لە خودا دەترسن.

دوای خستنەڕووی ڕۆڵی ئایین، لەگەڵ ئەوانەدا هاوڕایین کە دەڵێن ئایین ڕێبازێکی گشتگیرە و هەموو شتێك لەخۆ دەگرێت و هیچ پێویستیمان بە

---

(١) هەروەك چۆن لەگەڵ سارتەر و ڤۆڵتێر ڕوویداوە، لە بەشی دووەمی کتێبەکە ئاماژەی بۆ دەکەین.

ڕێبازێکی تر نییە، بەو مەرجەی بە واتا ڕاستەقینەکەی سەیری ئایین بکرێت. هەروەك چۆن ئایین تاقانەیە لە بابەتەکانی بیروباوەڕ و یاسا و ڕۆحانییەت (سێ خاڵی یەکەم)، ئاواش ڕۆڵی خۆی هەیە لەلایەنی زانست و عەقڵدا. ئەگەر دیندارەکان دەرك بەو ڕاستییە بکەن، بێگومان هەوڵی تەواوی خۆیان دەدەن بۆ گەڕان بە دوای میکانیزمەکانی بەکارهێنانی زانست و بەپێی توانای خۆیان هەوڵی ئەوە دەدەن کە لە ئامانجداریی بگەن لە ڕێگای بەکارهێنانی عەقڵەوە، پێویست بەوە ناکات بڵێم لە ڕێگای بەکارهێنانی فەلسەفە، بۆ ئەوەی لەگەڵ هەندێ کەس لەسەر ناو تێکنەگیرێین لە کاتێکدا ناوەڕۆکەکان هەمان شتن.

## دەگەڕێینەوە بۆ لای ئەنتۆنی فلو

گەشتی ئەنتۆنی فلو باشترین نموونەیە بۆ گونجانی هەردوو ڕووی دراوەکە (فەلسەفە و زانست) وەك دوو سەرچاوەی مرۆیی زانیاری.

چونکە ئەنتۆنی فلو گەیشتنی بەو دەرەنجامەی کە (خودایەك هەیە) بە بەرهەمی (گەشتی عەقڵ) وەسفی دەکات، کە باوەڕی ئایینی هیچ ڕۆڵێکی تیدا نەگێڕاوە. چونکە ئەنتۆنی فلو هەموو ژیانی هزری خۆی لە چوارچێوەی ئەو یاسا فەلسەفییە ژیاوە کە سوقرات دایمەزراندبوو، ئەویش بریتییە لە: (شوێنی بەڵگە دەکەوین بەرەو هەرکوێمان ببات (We must follow the argument wherever it leads) بەڵگەی فەلسەفی بە درێژایی ژیانی بەرەو بێباوەڕیی برد، بەڵام لە تەمەنی هەشتاساڵیدا بەرەو ئەوەی برد کە خودایەك هەیە.

ئەنتۆنی فلو و دیزایینی زیرەك ...

بەڵگەی زانستی /عەقڵی/ فەلسەفی کە ئەنتۆنی فلویان بەرەو ڕەتکردنەوەی بێباوەڕیی برد، بریتی بوو لە چەمکی (دیزاینی زیرەك Intelligent design) کە لە چارەگی کۆتایی سەدەی بیستەمەوە ناوەندە زانستی و فەلسەفی و ئایینەکانی بارگاوی کردووە[1].

---

(١) کۆمەڵێکی زۆر لە زانایانی بایۆلۆجی و فیزیا و کیمیا و بیرکاری و کۆمەڵێکی زۆر لەوانەی گرنگی بە فەلسەفەی زانستەکان و فەلسەفەی ئایین دەدەن لەسەر ئەو تەوژمەن. ئەم زانا و فەیلەسوفانە کۆمەڵێکیان دامەزراند بەناوی دیزایینی زیرەکانەوە Intelligent Design Movement Discovery Institute و لەشاری سیاتل- واشنتن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان پەیمانگای دۆزینەوەیان دامەزراند لە ساڵی ١٩٩٤.

چەمکی دیزایینی زیرەك لە دەوری ئەو بازنەیە دەخولێتەوە کە، درووستبوونی گەردوون و درووستبوونی ژیان و زیندەوەرەکان لە ئاستێکی زۆر ئاڵۆزدایە، کە ئەو ئاڵۆزییە ئەوە دەکاتە شتێکی مەحاڵ کە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی و لەخۆوە درووست بووبن، بەڵکو پێویستە لە پشتیانەوە دیزاینەرێکی زیرەکی زانا و بە توانا هەبێت.

لەو بارەیەوە دکتۆر ئەحمەد عوکاشە دەڵێت: (ئەوەی کە لە لایەنی شیکاریی و فسیۆلۆجیی و کیمیایی مێشك تێبگات و باوەڕی بە بوونی خوا نەبێت، ئەوا هیچ تێنەگەیشتووە، چونکە مێشکی مرۆڤ موعجیزەی خودای بەدیهێنەرە).

**- ئێستاش کتێبەکەمان (گەشتی عەقڵ) دەناسێنین:**

کتێبەکە لە دوو بەش پێکدێت لە بەشی یەکەمدا کتێبی ئەنتۆنی فلو (خودایەك هەیە) لە دوو تەوەرەدا دەخەینەڕوو:

لە تەوەری یەکەم (لە سێ باسدا) ئەوە دەخەینەڕوو کە چۆن هزری ئەنتۆنی فلو وای لێهات کە ببێتە فەیلەسووفێکی بێباوەڕ، سەرەڕای ئەوەی کە لە خێزانێکی مەسیحی دیندار لە دایك بووە.

لە تەوەری دووەم لە (شەش باسدا) گەشتی ئەنتۆنی فلو لە بێباوەڕی بەرەو باوەڕ بەوەی کە (خودایەك هەیە) دەخەینەڕوو، ئەو هۆکارانە دەخەینەڕوو کە لەپشت ئەم گۆڕانەوەن، هەروەها باسی ئەو چەمکانەش دەکەین کە هزری ئەنتۆنی فلو لە دوای تەمەنی هەشتا ساڵی لە سەریان جێگیر بووە.

هەروەك چۆن ئەو پێشەکی و کۆتاییەش دەخەینەڕوو کە ئەنتۆنی فلو داوای لە (ڕۆی ئەبرەهەم ڤارجیس)[1] کرد بوو کە پێشەکی و کۆتایی بۆ کتێبەکەی

---

پەیمانگاکە لە لایەنەکانی دیزایینی زیرەکانە دەکۆڵێتەوە، هەروەها بانگەشە بۆ ئەم چەمکە دەکات.

(١) ڕۆی ئەبرەهەم ڤارجیس Roy Abraham vargeese: بە یەکێك لە بلیمەتترین ئەو نوسەرانە دادەنرێت کە بە زمانی ئینگلیزی لەسەر پەیوەندی نێوان فەلسەفە و زانست و ئایینی نووسیوە. بەناوبانگترین کتێبیشی کە زۆر بەر بڵاو و بەناوبانگە کتێبی (موعجیزەی بوون The wonder of the world)ە کە ساڵی ٢٠٠٣ دەرچووە. هەروەها کتێبی (گەردوون و ژیان و خودا Cosomes. Bios. Theos) کە لە ساڵی ١٩٩٢

بنوسێت. ڤارجیس لە پێشەکیەکەدا گەشەسەندنی بێباوەڕی هاوچەرخ باس دەکات و ڕۆڵی ئەنتۆنی فلو لە ڕێچکەی بێباوەڕی لە سەدەی بیستەمدا دەخاتەڕوو.

لە کۆتاییشدا ئەو پرسە سەرەکییانە دەتوێژێتەوە کە فەلسەفەی ماددی و زانستی تاقیگەیی ناتوانن لێکدانەوەیەکی ژیرانەی بۆ بکەن.

ئەنتۆنی فلو لە گەشتە عەقڵییەکەیدا، دەگاتە مەنزڵ کە (خودایەك هەیە)، بەڵام هێشتا نەگەیشتۆتە بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی کە خودا پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤدا هەیە لە ڕێی سرووش و ئایینە ئاسمانییەکان.

لەبەر خاتری بەڵگە هێنانەوە بۆ ئەم گەشتە تەواو نەکراوە، بەشی دووەمی کتێبەکەمان ناوناوە (گەشتەکە تەواو دەکەین).

**ئەم بەشەش لە ١٠ باس پێکهاتووە:**

لە چوار باسی سەرەتادا، چوار چەمکی گرنگ و سەرەکی گەشتی عەقڵمان خستۆتەڕوو و بە بەڵگەی زانستی و فەلسەفی بەهێزمان کردوون، ئەوانیش:

- بەڵگەی گەردوونی، کە دەیسەلمێنێت بنچینەی وردی گەردوون بەڵگەیە لەسەر بوونی خودایەکی بەدیهێنەر.

- بنەمای مرۆیی، کە دەیسەلمێنێت گەردوون بە شێوەیەکی گونجاو بۆ ژیان و مرۆڤ درووستکراوە.

- هزری ئایینی: چۆن هزری ئایینی درووست بوو؟ ڕۆڵی فیترەت لە دینداریدا چییە؟ چۆن ئایینی ڕاستەقینە بە شێوازێکی زانستی و بابەتی هەڵسەنگێنین؟

- ئایینی سرووشتی و عەلمانیەت: ئایا خودا بوونی خوڵقاندووە و پاشان جێیهێشتووە؟! ئایا ئەنتۆنی فلو بە یەکێك لە شوێنکەوتووانی ئایینی سرووشتی دادەنرێت؟

---

دەرچووە و تێگەیشتنی ٢٤ زانا دەخاتەڕوو کە خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرتووە و. بە باشترین کتێبی ئەو ساڵە دیاریکرا. هەروەها ڕۆی ئەبرەهەم لە ساڵی ١٩٩٥ خەڵاتی تەمبڵتۆنی وەرگرت.

گەشتی عەقڵ بە گەیشتن بە خودا کۆتایی نایەت، بەبێ سەرنجدان لە پەیوەندی نێوان ئایین و بایۆلۆجیا، کە لە جینات و مێشك (باسی پێنجەم) و دڵ (باسی شەشەم) خۆی دەبینێتەوە.

لە تەوەری حەوتەم لە (حەقیقەتی خوودی مرۆڤایەتیی) دەکۆڵینەوە، کە ئایا لە بەرهەمی مێشکی مرۆڤە؟ یان خوودی مرۆڤایەتیی سنووری بایۆلۆجیا تێدەپەڕێنێت؟

دوای هەڵوەستەکردن لەگەڵ زانست لە سێ باسەکەی پێشوو، زانست لە هەموو بەکارهێنانێکی نادرووست و تۆمەتبارکردن دەردێنین، لە ژێر ناوونیشانی (زانست لە نێوان خراپ بەکارهێنانی بێباوەڕان و تۆمەتبارکردنی توندڕەوان)دا.

دوای تێگەیشتن لە چەمکەکانی پێشوو، دەگەینە وێنەیەکی نموونەیی بۆ پەیوەندی نێوان بەدیهێنەر و بەدیهێنراو، کە ئەنتۆنی فلو هەوڵدەدات لێی بکۆڵێتەوە، کە لە باسی نۆیەم لە ژێر ناونیشانی (بوونی مرۆڤ: سەرچاوە - ڕێگا - کۆتا) دەخەینەڕوو. گەشتی عەقڵ بە باسی دەیەم کۆتایی پێدێنین، بە ناونیشانی (لە نێوان دوو سرووشدا). کە تێیدا چیرۆکی (حەیی کوڕی یەقزان)ی نووسەر و فەیلەسووفی ئەندەلووسی ئیبن توفەیل دەخەینەڕوو، بۆ ئەوەی بەراوردێك بکەین لە نێوان ئەو گەشتەی ئەنتۆنی فلو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم ئەنجامی داوە، لەگەڵ گەشتی عەقڵ کە ئیبن توفەیل بەر لە گەشتی ئەنتۆنی فلو بە هەشت سەدە ئەنجامی داوە.

ئەم کتێبە گەشتێکە لەگەڵ ئایین و زانست و فەلسەفە، کە یارمەتیمان دەدات بۆ ئەوەی هەڵوێستێکی دڵنیامان هەبێت بەرامبەر مەترسیدارترین و گرنگترین پرسی ژیانی مرۆڤ، کە پرسی بوونی خودایە.

# پێشەکی [١]

## ئەنتۆنی فلو لە کاروانی بێباوەڕیدا :

بەبێ چوونە ناو بابەتی وردی زانستی، دەتوانین بڵێین کە سێر ئەنتۆنی فلو Sir Antony flew مامۆستای فەلسەفەی بەریتانی بەناوبانگ، بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدە پێشەوای بزوتنەوەی بێباوەڕی بوو لە جیهاندا. کە زیاتر لە سێ کتێب و توێژینەوەی فەلسەفی داناوە کە وەك نەخشەڕێگای هزری بێباوەڕی بوو بە درێژایی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم.

لەبەر ئەوەی هەوڵی دانپێدانانی ئەنتۆنی فلو بەوەی کە (خودایەك هەیە) وەك هەورەتریشقە دای بەسەر فەیلەسووف و بیرمەندە بێباوەڕەکان، ئیتر کەوتنە بەرگری کردن لە باوەڕی پیرۆزییان بە بێباوەڕیی! ناڕەزاییان دەربڕی بەرامبەر بەم گۆڕانە و، هەرچی تۆمەت و تانە و تەشەرە دایانە پاڵ ئەنتۆنی فلو.

لە ڕاستیدا عەقڵی فەیلەسووفەکان کە لە پێشوودا بە دەستی ستەمی دادگاکانی پشکنین و نەبوونی ئازادی بیرکردنەوە کە لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپادا زۆر چەوسایەوە، ئێستا خەریکە چێژ لەوە وەردەگرن کە یەکتری بخۆن. وادیارە دەمارگیری و خۆ هەڵدانەوە و خۆ زاڵکردن و بانگەشەکردنی تەنها زانایی بە تەنیا سیفەتی پیاوانی ئایین نەماوە.

---

(١) ئەم پێشەکییە پێشەکی کتێبی (خودایەك هەیە)ی (ئەنتۆنی فلو)ە کە (ڕۆی ئەبرەهەم ڤارجیس) نووسیویەتی.

ئەو پرسیارەی لە سەرەتای کتێبەکەدا خۆی دەخاتەڕوو ئەوەیە: ئەنتۆنی فلو چ شتێکی لە ڕێبازی چارەسەرکردنی پرسی بێباوەڕی زیاد کردووە؟

دەتوانین - بەبێ هیچ زیادەڕەوییەك - بڵێین کە لە ماوەی سەد ساڵی ڕابردوو هیچ فەیلەسووفێکی -بەناوبانگ - بەم شێوە قووڵ و ڕێکخراوەی وەك ئەنتۆنی فلو نەیتوانیوە هزری بێباوەڕی بخاتەڕوو. چونکە بەڵگەی نوێی دژی باوەڕبوون بە خودا خستەڕوو و، بە بیرۆکە ڕەسەنەکانی نەخشە ڕێگای بۆ ئەو فەیلەسووفانە داڕشت کە بە درێژایی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دژایەتی باوەڕ و ئایینیان دەکرد.

ئەگەر کتێبی فەیلەسووفێکی گەورە وەك (بێرتراند راسل[1] Bertrand Russel) بە نموونە وەربگرین وەك کتێبێکی بێباوەڕیی کە لە سەدەی نۆزدەم و بیستەمدا نووسراوە، دەبینین لە چوارچێوەی وتار گەلێکی ئەدەبی ڕووکەش دەرناچن و هزرێکی قووڵ ناخەنەڕوو، لە باشترین باروودۆخی کتێبەکەدا تەنیا کێشە دەروونییەکانی مرۆڤ وەك (کۆژانەکانی مرۆڤ بەهۆی خراپە و ئازار) دەخاتەڕوو، بەبێ ئەوەی چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە.

وا دیارە کە فەیلەسووفە مەزنەکان خۆیان لەوە بە گەورەتر زانیوە کە ((دەستە ناسکەکانیان و عەقڵە داناکانیان بەم کێشە بازاڕییە ئاست نزمە پیس بکەن!))، کێشەی ئایین و بێباوەڕیی.

---

(١) بێرتراند راسل Bertrand Russel: لە وێڵز لەدایك بووە (١٨٧٢-١٩٧٠). کە فەیلەسووفێکی گەورە و پیاوێکی لۆژیکییە، یەکێکە لە زانایانی بیرکاری و شارەزایە لە مێژووی ئینگلیز. هەروەها یەکێك بوو لە نەیارانی جەنگ و داگیرکاری. لە ساڵی ١٩٥٠ خەڵاتی نۆبڵی لە ئەدەب وەرگرتووە؛ بەهۆی نووسینەکانی لەسەر نموونە باڵاکانی مرۆڤایەتی و بەرگریکردنی لە ئازادی بیروڕا.

## فەلسەفەی بێباوەڕیی هاوچەرخ :

بۆ ئەوەی بتوانین شوێن گەشتی هزری ئەنتۆنی فلو بکەوین، ئەو بۆچوونانە دەخەینەڕوو کە فەیلەسووفە بێباوەڕەکانی سەدەی بیستەم و سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم لە سەری بوون، ئەمەش لە ڕێگەی خستنەڕووی چەمکەکانی فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی Logical Positivism و چەمکەکانی بێباوەڕیی نوێ New Atheism تیرۆری هزری، کە خۆی دەبینێتەوە لە:

### فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی Logical Positivism :

فەیلەسووفی فەڕەنسی (ئۆگست کۆمت[1] August comte) بە دامەزرێنەری فەلسەفەی ماددیگەرایی دادەنرێت، کە تەنیا لە دیاردە و ڕاستییە ماددییەکان دەکۆڵێتەوە و، درووشمی (ئەوەی ناتوانرێ ببینرێ بوونی نییە) بەرز دەکاتەوە، هەموو بیرکردنەوەیەکی غەیبی ڕەتدەکاتەوە، لە سەرووی هەموویانەوە بوونی خودا.

پاشان فەیلەسووفی ئینگلیزی سێر ئەلفرێد ئایەر[2] A.J.Ayer لە ساڵی ١٩٣٦ فەلسەفەی ماددیگرایی لۆژیکی[3] Logical Positivism وەك لقێك لە فەلسەفەی ماددیگەرایی خستەڕوو. ئەم فەلسەفەیەش لەسەر بنەمای سەلماندن The verification Principle وەستاوە کە وەرگرتن یان گریمانەکردنی هەر گریمانەیەك یان پرسێك وەستاوە لەسەر توانای سەلماندنی یان ڕەتکردنەوەی، ئەمەش لە ڕێگەی کرداری و بە تاقیکردنەوە، یان بە بیرکاری، یان بە لۆژیکی، لە ڕێگەی واتای ئەو وشانەی ئەم چەمکە ڕوون دەکەنەوە. پاشان

---

(١) ئۆگست کۆمت: فەیلەسووف و زانای کۆمەڵناسی بەناوبانگی فەڕەنسی (١٧٩٨-١٨٧٥).

(٢) سێر ئەلفرێد ئایەر (١٩١٠-١٩٨٩): فەیلەسوفێکی ئینگلیزییە و، بەرپرسی یانەی سوقراتە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد.

(٣) ئایەر ئەم پرسەی لە کتێبی (زمان و ڕاستی و لۆژیکی Language. Truth and Logical خستۆتەڕوو یەکەمین دەرکەوتنی ئەم فەلسەفەیەش لە بیستەکانی سەدەی بیستەم بوو، لەلایەن کۆمەڵێك فەیلەسووفی ئەورووپی، کە بە کۆمەڵەی (ڤییەننا) ناسراون.

هەر گریمانەیەك یان پرسێك کە بکەوێتە دەرەوەی بازنەی زانستی کردەیی یان بیرکاری یان لۆژیکی ڕاستەوخۆ، هیچ مانا و بەهایەکی نییە.

پاشان، فەلسەفەی ماددیگەرایی چەمکەکانی وەك خودا، ڕۆح، دینداری، بێباوەڕی بێ مانا دەبینێت؛ بەو پێیەی ناتوانرێ ڕاست و هەڵەی بەشێوەیەکی تاقیگەیی یان بیرکاری یان لۆژیکی بسەلمێنرێت. لەبەر ئەوە قسەیەکی وەك (خودا بوونی هەیە) هیچ مانایەکی نییە، بۆیە لە بەرامبەر عەقڵ یەکسانە، کە مرۆڤ باوەڕدار یان بێباوەڕ بێت.

ئەنتۆنی فلو ئەم خۆبەزلزانی و لووت بەرزییەی ڕەتکردەوە کە فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی بەرامبەر چەمکە ئایینییەکان پەیڕەوی دەکات. سەرەڕای ئەوەی کە لە لێکۆڵینەوەکەیدا (ساختەیی زانستی لاهوت) گومان دەخاتە سەر ئەم چەمکانە، بەڵام داوادەکات کە فەیلەسووفە بێباوەڕەکان بەردەوام لەگەڵ دیندارەکاندا لە گفتوگۆدابن.

سەردەمی فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی بەوە کۆتایی هات، کاتێك بیردۆزەر و پێشەوا گەورەکەی (سێر ئایەر) لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم ڕایگەیاند کە ئەم فەلسەفەیە پڕە لە دژیەك و پێچەوانە، سەرەڕای ئەوەی ساڵانێکی زۆری لە چارەسەرکردنی هەڵەکانی ئەم فەلسەفەیە خەرج کردبوو.

هەروەك چۆن ئەلفرێد ئایەر فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی لە ڕێگەی نووسینەکانی فەیلەسووفی ئەڵمانی ئینگلیزی (لۆدفیگ ویتگنشتین)[1] بنیاتنابو، ڕەتکرنەوەکەشی هەر لە ڕێگەی نووسینەکانی ئەم فەیلەسووفە گەورەیەوە بوو، کە پێش ئەو ئەم فەلسەفەیەی ڕەتکردەوە، کاتێك (بیردۆزی زمان و یاری Theory of language and games)ی دانا.

لەم بیردۆزەدا، ویتگنشتین بوارەکانی زانیاری بە یاساکانی یارییە جیاوازەکان دەچوێنێت. هەروەك چۆن ئێمە یاری شەترەنج بە یاساکانی تۆپی پێ ناکەین، بەم جۆرەش ناتوانین یاساکانی گەڕان لە زانستە پراکتیکییەکاندا، کە لەسەر

---

(١) لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا دەیناسێنین.

هەستەکان وەستاوە (وەك کیمیا و فیزیا) لەسەر زانستە مرۆڤایەتییەکان (وەك فەلسەفە و لۆژیك و ڕەووشت) جێبەجێی بکەین. بەم جۆرەش ناتوانرێ لێکۆڵینەوە لە چەمکە ئایینییەکان بە پێوەری چەمکە زانستییەکان بێت، بۆیە ناتوانرێ قسەی (خودا لە هەموو شوێنێك بوونی هەیە)، بە پێوەری شوێن لە فیزیای نیوتن یان فیزیای ئەنیشتاین بپێورێت.

بەم شێوەیە هەردوو دامەزرێنەرەکەی فەلسەفەیماددیگەرایی لۆژیکی (ویتگنشتین و ئایەر) مردنی فەلسەفەکەیان ڕاگەیاند و بەخاکیان سپارد!

## گەڕانەوەی بیروهۆش...

### دینداری عەقڵانی Rational Theism :

فەیلەسووفەکان دەستیان لە فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی بەردا، دوای ئەوەی ئەنتۆنی فلو دەرگای گفتوگۆکردنی لەگەڵ دیندارەکاندا بۆ خستنەسەر پشت، ئیتر لە گۆڕەپانەکەدا پرسیار دەربارەی واتای بوونی خودایی پەیدابوون، یان ئەگەری بوونی باوەڕێکی خوا ڕسك بە خودا لە دەروونماندا و...

ئەم ڕەوتە لە بەرگی گۆڤاری تایم Time لە ژمارەی ئەپریلی ١٩٨٠ زۆر بە ئاشکرایی دەرکەوت، لە وتاری بەرگەکەدا هاتبوو: هەندێك لە گەورە فەیلەسووفەکان شۆڕشێکی هزری بێ بەرپێوەدەبەن، کە لە دوو دەیەدا هیچ کەس چاوەڕێی نەدەکرد، ئەم شۆڕشە ئامانجی ئەوەیە خودا بگێڕێتەوە سەر عەرشی خۆی.

### بێباوەڕی نوێ The New Atheism :

هەڵگەڕانەوە بەرەو فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی

جارێکی دی بێباوەڕی لەسەر یەك کەڵەکە بوو، تا لەژێر ناوی بێباوەڕی نوێ The New Atheism سەری دەربێنێت، ئەم چەمکە بۆ یەکەمین جار

لە گۆڤاری تۆڕی زانیاری[١] Wired Magazineی ژمارەی نۆڤێمبەری ٢٠٠٦بەکارهات.

ئەو کتێبانەی باسی ئەم چەمکە تازەیەیان دەکرد ڕەواجێکی زۆریان پەیدا کرد؛ ڕاگەیاندن ئەو بابەتەی کردبووە ماددەیەکی گەرمی وورووژێنەر، سەرەڕای سادەیی ئەو بەڵگانەی خستویانەتەڕوو[٢].

ئەو نووسینانە هێرشیان دەکردە سەر هەموو ئایینەکان (ئاسمانی و زەمینی)، بەڵام بە زاراوەیەکی ئامۆژگاریکارانە ئەو کارەیان دەکرد و، نووسەرەکان جلی ئەو ئامۆژگاریکارانەیان دەپۆشی کە خوێنەریان وەك نەفام و ڕووکەش سەیردەکرد و نەفرەت و جوێنیان پێدەدان ئەگەر تۆبە لەسەر باوەڕە سادەکەیان بە خودا و پەروەدگاریەتی نەکەن!

لەسەر خوێنەرانی ئەم نووسەرانە پێویست بوو کە هەڵوێستێکی دیاریکراویان هەبێت: ئەوەی لەگەڵیان نەبێت دژیانە، یان سپی یان ڕەش، بواری فێڵبازی و هەڵوێستی ناڕوون نییە! تەنانەت ئەو فەیلەسووفە گەورانەش کە ڕێزیان بۆ هەندێك بەڵگەی دیندارەکان دادەنا، خرانە ناو لیستی ڕەش و کاروانی خیانەتکار و سادە و ڕووکەشەکان.

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەخاتەڕوو: ئایا نووسەرانی ئەم ڕەوتە بە دیبەیتە فەلسەفییەکانیان کە چەند دەیەی ڕابردوو بەردەوام بوو توانی پرسی دینداری دەوڵەمەندتر بکات؟

---

(١) گۆڤاری تۆڕی زانیاری Wired Magazine: گۆڤارێکی ئەمریکیی بەناوبانگە، سەرەتا لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە لە سان فرانسیسکۆ دەردەکرا، لە مارسی ١٩٩٣، گرنگی دەدات بە خستنەڕووی کاریگەری تەکنۆلۆلۆژیا لەسەر کلتور و سیاسەت و ئابووری.

(٢) لە گرنگترین ئەو کتێبانە :

- The Blind watch maker.
- The God Delusion.
- Breaking the spells.
- Six Impossible things Befor Break fast.

**وڵامەکەی بە نەخێرە لەبەر سێ هۆکار:**

**یەکەم:** بەناو فەیلەسووفە بێباوەڕە نوێیەکان هیچ بۆچوونێکی گرنگیان دەربارەی چەمکی پەروەردگاریتی[١] نەخستەڕوو بەڵکو دەبینین زۆر سەیر لێی ڕادەکەن.

ئەوەتا پێشەواکەیان ڕیچارد دۆکنز[٢] درووستبوونی ژیان و عەقڵ بەوە وەسف دەکات، کە تەنیا (ڕووداوێکی لەناکاو بوو و لە ئەنجامی بەختەوە بووە!) ئەوەشیان لویس وێلبێرت[٣] کە دەڵێت: (من بە ئەنقەست خۆم لە پرسی درووستبوونی عەقڵ شاردۆتەوە؛ چونکە هێشتا هیچی لەبارەوە نازانین!). لەکاتێکدا فەیلەسووف و زانای بایۆلۆجی ئەمریکی بەناوبانگ دانییل دێنیت[٤] گرێکوێرەی پرسی درووستبوونی عەقڵە بە سادەییەکی زۆرەوە شیکار دەکات، چونکە دەڵێت: ((پاشان موعجیزە ڕوویدا!!)).

**دووەم:** بێباوەڕە نوێیەکان خاڵە لاوازەکانی بناغەی (فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی)ی لەناوچوویان نەدەزانی[٥] کە هەوڵ دەدەن زیندووی بکەنەوە، بێگومان هەرکەسێکیشیان هەڵە بنەڕەتییەکانی ئەو ڕەوتە پشتگوێ بخات خۆشی تێیاندەکەوێتەوە، ئەمەش ڕوویدا.

**سێیەم:** بێباوەڕە نوێیەکان سەرنجی ئەو توێژینەوە زۆرە فەلسەفییە نوێیانەیان نەدابو، نە ئەو بەڵگە بەهێزانەی کە زانست پێشکەشی کردبوون و خزمەتی خوێندنی فەلسەفەی ئایینەکانی دەکرد. لەبەر ئەوە بەو پەڕی بابەتییەوە دەڵێین،

---

(١) لە بەشەکانی تری کتێبەکە ئەم پرسانە بە تێروتەسەلی باس دەکەین.

(٢) پاشان کەمێکی تر دەیناسینین

(٣) لویس ویلبێرت Luis Wolbert: لە ساڵی ١٩٢٩ لە ئینگلتەرا لە دایك بووە. مامۆستای بایۆلۆجیای پەرەسەندنە لە بەشی شیکاری لە زانکۆی لەندەن.
نووسەر و ڕاگەیاندکارێکی بەناوبانگە لە گرنگترین کتێبەکانی six important things befor Breakfast کە لە ساڵی ٢٠٠٦ دەرچووە .

(٤) دانییل دێنیت Daniel Dennett لە ساڵی ١٩٤٢ لە بۆستن لەدایك بووە، فەیلەسوفێکی بێباوەڕە، کە گرنگی بە فەلسەفەی عەقڵ و فەلسەفەی زانست و بایۆلۆجیای پەرەسەندن دەدات.

(٥) ئەنتۆنی فلو لە بەشی یەکەم ئەو خاڵە لاوازانە دەخاتەڕوو.

کە بێباوەڕی نوێ جگە لە گەڕانەوە بۆ فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی، کە لەلایەن بەهێزترین فەیلەسووفەکانییەوە ڕەتکرایەوە، هیچی تر نییە.

**نموونەیەك لە بێباوەڕە نوێیەکان..**

باچاوێك بخشێنین بە هزرو بۆچوونەکانی گەورەی بێباوەڕە نوێیەکان (ڕیچارد دۆکنز[1] Richar Dawkinz) ، بۆ ئەوەی ئاستی نزمی ڕێبازی بیرکردنەوەی ئەو پیاوە بزانین و بە پیاهەڵدانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی نەخەڵەتێین:

١- هەندێ کەس بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن کە فەیلەسووفی گەورە، بێرتراند راسل باوکی ڕۆحی دۆکنزە؛ بەو پێیەی کە راسل نەیارێکی بەهێزی ئایینە ئاسمانییەکانە و نەیارییەکەی زۆر لە گاڵتەجاڕی و ئاماژە و ڕەوانبێژی تێکەڵە، بەڵام جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ئەم دوو پیاوەدا هەیە.

کاترین تیت Katharine Tait کچی راسل لە کتێبی (باوکم، بێرتراند راسل My father. Bertrand Russel)دا دەڵێت، کە فەیلەسووفە گەورەکەمان هەمیشە هەستی بە شوێنێکی بەتاڵ دەکرد لە عەقڵ و دڵیدا. شوێنێك کە پێشتر و لە سەردەمی منداڵیدا خودا لەو بۆشاییەی راسلدا بوو، پاشان دوای پشتکردن لە خودا هیچ شتێك ئەو شوێنەی پڕنەدەکردەوە. کاترین دەڵێت باوکی هەمیشە وای بیردەکردەوە کە جەوهەر و کرۆکی مرۆڤ سەر بەو جیهانە ماددییە نییە، بۆیە هەمیشە و هەر لە سەرەتای کارە فەلسەفیەکەیەوە و بە درێژایی ژیانی بە گرنگی و بە هەموو توانایەوە بە دوای خوادا دەگەڕا.

---

(١) زانایەکی بەریتانییە لە نیرویی لە کینیا لە ساڵی ١٩٤١ لەدایك بووە. ئێستا لە ئۆکسفۆرد دەژی. زانایەکی بایۆلۆجییە، پێشتر مامۆستای سادەکردنەوەی زانستەکان بوو لە زانکۆی ئۆکسفۆرد. لە ڕێی کتێبی (جینی خۆپەرست The Selfish Gene بەناوبانگ بوو کە لە ساڵی ١٩٧٦ دەرچوو، کە تیایدا تێگەیشتنی خۆی بۆ پەرەسەندن لە ڕێی جیناتەوە خستۆتەڕوو. یەکێکە لە نەیارانی چەمکی درووستبوونی تایبەت و دیزاینی زیرەك، هەروەك لە کتێبی (دروستکەرە کوێرەکەی کاتژمێر The Blind watch maker)دا باسی کردووە. لە ساڵی ٢٠٠٦ کتێبی (درۆی خودا The God Delusion)ی دەرکرد، کە تێیدا بوونی هەموو هێزێکی غەیبی ڕەتدەکاتەوە و وەك گومڕایی و خەڵەفان سەیری ئیمان دەکات، لە ئێستادا لە هەموویان بەناوبانگترە.

هەروەك چۆن لەگەڵ بیرمەندە گەورەکاندا ڕوودەدات، بێرتراند راسل (هەروەك کچەکەی پێمان دەڵێت) لەگەڵ زۆرێك لە مەسیحییە دەمارگیر و بێهێزەکان تێکگیراوە، ئەوانەی ئایین بە شێوازێکی وا نیشاندەدەن کە لێبووردەیی و پاکی نێوان مرۆڤ و خودا دەسڕنەوە، تەنانەت لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤیشدا، هەروەك چۆن جوانی ژیانیش ناهێڵن، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە خەڵك بە تەواوی لە ئایین دووربکەونەوە، ئەمە لەگەڵ راسلیشدا ڕوویدا و کار گەیشتە ئەوەی کە لە هەموو گفتوگۆیەکی ئایینی لەگەڵ باوکیدا شکستی هێنا.

ئەو کۆژانانەی کە بێرتراند راسل لە پێناو گەڕان بە دوای حەقیقەتدا بینی، لە کوێی ئەو هەوڵ و کۆژانانەدایە کە زانایەکی وەك ڕیچارد دۆکنز بینیویەتی؟!

٢- ڕیچارد دۆکنز بەراورد لە نێوان (بێرتراند راسل) وەك فەیلەسوفێك کە بەدوای ئەمانەتی فیکریدا دەگەڕێت، لەگەڵ (ئەنتۆنی فلو)دا دەکات. دەڵێت کە فلو دوای ئەوەی بەساڵاچوو هەڵگەڕانەوەی لە بێباوەڕیدا ڕاگەیاند و، رایگەیاند کە (خودایەك هەیە) تا ڕاگەیاندن بە خۆیەوە سەرقاڵ بکات، بەڵام راسل فەیلەسووفێکی گەورەبوو خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە.

ئایا سەرنجی ئەو گاڵتەجاڕییەی نێوان وەسفی فلو بەوەی کە (بەساڵاچووە) و راسل کە (فەیلەسووفێکی گەورەیە) دەکەی؟ دۆکنز لەوەدا تێکەوت کە بیرمەندە گەورە و ڕاستەقینەکان بەڵگەکان دەکەنە پێوەر، بەبێ ڕەچاوکردنی ڕەگەز و ڕەچەڵەك و تەمەن.

هەروەها دۆکنز ئەوەشی لە یاد چووە، کە پێشەواکەی (وەك خۆی بانگەشە دەکات) بێرتراند راسل، خۆی باسی خۆی دەکات بەوەی کە لە هەرچەند ساڵێك و ڕێبازێکی فەلسەفی نوێ دادەمەزرێنێت، ئەمەش کاری زۆربەی فەیلەسووفە گەورەکانە.

٣- کاتێك یەکێك پرسیاری لە دۆکنز کرد، دەربارەی ئەو شتانەی کە ئەو وادەزانێت ڕاستە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، دۆکنز گوتی: من ((پێم وایە)) کە گەردوون لە خۆیەوە و لە نەبوونەوە درووست بووە و ژیان بوونێکی

ماددییە و، عەقڵی مرۆڤیش بەرهەمی هەڵبژاردنی سرووشتە هەروەك داروین دەڵێت. واتە دۆكنز لەو پرسە گرنگانەی (بیروباوەڕیی) بەبێ بەڵگەی زانستی و فەلسەفی ڕای خۆی دەربڕیوە، لە هەمان كاتدا گەڕانەوەی ئەنتۆنی فلو بە بەڵگەی زانستی و فەلسەفییەوە بەرەو باوەڕ ڕەتدەكاتەوە.

٤- یەكێك لە هەڵە گەورە و زەقەكانی دۆكنز، ئەوەیە كە قسەكانی ئەنیشتاین دەربارەی خودا وا لێكدەداتەوە كە مەبەستی لە خودا سرووشتە، هەروەك چۆن سوورە لەسەر ئەوەی بیداتە پاڵ بێباوەڕی یان یەكبوون [1](pantheism). ئەمە لە كاتێكدا كە ئەنیشتاین باوەڕی خۆی دوپاتدەكاتەوە بە بوونی عەقڵێكی دانا، كە بەدیهێنەر و هەڵسوڕێنەری یاساكانی سرووشتە.

به هەمان شێوە زۆرێك لە زانا فیزیاییە گەورە هاوچەرخەكانی وەك ستیڤن هۆكینگ و هێزنبێرگ و بلانك باوەڕیان بەوە هەیە، كە ئەنیشتاین باوەڕی پێی هەبووە[2].

٥- گەورە زانای فیزیایی جۆن پارۆ[3] ڕەخنە بەهێزەكەی خۆی ئاڕاستەی دۆكنز دەكات پێی دەڵێت: ئەو كێشەیەی تۆ لەگەڵ ئایین هەتە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە زانایەكی ڕاستەقینە نیت، چونكە تۆ بایۆلۆجیت نەك فیزیایی[4]!، لەبەر ئەوە تۆ بەرامبەر بیركردنەوە لە ئەندازەی ئاڵۆزی ژیان و بووندا بێ توانای! جۆن پارۆ لە ڕەخنە گاڵتە ئامێزەكەی خۆی بۆ دۆكنز بەردەوام دەبێت و دەڵێت: تۆ هێشتا هەر گیرۆدەی گرێ بایۆلۆجییەكانی بیردۆزی پەرەسەندنی سەدەی نۆزدەهەمیت و بە هەر نرخێك بێت دەتەوێ تێڕوانینەكانت بسەلمێنی، ئەگەر

---

(١) یەكبوون: ڕێبازێكی فەلسەفییە، پێی وایە كە خودا و بونەوەر هەمان شتن و، جیهان وێنەی بەرجەستەی خودایە، كەواتە تەنیا خودا بوونی هەیە، پاشان لایەنگرانی ئەم ڕێبازە لەسەر ئەو ڕایەنین كە خودا جیهانی دروستكردووە، بەڵكو دەڵێن: خودا جیهانە و جیهانیش خودایە.

(٢) لە باسی شەشەم ئەم زانایانە دەناسێنین.

(٣) جۆن پارۆ John Parow: مامۆستای فیزیایە لە زانكۆی Memorial لە كەنەدا.

(٤) فیزیاییەكان وای دەبینن كە بایۆلۆجیا زانستێكە لە مێژووی زیندەوەرەكانەوە سەرچاوە دەگرێ، لەبەر ئەوە بە پاشكۆی زانستە كردارییەكانی دادەنێن.

لەسەر حیسابی حەقیقەتیش بێت، گومانیش لەوەدا نییە کە بە بەلاڕێدابردنی ڕاستییەکان هیچ شتێك لەو یاسایانەی گەردوون بەڕێوەدەبەن کەم و زیاد ناکات.

قسەکانمان دەربارەی دۆکنز بەوە کۆتایی دێنین کە دۆکنز سەر بە کۆمەڵە نووسەرە زانستییانەی وەك کارل ساگان[1] و ئیسحاق ئەسیمۆن[2]ە، کە بە تەنیا بەوە ڕازی نین زانا و نووسەر بن. بەڵکو خۆیان بە کاهینی زانست دەزانن، کە دەبێ ئەوان ئەوەمان بۆ دیاری بکەن، کە لە شتە غەیبییەکاندا باوەڕمان بە چی هەبێت!

## دەگەڕێینەوە لای ئەنتۆنی فلو

بۆ ئەوەی بەشدارییەکانی ئەنتۆنی فلو لە ڕێبازی بێباوەڕیدا کورت بکەینەوە، سێ لێکۆڵینەوەی گرنگی ئەنتۆنی فلو کە لەو بوارەدا ئەنجامی داون[3] دەخەینەڕوو:

١- ساختەیی زانستی ئایینزانی Theology and fasification: لێکۆڵینەوەیەکە کە ئەنتۆنی فلو لە ساڵی ١٩٥٠ پێشکەشی کردووە، تێیدا هەوڵیداوە کە پرسی باوەڕ لە ڕەگوڕیشەوە هەڵکێشێت، بەوەی بیسەلمێنێت کە وتە ئایینییەکان خاڵین لە هەموو چەمك و بۆچوونێکی واتادار. لە هەمان کاتدا بانگەوازی بۆ گفتوگۆی نێوان بێباوەڕان و باوەڕداران کردووە. ئەم لێکۆڵینەوەیە بڵاوترین لێکۆڵینەوەی فەلسەفیی سەدەی بیستەم بوو.

---

(١) کارل ساگان Carl Sagan: لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دایك بووە (١٩٣٤-١٩٩٦)، زانایەکی بەناوبانگی بواری فەلەکناسی و زانستەکان بوو، کە گرنگی دەدا بە ژیانی دەرەوەی هەسارەکەمان، ڕاویژکاری دەزگای لێکۆڵینەوەی گەردوونی ئەمریکی NASA بوو. گرنگی دەدا بەسادەکردنەوەی زانستەکان، پێشکەشکاری بەرنامەی تەلەفزیۆنی (گەردوون Cosmos. A Personal Voyage) بوو، کە بە پڕ بینەرترین بەرنامە دادەنرێت لە مێژوودا، کە ٦٠٠ ملیۆن کەس لە ٦٠ وڵاتی جیادا بینەری بوون.

(٢) ئیسحاق ئەسیمۆف Isaac Asimov: مامۆستای کیمیای زیندەیی، لەدایك بووی ڕوسیا و هەڵگری ڕەگەزنامەی ئەمریکییە (١٩٢٠-١٩٩٢) زیاتر لە ٥٠٠ کتێبی لەسەر سادەکردنەوەی زانستەکان و خەیاڵی زانستی هەیە.

(٣) لە بەشی دووەمی کتێبەکەدا لێکۆڵینەوەی زیاتری باس دەکەین.

**٢- کتێبی (خودا و فەلسەفە[1] God and Philosophy):** تێیدا فلو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە ناکرێ لە پرسی (خودایەك هەیە)دا هیچ حوکمێك بدرێت پێش ئەوەی دیندارەکان بە ڕوونی خاسیەتەکانی ئەو خودایە بخەنەڕوو (ئەمە مانای چییە کە دیندارەکان دەڵێن خودا ڕۆحە، بوونێکی گشتگیرە و زانستێکی گشتگیری هەیە).

**٣- کتێبی (گریمانەی بێباوەڕیی[2] The presumption of Atheism).** تێیدا فلو بە تەواوی پەردە لەسەر بابەتەکە لادەدات و تۆپەکە دەخاتە گۆڕەپانی دیندارەکان و کاری سەلماندنی بوونی خودایان پێ دەسپێرێت، دوای ئەوەی کە ڕەوتی فەلسەفەی پێشوو، داوای لە بێباوەڕەکان دەکرد، کە نەبوونی خودا بسەلمێنن.

**لە کۆتاییدا دەڵێین:** لەڕاستیدا یەکێك لە هەڵوێستە سەرسوڕهێنەرەکان ئەوەیە کە ئەو سێر ئەنتۆنی فلویەی کە بەر لە پەنجا ساڵ دژی فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکیی وەستایەوە، هەر ئەوە ئەمڕۆ لە بەردەم بێباوەڕی نوێ دەوەستێتەوە. ئەم پیاوە توانای تەفر و توناکردنی بەڵگەی بێباوەڕە کۆن و نوێکانی هەیە و، زانستی سەردەم لەو بوارەدا بەکاردەهێنێت.

ئەم پێشەکییە بە پێشەکی ئەنتۆنی فلو، لە کتێبەکەی (خودایەك هەیە) کۆتایی پێ دێنین:

لەوەتەی گۆڕانی خۆم لە بێباوەڕ بوون بۆ باوەڕبوون بە بوونی خودا ڕاگەیاندووە، زۆر پرسیاری هۆکاری ئەو گۆڕانەم لێدەکرێت و، زۆر جاریش داوام لێکراوە لەسەر ئەو گۆڕانە بنووسم.

یەکێك لە ژانەکانی بەر لەدایك بوونی ئەم گۆڕانە ئەوە بوو کە: من لە پێشەکی کۆتا چاپی کتێبەکەم (خودا و فەلسەفە) لە پرسی گفتوگۆ فەلسەفییەکان لەسەر خودا، بێلایەنیم هەڵبژارد و بۆچوونی خۆم نەخستەڕوو.

---

(١) چاپی یەکەم لە ساڵی ١٩٦٦ بوو.

(٢) چاپی یەکەم لە ساڵی ١٩٧٦ بوو.

پێم وایە کە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە قسەی خۆم لەوبارەیەوە بکەم، چونکە ئێستا باوەڕم بەوە هەیە کە خودایەك هەیە.

لەو کاتەوە کە ئەو بابەتەم ڕاگەیاندووە لە ڕاگەیاندندا زۆر ئەوە دەگوترێ کە گەورەبوونی تەمەنم و ترسم لە چوون بۆ ژیانەکەی تر و دیداری خوا، هۆکاری پشت گۆڕانەکەمە لە بێباوەڕیەوە بۆ باوەڕ.

ئەوانەی ئەو قسانە دووبارەدەکەنەوە، بە هیچ جۆرێك نووسینەکانمیان نەخوێندۆتەوە لەسەر ئەوەی کە من - تا ئێستاش - باوەڕم بە بوونی ژیانێکی تری دوای مردن نییە، سەرەڕای ئەوەی کە باوەڕم بە خودای بەدیهێنەری گەردوون هەیە. ئەم بۆچوونەی دواییشم لە کتێبەکەمدا (لۆژیکی مردن The Logic of Mortality) خستۆتەڕوو.

ئەم چەمکەی، کە من بە هەموو شێوەیەك بەرجەستەبوونی خودا لەسەر شێوەی مرۆڤ (مەسیح) وەك چۆن مەسیحییەکان باوەڕیان پێ هەیە ڕەتدەکەمەوە، من لەو چەمکەدا ڕای خۆم نەگۆڕیوە.

گومانیش لەوەدا نییە و خوێنەرانم باش دەزانن کە ئەمە یەکەمین جار نییە لە بابەتێکی گرنگدا ڕای خۆم بگۆڕم، ئەمەش بە پشت بەستن بە توێژینەوەی قووڵ. پێشتر ئەوە ڕوویدا کە من لە مارکسییەتەوە گۆڕام بۆ بەرگریکارێکی بەهێز لە بیرۆکەی بازاڕی ئازاد. هەروەك چۆن بەر لە بیست ساڵ لە قسەکەم پەشیمان بوومەوە کە گوتبووم کە کارەکانی مرۆڤ تەنیا هۆکارە ماددییەکان پاڵنەریانن.

لەم کتێبەمدا (خودایەك هەیە) هۆکارەکانی گۆڕانم لە بێباوەڕیەوە بۆ باوەڕ دەخەمەڕوو و، بڕیاردان لەسەر ڕاست و هەڵەی ئەم گۆڕانە دەخەمە دەست ئێوە. ئەم پێشەکییە بە قسەی ئەنتۆنی فلو کۆتایی پێدێنین، کە دەڵێت کە گرنگیدانی بە خودا لە سێ وشە سەرچاوە دەگرێت:

کە گرنگیدانەکەی گرنگیدانێکی (حەکیمانەی، ئەخلاقی، فزوڵییە Prudential، moral، curious).

حەکیمانەیە؛ چونکە ئەگەر خودایەك هەبێت سەرەنجامی مرۆڤی بەدەست بێت، ئەوا گەمژەییە نەیناسین و کار بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی نەکەین.

ئەخلاقییە؛ بەوەی هیچ شتێك جێگای گرنگی مرۆڤ نییە و نەمریی بۆ دەستەبەر ناکات بە ئەندازەی وەستان لەگەڵ حەقیقەتدا.

فزوڵییە؛ چونکە هیچ شتێك عەقڵییەتی زانستی - فەلسەفی ناورووژێنێت ئەوەندەی دۆزینەوەی شتە گەورەکان، پێشم وانییە هیچ دۆزینەوە و داهێنانێك ئەوەندە گەورەبێت، کە گەورەتر بێت لە دۆزینەوەی ئەوەی کە خودایەك هەیە.

بۆیە ئەمە گرنگیدانێکی (حەکیمانەی ئەخلاقی فزوڵییە).




# چۆن بوومە فەیلەسوفێکی بێباوەڕ؟



## باسی یەکەم : تۆوی بێباوەڕیی

لە ساڵی ١٩٢٣ لە لەندەن لەدایك بووم و، لە ماڵێکی مەسیحی دیندار لەدایك بووم؛ باوکم قەشەیەکی گەورەی چالاکی کڵێسای ئینگلیزی بوو، هەروەها وانەبێژ پاشان سەرۆکی کۆلێژی خوێندنی ئایینی بوو لە کامبریدج.

هەر لە منداڵیمەوە خرامە بەر قوتابخانەیەکی تایبەت (کینگزوود kingswood)، نازانم بۆچی گرنگیم بە خوێندن و سرووتە ئایینیەکان نەدەدا، هەروەها نازانم بۆچی هیچ هەستم بە پیرۆزی و ڕێز نەدەکرد، کە واجببون لە کڵێسای قوتابخانەدا بیاننوێنم! تەنانەت سروودە هەستبزوێنە ئایینییەکانیشم نەدەگوتەوە و بەشداریم نەدەکرد و هیچ کاریگەرییان لەسەر دانەدەنام. ئەمە لە کاتێکدا بوو، کە من خەریکی خوێندنەوەی کتێبی سیاسی و مێژوویی وزانستی بووم. بە کورتی لە بچووکیمدا هیچ ئارەزووم لە بوونی پەیوەندییەك لەگەڵ خودا نەدەکرد.

تا ئێستاش، نازانم هۆکاری دووریم لە ئایین لە سەردەمی منداڵیمدا چی بوو. تەنیا دەتوانم ئەوە بڵێم کە تۆوی ئەو باوەڕەی کە لە کاتی چوونم بۆ قوتابخانە لە دڵمدا بوو، بەر لە دەرچوونم لێی، مرد.

بە تەواوی نازانم، کەی و چۆن سەرەڕای پاشخانە ئایینییەکەم بەرەو بێباوەڕی ڕۆیشتم! بە دڵنیاییەوە هۆکاری زۆر هەن کە بناغەی بێباوەڕییان لەلا دروست کردم، لەوانە:

١- دانایی (الحکمە)م لە باوکمەوە بۆ مابووەوە، (کە وەك فەیلەسووفی ئەڵمانی کانت[1] Kant) دەڵێت، لە هەموو ئەو شتە بێ کۆتاییانەی دەوریان داوی ئەوەیان هەڵبژێرە کە بە لاتەوە گرنگە. لە کاتێکدا کە باوکم دانایی بۆ گەیاندنی چەمکەکانی ئایینی مەسیحییەت بەکاردەهێنا، بەڵام هیچ لەو شتانە سەرنجی منیان ڕانەکێشا، جگە لەو کێشە هاوچەرخانەی کە مرۆڤیان سەرقاڵ کردووە.

٢- هەروەها بیرکردنەوەی عەقڵانی و شێوازی لێکۆڵینەوەم لە باوکمەوە بۆ مابووەوە. چونکە باوکم کاتێك لە بابەتێکی ئایینی دەکۆڵییەوە، بەر لەوەی ڕاوبۆچوونی لەسەر ئەو بابەتە بخاتەڕوو هەموو بەڵگەکانی ئەو بابەتەی کۆدەکردەوە. بەڵام جیاوازییەکەی ئەوە بوو، کە بە میراتگرتنی دانایی و عەقڵیەتی وردبینی و ڕەخنەگری لە باوکمەوە، بەرەو ئاڕاستەیەکی دوور لە باوەڕ و دینداری باوکمیان بردم.

٣- هەستکردنم بە (گرفتی خراپە و ناخۆشی) یەکێك لە هۆکارە زووەکانی بەرەو بێباوەڕی چوونم بوو، لەکاتی منداڵیمدا و لە ماوەی ساڵانی پێش جەنگی جیهانی دووەم، زۆر گەشتم دەکرد لەگەڵ باوکمدا لە کاتی پشووەکاندا بۆ فەرەنسا و ئەڵمانیا. تا ئێستاش ئەو ڕێپێوانانەی باڤاریام لە یاد نەچووە کە هەزاران گەنج بە جلوبەرگە تایبەتەکەیانەوە هەڕەشەی لەناوچوونیان لە نەیارانی نازییەکان دەکرد.

ئەم دیمەنانە لە سەردەمی منداڵیمدا لە مێشکمدا جێگیربوون و بەو پەڕی ڕقەوە لە مێشکمدا مانەوە، کە پێچەوانەی ئەو پەروەردەیە بوو کە لەسەری پەروەردە بوو بووم، کە لە ئایینە مەسیحییەکەمدا (خوا خۆشەویستییە)؛ بەو پێیەی کە چۆن ئەوەی خۆشی دەوێن ڕێگا بەو شەڕ و خراپەیە دەدات[2]؟!

---

(١) ئیمانوئێل کانت Immanuel Kant : لە بەناوبانگترین بیرمەندانی ڕۆشنگەری ئەوروپای نوێیە (١٧٢٤-١٨٠٤).

(٢) ئەم هەڤدژییە ڕووکەشە بە (ناخۆشی خراپە و ئازار) بەناوبانگە، کە ئەم چەمکە زۆر کەسی لە ئێستا و ڕابردوودا بەرەو بێباوەڕی برد، لە کاتێکدا کە ئایینە ئاسمانییەکان لێکدانەوەی گونجاویان بۆ ئەم

٤- کاتێك چوومە قوتابخانەی (کینگز وود)، یەکێك لە گەورەترین بەڕێوەبەرانی قوتابخانەکان بەڕێوەبەر بوو. زۆر هانی ئێمەی دەدا کە بچینە کتێبخانە و بخوێنینەوە. وتاری یەکشەمە (کە خۆی دەیخوێندەوە) لە کڵێسای قوتابخانەدا باسی سەرسوڕهێنەری سرووشت و یاسا و ڕێساکانی دەکرد و، بە هیچ جۆرێك باسی ژیانی تری دوای مردنی نەدەکرد.

٥- من هەمیشە لەگەڵ هاوڕێ و هاوپۆلەکانمدا و ئەوانەش کە لە خۆم گەورەتر بوون دەربارەی پرسە ئیمانییەکان کە قەشەکان دەیانخستەڕوو گفتوگۆم دەکرد. هەروەها بە هیچ جۆرێك بیرۆکەی خودا (هەموو بوونە - هەموو زانستە - هەموو توانایە)م قبوڵ نەبوو.

کاتێك گەیشتمە تەمەنی پازدەساڵی، بۆ هاوڕێکانم ئاشکرا کرد کە من بوونی خودا ڕەتدەکەمەوە. ئەمەم بەبێ ئەوە کرد کە لەگەڵ قەشەی دانپێدانانندا[1] گفتوگۆ بکەم دەربارەی گومانەکانم، هەروەها لەوەشدا سەرکەوتوو بووم کە بیروباوەڕە نوێکەم بۆ ماوەیەکی زۆر لە دایك و باوکم بشارمەوە بۆ ئەوەی گۆمی ڕوونی ماڵەوە شلوێ نەکەم.

هەر لەگەڵ هاتنی مانگی ژانیوەری ساڵی ١٩٤٦، کە تەمەنم نزیك بە بیست و سێ ساڵی بوو، هەواڵی ئەوە بڵاوبووەوە (کە من بوومەتە بێباوەڕی دەهری)[2] و ئەو بیروباوەڕەم گەڕانەوەی بۆ نییە، بۆیە ئەوانەی لە ماڵەوە لەگەڵم دەژیان وایان هەستدەکرد کە گفتوگۆ کردن لە گەڵمدا هیچ سوودێکی نییە.

لەسەر بنچینەی ئەو قسەیەی کە دەڵێت (ئەوەی لە سێزدە ساڵیدا باوەڕت پێی هەیە هەر ئەو بیروباوەڕەیە کە لەسەری دەمری) دەتوانم بڵێم کە: ئەو

---

هاڤلۆژییە ڕووکەشە دەکرد.

(١) قەشەی دانپێدانان، پیاوێکی ئایینییە کە مەسیحییەکان لە بەردەمیدا دان بە تەوانەکانیاندا دادەنێن، بۆ ئەوەی ببێتە هۆکارێك لە نێوان خودا و بەندەکان و تەوبەکەیان قبوڵ بکات.

(٢) بێباوەڕی دەهری ئەوەیە کە باوەڕی بە ژیانی دیکەی دوای مردن نییە و گۆڕ دوا وێستگەیە. دەهرییەکان لە کاتی هاتنی ئیسلام ئەو مانایەیان بەو شێوەیە دەردەبڕی: ژیان هیچ نییە جگە لە ڕوحێك کە مرۆڤ دەخاتە دەرەوە و گۆڕێك کە قووتی دەدات و تەنیا دەهر (زەمانە)یە کە لەناومان دەبات.

بیروباوەڕەی لە منداڵیمدا بۆم درووست بوو تا تەمەنی هەشتا ساڵیم و نزیک بوونەوەم لە مردن لە گەڵمدا مایەوە.

بەڵێ، بەم شێوەیە و بەوپەڕی
ڕاستگۆیی و دەستپاکی و زانستی، ئەنتۆنی فلو
ڕاشکاوانە باسی ئەوە دەکات کە
لە هەڵپەکردنی بەرەو بێباوەڕی و لە تەمەنێکی
زوودا پەلەی کردووە و بە هۆی چەند هۆکارێکی
بێ سوود و هەڵەوە بوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە چەند جار
چاوی بەم هۆکارانەدا خشاندۆتەوە، بەڵام تا تەمەنی حەفتا ساڵیش
بە هیچ جۆرێك پێی نەخستۆتە شوێنێك کە ببێتە هۆی گۆڕینی قەناعەتە بێباوەڕییەکەی.

## درووستبوونی فەیلەسووفێك

باسی ئەوەم کرد کە دانایی و عەقڵییەتی وردبین و شیکاریی ڕەخنەگرانەم لە باوکمەوە بە میرات بۆ مابووەوە. هەروەها ئەو کەش و هەوایەی کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی کینگزوود بۆمانی فەراهەم کردبوو لە خوێندنەوە و بەکارهێنانی عەقڵدا هاندەرم بوون.

لە ساڵی ١٩٤٢، خوێندنەکەم لە قوتابخانەی کینگزوود لە شاری کامبریدج تەواو کردو چووم بۆ زانکۆی کامبریدج کۆلێژی ئاداب. لە کاتی گەرمەی جەنگی جیهانی دووەمیشدا خرامە بەر سەربازی بێ شەڕی هێزە ئاسمانییەکان.

دوای تەواو بوونی جەنگ و بەخشرانم لە خزمەتی سەربازی لە ساڵی ١٩٤٦، گەڕامەوە بۆ زانکۆی ئۆکسفۆرد کە لە دوای جەنگی جیهانی بووبووە مەڵبەندی گفتوگۆ و دەمەتەقێی سیاسی و ڕۆشنبیرییەکان. هەروەها لە هاوینی ساڵی ١٩٤٧، تاقیکردنەوەکەم بە سەرکەوتوویی بڕی و پلەی فەخری یەکەمم بەدەستهێنا، پاشان بڕیارمدا پسپۆڕیی فەلسەفە هەڵبژێرم.

خوێندنی باڵام لە فەلسەفەدا لە زانکۆی کامبریدج لە ژێر سەرپەرشتی (جێلبەرت رایڵ Gilbert Ryle) دەستپێکرد، کە مامۆستای میتافیزیکا (ئیلاهییات - غەیبییەکان)بوو، پاشان لە ساڵی (١٩٤٧) بوو بە سەرۆکی هەر سێ بەشەکەی فەلسەفە لە زانکۆدا.

بە ڕێژەیەکی زۆر بە مامۆستاکەم (هێنری پرایس Henry price) کاریگەر بووم، کە لە گرنگیدان بە پاڕا سایکۆلۆجی[١] هاوبەشیم دەکرد، پێکەوە لە دیدار و کۆڕە جیاجیاکاندا لەو بوارەدا وانەمان دەگوتەوە.

لە ساڵی ١٩٤٨، بواری خوێندنی فەلسەفەی عەقڵیم وەرگرت و لە هەمان کاتیشدا داوام لێکرا کە لە ئۆکسفۆرد وانە بڵێمەوە، لەوێدا یادەوەرییەکانی فەیلەسوفی بلیمەت (ویتگنشتاین[٢] Wittgenstein)م شیدەکردنەوە.

مامۆستاکەم: (جیلبێرت رایڵ) هەوڵیدەدا لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەدا گفتوگۆ بکات کە لە پرسێکی فەلسەفیدا لەگەڵیدا ڕاوبۆچوونی جیاوازیان هەبو، شێوازی ڕاشکاوی و ڕووبەڕووبوونەوە لەو فێربووم کە بە درێژایی ژیانم کاریگەری لەسەر بیرکردنەوە و ڕەفتارەکانم هەبو، ئەم یاسا زێڕینە (ئەفلاتون)[٣] لە کتێبەکەیدا

---

(١) پاڕا سایکۆلۆجی: لقێکی زانستی دەروونناسییە کە لە دیاردە نامۆکان دەکۆڵێتەوە، وەك لە دوورەوە مەترسی خستنەسەر و هەڵسوڕاندنی تەنەکان و هی تر. .

(٢) لۆدفیج ویتگنشتاین Wittgenstein Ludwig: فەیلەسوفێکی نەمساوی- ئینگلیزییە (١٨٨٩-١٩٥١) لە دامەزراندنی فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی و قوتابخانەی فەلسەفەی زمانەوانی نوێ (کە دواتر باسی دەکەین) بەشدار بوو.

(٣) ئەرستۆ و ئەفلاتون و سوقرات گەورەترین سێ کوچکەی فەلسەفەی یۆنانی کۆنن، کە فەلسەفەی نوێی ڕۆژئاوا و تەنانەت ژیارستانییەتی ڕۆژئاواشی لەسەر بنیاتنراوە. ئەرستۆ قوتابی ئەفلاتون بوو و ئەفلاتونیش قوتابی سوقرات بوو.

**ئەرستۆ Aristotle:** (٣٨٤ پ.ز-٣٢٢ پ.ز) یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسوفەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، بە مامۆستای یەکەم بەناوبانگە، مامۆستای ئەسکەندەری گەورەبوو. داهێنانەکانی لە بواری زانستیدا (فیزیا- گەردوون- زیندەزانی) کێبڕکێی داهێنانەکانی بواری زانستە مرۆڤایەتییەکان دەکەن (فەلسەفە- سیاسەت- ڕەوشت- شانۆ- مۆسیقا- خوایەتییەکان). هەروەها دامەزرێنەری بناغەی زانستی لۆژیکە؛ هەر بۆیە بە پێوەری ئەرستی بەناوبانگە. کڵێسای کاسۆلیکی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بیرۆکە زانستییەکانی ئەرستۆی وەردەگرت و لە پێگەیەکی پیرۆزی دادەنان و بۆ هیچ زانایەك نەبوو دژیان بوەستێتەوە. بۆیە یەکێك بوو لەو هۆکارانەی گالیلۆ و زانایانی تری تووشی چەوسانەوە کرد.

(کۆمار) دەیداتە پاڵ سوقراتی مامۆستای:

(پێویستە بەدوای بەڵگە بکەوین بۆ هەر کوێمان ببات We must follow the Argument wherever it leads) ئەم درووشمە ئەو یاسایە بوو کە یانەی سوقراتی لەسەر دامەزرا لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، کە هەموو شەوانی دووشەممەیەك دیدارەکانی خۆی سازدەکرد. سەرۆکی یانەکە (لە ماوەی ١٩٤٢-١٩٥٤) نووسەر و فەیلەسووفی گەورە ك.س لویس C.s.lewis بوو کە بە گەورەترین پاڵپشتی مەسیحییەتی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دادەنرێت، کە لە هەموو دیدارە شەوانەکانی یانەکەدا لەگەڵ بێباوەڕاندا دەکەوتە گفتوگۆی گەرم و سەرکەوتن هەر جارە و بۆ یەکێك بوو.

کاتێك لە دیدارێکی تەلەفزیۆنیدا لە رادیۆی بەریتانی BBC دەربارەی ڕەتکردنەوەم بۆ بەڵگەکانی لویس لەسەر مەسیحییەت پرسیاریان لێکردم، وەڵامم دایەوە کە ئەندازەی تەواوی قەناعەتم تێدا نەدۆزیوەتەوە، بە تایبەت لەسەر بنچینەی بەرجەستەبوونی خودا لە شێوەی مرۆڤدا.

لە دوایین وەرزی خوێندنم لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، کتێبی (زمان و حەقیقەت و لۆژیك)ی فەیلەسووف ئەلفرێد ئایەر دەرچوو، کە تێیدا فەلسەفەی ماددیگەرایی

---

ئەفلاتون plato : (٤٢٨ پ.ز-٣٤٧ پ.ز) گەورە فەیلەسووفی یۆنانی گرنگی دەدا بە ڕەوشت و بەها باڵاکان. لە کتێبەکەیدا (کۆمار) باسی هەموو ئەو شتانەی کردووە کە پێویستە لە شارە چاکەکەدا خەڵك پەیڕەویان بکەن. دامەزرێنەری ئەکادیمیای ئەسینایە، کە بە یەکەمین قوتابخانەی خوێندنی باڵا دادەنرێ لە ڕۆژئاوای کۆندا. گرنگیشی بە بیرکاری دەدا. هەروەك چۆن گفتوگۆکانی لەگەڵ مامۆستاکەی (سوقرات)ی بۆ ئێمە گێڕاوەتەوە، ئەگەر ئەو گفتوگۆیانەی نە نوسیبایەوە، مێژوو هیچی دەربارەی سوقرات بۆ نەدەگێڕاینەوە.

سوقرات Socrates: (٤٧٠ پ.ز-٣٩٩ پ.ز). خاوەنی زیادکردنێکی گەورەیە لە فەلسەفەدا، چونکە پێشتر فەلسەفە تەنیا گرنگی دەدا بە بنچینەی ماددی گەردوون و ژیان (خاك- ئاو- هەوا- ئاگر)، بەڵام سوقرات گرنگی دان بە ڕەوشت و بەها باڵاکانی بۆ زیادکرد. هەروەها گرنگییەکی زۆری دەدا بە لۆژیك و بنچینەکانی زانیاری. مێژوو ئەو هەڵوێستە بەناوبانگەی، بۆ تۆمار کردووە کاتێك دادگای ئەسینا بڕیاری کوشتنی لە ڕێگەی خواردنی ژەهر بەسەردا سەپاند، بە تۆمەتی ئەوەی کە مێشکی گەنجانی تێکداوە!! سەرەڕای ئەوەی کە بواری هەڵهاتنی بۆ ڕەخسا، بەڵام ڕەتیکردەوە، بۆ ئەوەی نیشانی گەنجانی بدات کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەوڵەت بن، هەروەها لەبەر ئەوەش کە باوەڕی وابوو نابێ فەیلەسووف لەو مردنە بترسێت کە گیان لە زیندانی جەستە ڕزگار دەکات.

لۆژیکی کردبووە بنچینە، کە دەڵێت: (هەموو ئەو شتانەی نابینرێن، بوونیان نییە)، کەواتە هەموو گوتە ئایینییەکان دەربارەی خودا و ڕۆژی دوایی و پێغەمبەران و.. و.. قسەی بێمانان و قابیلی گفتوگۆ نین.

ئەندامانی یانەی سوقراتی لە ئۆکسفۆرد، پووچی بیروبۆچوونەکانی ئایەریان دەزانی، کە دواتر خۆشی دانی بەوە دانا.

پاشان، ئەو تاکە لێکۆڵینەوەی من بە ناونیشانی (ساختەیی زانستی لاهوت)(١) کە لەبەردەم یانەکەم پێشکەشم کرد، پێشوازییەکی گەورەی لێکراو، سەرەڕای ئەوەی کە لەو لێکۆڵینەوەیەدا بەرگری لە بیرۆکەی بێباوەڕی دەکەم، بەڵام تێشیدا داوای ئەوە دەکەم بچینە ناو گەنگەشە و گفتوگۆکان. ئەم لێکۆڵینەوەیەم وەك لێدانێکی کوشندەبوو بۆ فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی. لە ماوەی بوونم لە ئۆکسفۆرد (١٩٤٦-١٩٥٠)، ڕەوتێکی فەلسەفی دەرکەوت بە ناوی (شۆڕشێك لە فەلسەفەدا) و چەمکی (فەلسەفەی نوێی) بۆ دانرا. تەوەرەکەی ئەوەبوو کە ئێمە ناتوانین بۆچوونە فەلسەفییە جیاوازەکان تێبگەین تەنیا بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی قووڵ نەبێت بۆ ئەو وشانەی ئەم چەمکانە دەخەنەڕوو، واتە ئەم جۆرە فەلسەفەیە فەلسەفەیەکی شیکاری زمانەوانییە، ئەوەش واتای گرنگیدانی زیاترە بە چەمکە زمانەوانییەکان.

چەند لێکۆڵینەوەیەکم لەسەر فەلسفەی نوێ بڵاو کردەوە، کە هەموویان لە کتێبێکدا کۆکرانەوە لە ژێر ناونیشانی (فەلسەفە و زمان Philosophy and language) کە ناوبانگێکی باشی دەرکرد، تا گەیشتبووە ئەو ئاستەی کاتێك چووم لە زانکۆی ئەبردین لە سکۆتلەندا وانە بڵێمەوە، بە (شیکەرەوەی فەلسەفەی زمانەوانیی ئۆکسفۆردی) ناوبانگم دەرکردبوو.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٠، وەك مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی کیل Keel لە بەریتانیا دامەزرام و حەڤدە ساڵ لەوێ مامەوە تا ئەو کاتەی ئاستی ئەو زانکۆیە ڕووی لە دابەزین کرد.

---

(١) لە باسی دواتردا لێکۆڵینەوەکە دەناسێنین.

لە ژانیوەری ۱۹۷۲ چووم بۆ زانکۆی کالگاری Calgary لە کەنەدا لەوێشەوە بۆ زانکۆی ڕیدینگ Reading لە ساڵی ۱۹۷۳. و تا کۆتایی ساڵی ۱۹۸۲ لەوێ مامەوە.

دوای ئەوەی چوومە زانکۆی یۆرك York لە تۆرینتۆ لە کەنەدا بۆ ماوەی سێ ساڵ لەوێ لە ئۆهایۆ مامەوە، تا لە زانکۆی بۆڵینگ گرین بۆماوەی شەش ساڵ کار بکەم.

## هەوڵ و شکستی زوو :

گرنگیدانم بە شیوعییەت یەکێك بوو لە گرنگیدانە فەلسەفییە زووەکانم و بۆ ماوەیەك لە چالاکوانانی باڵی یاخی پارتی کاری بەریتانی بووم، تا لە سەرەتای پەنجاکاندا دەستم لەکار کێشایەوە.

ئەمە گرنگیدانمی بە پاراسایکۆلۆجی بەدوای خۆیدا هێنا، تەنانەت کتێبێکی ئاست نزمیشم لەو بارەیەوە نووسی و ناوم نا (خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ توێژینەوە فەلسەفییەکان)[1]. دوای ئەوە بارەکەم ڕاستکردەوە و دوای دەیان ساڵ کتێبێکی باشم نووسی ناوم نا (خوێندنەوەیەك بۆ کێشە فەلسەفییەکانی پاراسایکۆلۆجی)[2].

لەبەر گرنگیدانم بە پەیوەندی تیۆری پەرەسەندنی داروینی و هزری شیوعی، لە شەستەکاندا کتێبێکم نووسی بە ناوی (ڕەوشتەکانی پەرەسەندن)[3]، پاشان کتێبی (پەرەسەندنی داروینی)[4]م لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا نووسی.

لە هەمان سەردەمی زوودا، گرنگیم دەدا بە داهێنانە فیزیاییە نوێیەکان کە دەربارەی پەیوەندی نێوان فیزیا و عەقڵ بوون، کە بووە ژانی لەدایك بوونی

---

(١) A new. Approach to psychical research.

(٢) Readings in the philosophical problems of parapsychology.

(٣) Evolutionary Ethics.

(٤) Darwanian Evolution.

فەلسەفەیەکی نوێ بە ناوی (ڕێبازی ئایدیالیزم) کە بیردۆزێکە وای دەبینێت ڕاستی بنەڕەتی شتە ماددیەکان لەناو عەقڵدایە و، ئەم شتە ماددیانە لە دەرەوەی عەقڵدا بوونیان نییە! دوای ئەو کتێبە بە چەند ساڵێك لە کتێبەکەمدا بەناوی (پێشەکی فەلسەفەی ڕۆژئاوایی)[1] ئەوەم ڕوون کردەوە کە ئەم ڕێبازە زانست وێران دەکات؛ بەو پێیەی پێمان دەڵێت کە هەموو بوون بوونی نییە، بەمەش هەموو زانستەکان پەکیان دەکەوێت، تەنانەت عەقڵ خۆیشی بوونی نامێنێت.

لەوانەیە ئەو چەند لاپەڕەیەی ژیانی زانستیم وەڵامی ئەو پرسیارەی نەدابێتەوە: بۆچی و کەی بووم بە فەیلەسووف؟

ئەمە پرسیارێکە وەڵامێکی دیاریکراوم بۆی نییە.

بە کورتی دەتوانین بڵێین: لە ڕاستیدا گرنگیدانم بە فەلسەفە لە سەردەمی خوێندنم لە قوتابخانەی کینگزوود دەستی پێکرد و، کاتێك ئامادەی دیدارەکانی یانەی سوقرات دەبووم لە ئۆکسفۆرد لە بابەتە فەلسەفییەکان نزیکتر بووم. لەوانەیە هەڵبژاردنی خوێندنی باڵام لەژێر دەستی جیلبێرت رایل خاڵی وەرچەرخانی ژیانم بوویێت بەرەو فەلسەفە، ئەو خاڵەش هەموو پەتەکانی تری بە پسپۆڕییەکانی ترەوە پچڕاند.

---

(١) An Introduction towestern Philosophy.



## باسی دووەم : بەرهەمی درەختی بێباوەڕیی

گرنگیدانم بە فەلسەفە خەریك بوو شێوەیەکی ئەکادیمی وەردەگرت، ئەمەش لە ساتەوەختی لێکۆڵینەوەی (ساختەیی زانستی لاهوت). هەروەها لە ماوەی نیو سەدەدا نزیکەی سی و پێنج کتێبم لە لقە جیاجیاکانی فەلسەفە نووسیوە.
فەلسەفەی بابەتە خوداییەکان لە هەموو لقەکانی فەلسەفە زیاتر سەرنجی منی ڕادەکێشا، هەروەك چۆن لە بوارەکانی فەلسەفەی زمان و لۆژیك و ڕەوشت و کۆمەڵایەتی و سیاسەت و فێربوونیش نووسینم هەبووە. هەروەها لەسەر پرسەکانی وەك ئازادی ویست و پاراسایکۆلۆجی و ژیانی دوای مردن و پرسەکانی تر نووسیومە .

لەم باسەدا لە چوار وێستگەدا دەوەستین، کە من بە بەردی گۆشەی بناغەی دیدی بێباوەڕی خۆمیان دادەنێم، کە بۆ ماوەی پەنجا ساڵ لەسەر بابەتە خوداییەکان نووسیم، دوای ئەوە هەستم کرد کە چەمکە فەلسەفییەکانم درووست بوون و پێگەیشتوون و جێگیر بوون.

### أ- ساختەیی زانستی لاهوت Theology and falsification :

لە باسی ڕابردوو باسی ئەو بارودۆخەی دەوری ئەم لێکۆڵینەوەیەم کرد، کە لە ساڵی ١٩٥٠ لە بەردەم یانەی سوقرات لە ئۆکسفۆرد پێشکەشم کرد. لێکۆڵینەوەکەم بە باسکردنی ئەو هۆکارانە دەستپێکردووە کە بوونە هۆی ئەوەی لە تەمەنێکی زوودا ڕەوتی بێباوەڕی هەڵبژێرم. ئەو هۆکارانەش لە دوو خاڵدا خۆیان دەنوێنن:

١- گرفتی خراپە و ئازار کە لە بەردەم چەمکی (خودا خۆشەویستییە — خودا خراپەی قبوڵ نییە) دەوەستێتەوە.

٢- ڕەهایی ویستی خودایی، بیانوویەکی بەهێز نییە بۆ ڕشتنی هەموو ئەو ئازار و مەینەتییانە بەسەر مرۆڤدا.

ئەم لێکۆڵینەوەیەم لەسەر ئەم یاسا فەلسەفییە بنیاتنا، کە دەڵێت: ناتوانرێ بانگەشەیەك قەبووڵ بکرێت، تا نەتوانین بەڵگە لەسەر هەڵەیی هەموو ئەو بۆچوونانە بهێنینەوە کە دژایەتی دەکەن.

بۆ نموونە، بانگەشەی ئەوەی کە زەوی خڕە، بۆچوونە دژەکەی ئەوەیە کە لەبەر چاوی ئێمە تەختە، بۆیە پێویستە بەڵگە لەسەر هەڵەیی ئەو بۆچوونە ڕووکەشە بهێنینەوە.

لە کاتی جێبەجێکردنی ئەم یاسایە، بۆ بڕیاردان لەسەر ڕاستی بانگەشەی باوەڕداران، کە (خودا خۆشەویستییە) (واتە خودا خۆشی دەوێین)، ئەوا دەبو هەرچی خراپە و کۆژان و ئازار و مەینەتییە لە ژیانی مرۆڤدا نەمایە، بەڵام لە واقیعدا ئەمە نابینین.

بۆچی لە بوونی ئەم شتە دژیەکانەی لە ژیانماندا بوونیان هەیە ئەوە نەخوێنینەوە کە خودا خۆشی ناوێین، یان خودا هەر بوونی نییە، بەتایبەت کە دیندارەکان بەڵگەی حاشا هەڵنەگری وایان نەخستۆتەڕوو، کە خودایەك هەیە و خۆشی دەوێین.

هەروەها لێکۆڵینەوەکە گرنگی شیکردنەوەی واتای چەمکە زمانەوانییەکان دەخاتەڕوو، کە دیندارەکان چەمکە ئایینیەکانیانی پێ دەخەنەڕوو (فەلسەفەی شیکاریی زمانەوانیی).

مەبەستم لەو باسە ئەوە بوو کە گفتوگۆ لە نێوان بێباوەڕان و باوەڕداران گەرم بکەم و، هانی باوەڕداران بدەم کە چەمك و وشەکانیان وەك (خودا خۆشەویستییە - سێ خودایی - خاچ...) بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا شیبکەنەوە، بەتایبەت لە کاتێکدا بەڵگەی بەهێز هەیە کە پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئەوانە.

سەرەڕای ئەوەش هێشتا هەندێ کەس بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە من لەسەر ڕێبازی ماددیگەرایی لۆژیکیم، کە پێی وایە چەمکە ئایینییەکان هیچ واتایەکیان نییە و شایەنی گفتوگۆ لەسەر کردن نین، بەڵام من بە هیچ جۆرێك مەبەستم ئەوە نەبووە. بەڵکو من پێم وایە بانگەواز کردنم بۆ گفتوگۆی نێوان باوەڕداران و بێباوەڕان، هەروەها بانگەوازم بۆ شیکردنەوەی چەمکەکانی باوەڕداران و بەر پەرچدانەوەی بۆچوونە پێچەوانەکانیان، لێدانێکی کوشندەبوو بۆ فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی.

ئەم لێکۆڵینەوەیە بە شێوەیەکی بەرچاو بڵاوبووەوە و چەندین جار چاپ کرایەوە و، بوو بە بڵاوترین لێکۆڵینەوەی فەلسەفی لە سەدەی بیستەمدا، بەم شێوەیە باسی دەکرا کە ((بیروبۆچوون و بەڵگەی نوێ لە بواری فەلسەفەی بێباوەڕیدا دەخاتەڕوو)) و ((ڕێبازێکی فەلسەفی نوێ بۆ لێکۆڵینەوە لە پرسی خوایەتی دەخاتەڕوو)).

## لە جیاوازی بیروڕا فێردەبین

لێکۆڵینەوەکەم (ساختەیی زانستی لاهوت) کاردانەوەی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا، کە تا دەیان ساڵ (تا ئەمڕۆش) هەر بەردەوامە، هەندێك لەو کاردانەوانە یارمەتیدەرم بوون بۆ ڕاستکردنەوەی هەندێك لە بۆچوونەکانم.

((ر.م هەیر[1] R.M.Hare)) (مامۆستای فەلسەفەی ئۆکسفۆرد) نەیاری ئەوە بوو کە لەگەڵ چەمکە ئایینییەکان بە شێوازی شیکاری لۆژیکی و ووردبینی زمانەوانیی مامەڵە بکرێت و، بانگەوازی بۆ ئەوە دەکرد کە چەمکە ئایینییەکان بە شێوەیەکی گشتگیر وەربگرین. من پێم وانییە کە دیندارەکان ئەم قسەیەیان بەدڵ بێت؛ چونکە بە هەموو جۆرێك باوەڕی بنیاتنراو لەسەر بەڵگەی عەقڵ و لۆژیك ڕەتدەکاتەوە.

---

(١) ر.م هەیر R.M.Hare (١٩١٩ - ٢٠٠٢ز).

هەرچی ((بازل میشێل[1] Basil Mitchel)) بوو، کە (دوای لویس بوو بەسەرۆکی یانەی سوقرات لە ئۆکسفۆرد) ئەو نەیاری ئەوە بوو کە هیچ بەربەستێك نییە لە هەمبەر ئەوەی کە لەناو بیروباوەڕە ئایینییەکاندا شتی وا هەبێت کە لەگەڵ ڕاستییە دیارەکاندا تێك بگیرێت، ئەمە بەهۆی ئەوەی کە ئەم بیروباوەڕانە شتی غەیبی لەخۆ دەگرن.

هەروەها ((ئای - ئێم - کرۆمبی I.M.Crombie)) (گرنگیدەر بە فەلسەفەی ئەفلاتون) دەڵێت: پێویستە لەژێر ڕۆشنایی سێ بنەمادا لە چەمکە ئایینییەکان تێبگەین:

یەکەم: بوونی خودایی بوونێکی لە سرووشت بەدەرە، بەدەرە لە هەموو ئەو شتانەی دەیزانین و دەیناسین، بۆیە ئەوەی کە بوونی درووستکراوی پێ وەسف دەکرێت بەسەر خودای درووستکەردا جێبەجێ نابێت.

دووەم: لەسەر بنەمای (یەکەم)، بوونی خودایی لە سنووری پەی پێ بردن و تێگەیشتن بەدەرە.

سێیەم: لەسەر بنەمای (یەکەم و دووەم) پێویستە قسەکردن لەسەر خودا بە بەکارهێنانی زمانی مەجاز و ڕەمز و نیشانەوە بێت.

لەبەر ئەوە (کرۆمبی) ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە فەلسەفەی شیکاریی زمانەوانیی کە پشت بە وردبینی زمانەوانیی بۆ وشەکان دەبەستێت بەکاربێنین بۆ تێگەیشتنی دارشتنە تایبەتییەکانی بیروباوەڕە ئایینییەکان.

هەروەها (ڕێبرن هێمبك Rebern hembk)) (مامۆستای فەخریی فەلسەفە و خوێندنی ئایینی لە زانکۆی واشنتن) دەڵێت کە من لە لێکۆڵینەوەکەمدا کەوتوومەتە سێ هەڵەوە:

---

(١) بازل میشێل Basil Mitchel : (لە ساڵی ١٩١٧ز لەدایك بووە) مامۆستای فەلسەفەی ئایینییە لە ئۆکسفۆرد.

یەکەم: ئەوەی کە من پێم وایە مەبەست لە هەر ڕستەیەك واتای زمانەوانیی ڕووکەشی وشەکانە، بەبێ وردبوونەوە لە دیوی دووەمی واتا (مەجاز).

دووەم: ئەوەی کە من پێم وایە ڕێکنەکەوتنی بەڵگەیەك لەگەڵ بیروباوەڕێکدا، بەڵگەکە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم بیروباوەڕە هەڵەیە، لە کاتێکدا پێویستە جیاوازی بکرێت لە نێوان ڕێکنەکەوتن و هەڵەدا.

سێیەم: دیندارەکان هەست بە بوونی هیچ هەڤدژییەك ناکەن لە نێوان گرفتی خراپە و ئازار و چەمکی خودا خۆشەویستییە. بەوە وەڵامی من دەداتەوە کە دیندارەکان ئەم هەڤدژی و تێکگیرانە ڕووکەشییە دەزانن، بەڵام زۆر لێکدانەوەش بۆ نەهێشتنی دەخەنەڕوو.

هەروەها هێمبك وای دەبینێت کە هەڵەی گەورەی بابەتیم بریتییە لە بڕیاردانی ڕاست و هەڵە بەسەر چەمکێکدا، بەوەی کە من بە چاوێکی ڕەها و بەبێ ڕەچاوکردنی بارودۆخی دەوروبەری سەیری دەکەم.

بێگومان، ڕای هێمبك لە ڕاسترین ئەو ڕەخنانە بوو کە ڕووبەڕووی لێکۆڵینەوەکەم (ساختەیی زانستی لاهوت) کرایەوە و سوودێکی زۆرم لێ بینی بۆ ڕاستکردنەوەی ڕێبازە فەلسەفییەکەم.

## ب- خودا و فەلسەفە God and philosophy :

لەم کتێبەمدا لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیانەی شیکاریم بۆ ئایینی مەسیحی کردووە؛ چونکە لە نووسینە نوێیەکاندا شیکارییەکی هاوچەرخم لەسەر بیروباوەڕی مەسیحی بەدی نەدەکرد، ئەو بیروباوەڕانەی لەلای مەسیحییەکان بنەڕەتی و سرووشتین.

کتێبەکە لە ساڵی ١٩٦٦ دەرچووە و زۆر جار چاپکرایەوە، کۆتا چاپی ساڵی ٢٠٠٥ بوو.

لە کتێبەکەدا ڕێبازێکی تەواوم بۆ بێباوەڕان دارشتووە، کە بۆ ئایین بە سێ قۆناغدا تێدەپەڕێت، باسی ئەوەم کردووە کە یەکەمین شت کە دەستی پێبکرێت،

سڕینەوەی چەمکی خودایە، کە (ڕووحە، هەموو بوونە، هەموو زانستە) دوای ئەوە نۆرەی هەڵسەنگاندنی بەڵگەکانی ئایینی سرووشتی دێت[1]، پاشان وەڵامدانەوەی پڕوپاگەندەی وەحی خودایی.

بۆ سڕینەوەی چەمکی خودا، باسی ئەوەم کردووە، کە دەبێت وەڵامی سێ پرسیاری گرنگ بدرێتەوە:

- چۆن خودا پێناسە بکەین.

- چۆن خودا بە هەندێك سیفەت وەسف بکەین کە لەگەڵ خاسیەتەکانی ئێمەی مرۆڤدا هاوشێوەیە وەك (بوون و توانا و زانست)، سەرەڕای بانگەشەی دیندارەکان بەوەی کە ئەم سیفەتانەی خودا بە تەواوی لە سیفەتەکانی بوونەوەر جیاوازن؟

- ئەگەر دان بە بوونی خودایەکی چاکەکاردا بنێین، چۆن گرفتی خراپە و ئازار لێکبدەینەوە؟

سەبارەت بە پرسیاری دووەم وەڵامی دیندارەکان ئامادەبوو، بەوەی کە وەسفکردنی خودا بەوە دەکرێت کە لە زانستی لۆژیکدا بە شێوازی هاوشێوە ناسراوە، ئەوەی کە دەتوانین خودا بە سیفەتگەلێك وەسف بکەین کە ئێمە لە سیفەتی مرۆڤەکاندا دەیانبینین، وەك (بوون، زیندوو، توانا، زانا) لەگەڵ زانینی ئەوەی کە جیاوازی چۆنییەتی و چەندێتی لە نێوان بەدیهێنەر و بەدیهێنراو لەم سیفەتانەدا هەیە.

بەهەمان شێوە وەڵامیان بۆ پرسیاری سێیەم ئامادەبوو، کە بریتی بوو لە ڕەهایی ویست لەوەدایە کە خودا چاکە و خراپەی هێناوەتە سەر مرۆڤ، خراپە تەنیا تاقیکردنەوەیە بۆ مرۆڤ، کە لە ژیانی دیکەدا قەرەبووی بۆ دەکرێتەوە.

بەڵام پرسیاری یەکەم، پێشتر گرنگییەکی زۆری لەلایەن دینداران پێنەدەدرا. من دەمویست بەو پرسیارە ئەوە دووپات بکەمەوە کە ناکرێت گفتوگۆ لەسەر

---

(١) ئایینی سرووشتی Natural Religion : بریتییە لە دەرك کردن بە بوونی خودا لە ڕێی وەحییەوە، ئەگەر چی بە پێویستی نازانێت کە وەحی ڕەت بکرێتەوە. ئەم چەمك و تێڕوانینە لە هەردوو سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا بڵاو بوو. لە سەردەمی هاوچەرخیشدا ئەم چەمکە بۆ ئەوە بەکاردێت کە لە نێوان هەموو مرۆڤەکان و هەموو ڕەگەزەکاندا، هەستێکی سرووشتی بۆ بوونی خودا هەیە.

بوونی خودا بکەین، بەر لەوەی بتوانین پێناسەی ئەو خودایە بکەین و واتا و سیفەتەکانی بزانین (وەك لە هەموو شوێنێکدا بوونی هەیە و لاشەی نییە).

فەیلەسووف (ریچارد سوینبێرن[1] Richard Swinburne) یەکێك بوو لە بەتواناترین ئەوانەی کە وەڵامی ئەم پرسیارەی دایەوە. گوتی: حەقیقەتی مرۆڤ لە لاشە و ڕەفتاری جیاوازە، بۆیە ئەگەر مەحاڵ بێت حەقیقەتی مرۆڤ بە تەواوی بزانین ئەوا سەبارەت بە خوا مەحاڵترە.

هەروەها فەیلەسووفی بەناوبانگی ئینگلیزی (فریدریك کۆپلستۆن[2] Frederick copleston) هۆشیاری بەرامبەر مەترسیداری پرسیارەکەم ڕاگەیاندبوو و، وەڵامی دایەوە بەوەی کە لە توانای عەقڵی مرۆڤدا نییە، وەك چۆن بە پەنجە ئاماژە بۆ پەپولەیەك دەکات ئاواش ئاماژە بۆ خودا بکات، هەروەها گوتبووی کە خودا بە ئەندازەی دەرچوون و بەرزبوونەوەی هەر مرۆڤێك لە چوار چێوەی کات و شوێن خۆی بۆ ئەو کەسە دەردەخات.

چوومە قۆناغی دووەمەوە، جەختم لەسەر ئەوە کردەوە کە بەڵگەکانی بوونی خودا، کە لە وردی دیزاین و دارِشتنی گەردوون و سرووشتی چەمکە ڕەوشتییەکان (بەڵگەکانی ئایینی سرووشتی) هەڵێنجراون، بەڵگەی بێهێزن. پاشان بەوە کۆتاییم پێهێنا کە؛ بانگەشەکانی وەحی خودایی لە بەرامبەر نەشتەری وردبینی خۆیان ناگرن.

ئێستاش، ئەوەی کە بەر لە چل ساڵ لە کتێبی (خودا و فەلسەفە) خستوومەتەڕوو لە بەڵگە و پرسیار، تەنیا هەنگاوێکی ڕێگاکەیە؛ چونکە وازم لە زۆربەی چەمکەکانی ناو کتێبەکە هێناوە.

---

(١) ریچارد سوینبێرن Richard Swinburne: بەریتانییە لە ساڵی ١٩٣٤ لە دایك بووە. مامۆستای فەلسەفەی شیکاری بوو لە زانکۆی ئۆکسفۆرد و گرنگییەکی زۆری بە فەلسەفەی ئایینەکان و فەلسەفەی زانست دەدا. هەر دوو سێ ساڵ جارێك کتێبێکی فەلسەفی قوڵ بڵاودەکاتەوە، بە شێوازێکی وا دەنوسێت کە خەڵکی ئاساییش تێی بگەن. لە گرنگترین ئەو کتێبانە Is there a God کە بۆ سەر زیاتر لە ١٢ زمان وەرگێڕدراوە.

(٢) فریدریك کۆپلستۆن Fredrick copleston: (١٩٠٧ - ١٩٩٤) مەوسوعەیەکی بەناوبانگی هەیە دەربارەی مێژووی فەلسەفە کە ٩ بەرگە.

## ج- گریمانەی بێباوەڕی The Presumption of Atheism

لەم کتێبەدا (لە ساڵی ١٩٧٦ دەرچووە) تۆپەکەم خستۆتە گۆڕەپانی دیندارەکان؛ بەوەی کە سەلماندنی بوونی خودام خستۆتە ئەستۆی باوەڕداران، کە پێویستە بەڵگەی وا بخەنەڕوو کە بێباوەڕان بێدەنگ بکەن؛ چونکە سەلماندن لەسەر ئەو کەسەیە کە بانگەشە دەکات. ئەمە دوای ئەوەی کە ڕێبازی فەلسەفەی ئایینەکان ئەوە بو کە بەرپرسیاریەتی سەلماندنی نەبوونی خودایان دەخستە ئەستۆی بێباوەڕان، بە بەڵگەی ئەوەی کە هەستکردن بە بوونی خودا هەستێکی سرووشتی و خۆڕسکە.

ئەم خستنەڕووە هەڵوێستی دیندارەکانی لە ڕەگ و ڕیشەوە لەرزاند، چونکە باوەڕبوون بە خودا پێشتر هیچ کات نەکەوتبووە بەردەم ڕووبەڕووبوونەوەیەکی لەم جۆرە.

هەروەها باسی ئەوەم کردووە کە سەلماندنی بوونی خودا دەبێ بەو قۆناغەدا تێبپەڕێت کە هەر گریمانەیەکی زانستی یان فەلسەفی پێیدا تێدەپەڕێت، ئەوانیش:

١- پێناسەکردنی چەمکی خودا کە سەلماندنی دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە.

٢- دیاریکردنی چۆنیەتی لێکۆڵینەوە لە دیاردەکە (هەر دیاردەیەك شێوازی لێکۆڵینەوەی تایبەت بە خۆی هەیە).

٣- خستنەڕو و شیکردنەوەی ئەو بەڵگانەی ئاماژە بۆ ڕاستیی ئەم چەمکە دەکەن (گریمانەی بوونی خودا).

من هەر سووربووم لە دەستگرتن بە هەڵوێستی حاشاکردن لە بوون، بۆ ئەوەی ئەوانی دی بەڵگەی بوونی خودام بۆ بخەنەڕوو. من ئەم ڕێبازەم خستەڕوو و چاك دەمزانی کە سەلماندنی شتێك زۆر ئەستەمترە لە حاشالێکردنی.

گەورەترین بەرگری لەو داواکارییەی لە باوەڕدارانم کردبوو، لە لایەن گەورە فەیلەسووفی ئەمریکی (ئەلڤین پلاتینگا[1] Alvin Platinga)وە هات. کە

---

(١) ئەلڤین پلاتینگا Alvin Platinga : لە ساڵی ١٩٣٢ لەدایك بووە، مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی نۆتردام، گرنگی دەدات بە فەلسەفەی ئایینەکان و بنچینەکانی زانیاری و غەیبییات، گۆڤاری تایم بە

پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە (باوەڕ هەستێکی سرووشتییە) و باوەڕبوون بە بوونی خودا، وەك باوەڕبوونە بە چەمکە بنەڕەتییەکانی تر، وەك ئەوەی باوەڕت هەبێت کە کەسانی دی وەك ئێمە عەقڵیان هەیە و، وەك باوەڕبوون بە تەندروستیی هەستەکانمان و، وەك باوەڕبوون بەوەی کە دەڵێین هەموو گەورەترە لە بەشێك، .. ئێمە باوەڕمان بەم چەمکانە هەیە، بەبێ ئەوەی پێویستیمان بەوە هەبێت بەڵگەیان لەسەر بێنینەوە.

بەڵام فەیلەسووف (رالف مك ئاینێرنی[1] Ralph Mc Inerny) دەستگرتوو بوو بە ڕێکخراوی و موعجیزەیی لە بنچینەی بووندا و، لە جێگیری یاساکانی سرووشت، کە دەبنە هۆی ئەوەی بلێین (بوونی خودا ڕاستییەکی لۆژیکییە) و، ئەوەی کە بەرهەڵستی ئەو بۆچوونەش دەکات پێویستە بەڵگە بخاتەڕوو.

## د- من و دێڤید هیوم :

لە یەکێك لە قۆناغەکانی ژیانمدا گرنگیم دەدا بە فەلسەفەی (دێڤید هیوم[2] David Hum) (یەکێك لە توندترین بێباوەڕەکان بوو)، لە ساڵی (١٩٦١) کتێبێکی نووسی بە ناوونیشانی (فەلسەفەی باوەڕ لەلای هیوم Humes Philosophy of Belief، لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانمدا زۆر لە بۆچوونەکانی هیومم وەرگرتبو، بەر لەوەی دواتر ڕای خۆمم دەربارەی بۆچوونەکانی بگۆڕم.

---

(فەیلەسووفی خودا) وەسفی دەکات.

(١) رالف مك ئاینێرنی Ralph Mc Inemy: مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی نۆتردام، ئەمریکییە و لە ساڵی ١٩٢٩ لە دایك بووە. کتێبێکی هەیە دەربارەی مەسیحییەت و ئایینی مەسیحی و هەندێك چیرۆکی ئایینی.

(٢) دێڤید هیوم David Hum: فەیلەسووفی بێباوەڕی بەناوبانگی سکۆتلەندی (١٧١١ - ١٧٧٦) هیوم ئەو پێگە تایبەتییەی ڕەتدەکردەوە کە فەلسەفە بۆ مرۆڤی دادەنێت، بەوەی کە بەدیهێنراوێکی جیاوازی خودایە. هەروەها یاساکانی (فەلسەفەی سرووشتیی) چەسپاند، کە تەنیا لە ڕێی شتە ماددییەکانەوە سەیری مرۆڤ دەکات و مرۆڤ و بوونەوەرەکانی تر هاوتا دەکات. هەروەها بە تەواوی بەڵگەی دیزاین ڕەتدەکاتەوە. هەروەها گرنگی دەدا بە فەلسەفەی سیاسەت و مێژوو و، کتێبێکی هەیە دەربارەی مێژووی ئینگلتەرا، کە شەش بەرگە.

یەکێك لە گرنگترین ئەو پرسانەی کە ڕای خۆمم لەسەر گۆڕی، پرسی ڕەتکردنەوەی (پەیوەندی ئەنجام بە هۆکار Cause and Effect law) بوو. چونکە هیوم وایدەبینێت کە ئەگەر سەرنجی ئاو بدەین کە لە (١٠٠) پلە دەکوڵێت، ئەوە واتای ئەوە نییە کە هیچ پەیوەندییەکی هۆکاری لە نێوان گەرمکردن و کوڵاندا هەیە! ئەو وایدادەنێت کە تەنیا پەیوەندییەکە عەقڵ دایناوە، ئەمەش بەهۆی زۆری دووبارەبوونەوەی ئەو ئاوێتەبوونە Assocation. واتە، عەقڵی ئێمە لەو ئاوێتەبوونە یاسایەکی داڕشتووە کە ئاو لە (١٠٠) پلە دەکوڵێت.

هەروەها (هیوم) پێی وایە ئەوە عەقڵی ئێمەیە گریمانەی هەموو ئەو پەیوەندییانەی کردووە کە لە دەوروبەری ئێمەدا بوونیان هەیە و دەیانبینین و، لە ئەنجامدا هیچ یاسایەك بوونی نییە کە سرووشت بەڕێوەببات! من ئێستا باوەڕم وایە کە ئەم تێڕوانینە هەموو مەوزوعییەت و بابەتییەکی دەوروبەرمان لەناو دەبات و هەموو زانستەکان لە بناغەوە هەڵدەکەنێت.

## ئازادی و ویستی مرۆڤ:

یەکێکی تر لە چەمکەکانی هیوم کە بۆ ماوەیەك کاریگەری لەسەرم هەبوو و، دواتر بۆچوونی خۆمم گۆڕی، پرسی ((ئازادی ویستی مرۆڤ)) (ناچاری و ئارەزوومەندی)[1] کە پرسێکی گرنگە لە فەلسەفە و هەموو ئایینەکاندا.

لە سەرەتای دروستبوونی قەناعەتە بێباوەڕیەکەمدا، بابەتی گرفتی خراپە و ئازار کێشەکەی لەلام دروست دەکرد. دیندارەکانیش بەوە وەڵامی ئەم کێشەیەیان دەدایەوە، کە خودا ویستێکی ئازادی بە مرۆڤ داوە و، هەڵبژاردنی خراپ و هەڵەی مرۆڤە کە دەبێتە هۆکاری زۆربەی خراپەکانی وەك جەنگەکان (من ئەو بۆچوونەی ئەوانم ناونابوو ((بەرگری ویستی ئازاد)).

---

(١) ناچاری و ئارەزوومەندی: ڕێبازی ناچاری وایدەبینێت کە مرۆڤ ویستێکی ئازادی نییە و لە هەموو کارەکانیدا ناچارکراوە کە چی بکات. بەمەش گریمانەی پاداشت و سزای ژیانی دیکە دەڕەوێتەوە.
هەرچی ڕێبازی ئارەزوومەندییە، وایدەبینێت کە مرۆڤ ویستێکی ئازادی هەیە کە لەنێوان بژاردە جیاوازەکاندا باشترین هەڵبژێرێت، لە هەندێك لایەنیشدا ناچارکراوە، وەك بابەتی مردن و نەخۆشی و کارەساتەکان.

بەڵام چۆن بتوانین لێکدانەوە بۆ کارەساتە سرووشتییەکان بکەین و، چۆن هەماهەنگییەك لەنێوان ویستی ئازادی مرۆڤ و ڕەهایی ویستی خوداییدا بکەین، لەگەڵ زانستی پێشوەختی خودایی دەربارەی کردەوەکانمان (ڕەهایی زانستی خودایی)؟

ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بوونی ویستی ڕەهای خودا دەتوانێت ویستی ئەوە لە مرۆڤدا درووست بکات کە گوێڕایەڵی ئەو بکات، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە خودا مرۆڤ ناچار دەکات گوێڕایەڵی بکات، سەرەڕای ئەوەی کە ویستێکی ئازادی پێبەخشیوە؟!

لە قۆناغی دواتردا، دەرکم بەوە کرد کە پێویستە جیاوازی لە نێوان دوو واتای جیاوازی وشەی هۆکار Cause بکەین. چونکە هەندێك هۆکار هەن کە دەرەنجامی کاری مرۆڤن (هۆکارە مرۆییەکان)، هەندێك هۆکاریش هەن لە دەرەوەی کاری مرۆڤ (هۆکارە سرووشتییە فیزیاییەکان).

ئەم دابەشکردنە یارمەتیمان دەدات بۆ تێگەیشتن لە بنەمای حەتمیی و چارەنووسیی[1] Determinis با دیاردەی خۆرگیران بە نموونە وەربگرین، کە هۆکارەکەی فیزیاییە، ئەم دیاردەیە چارەنووسییە و هەردەبێ ڕوویدات، ئەگەر خۆر لەگەڵ مانگ و زەویدا کەوتنە سەر یەك هێڵ، ئەگەر ئەو بارودۆخە سرووشتییە نەبێت مەحاڵە ڕوویدات. ئەمە نموونەیەکی باشە بۆ پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان هۆکار و دەرەنجام لە دۆخی هۆکارە سرووشتییە فیزیاییەکان.

بەڵام ئەگەر سەرنجی کاری مرۆڤ بدەین، وەك ئەوەی کە کاتێك ڕوودەدات کە من هەواڵێکی خۆشم بۆ تۆ پێبێت، تۆ لە خۆشیدا نقوم دەبی و هاواردەکەی یان لەو کاتەدا سوجدە بۆ خودا دەبەی، لەوانەشە ئەو بژاردەیە هەڵبژێری کە لەو کاتەدا بە هیچ شێوازێك ئاهەنگ نەگێڕی، وەك ئەگەر لە کتێبخانەیەکی گشتی دانیشتبووی.

---

(١) حەتمییەت: مەزهەبێکی فەلسەفییە، دەڵێت کە کاروکردەوە و بڕیار و هەڵبژاردنەکانی مرۆڤ و گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و سرووشتییەکانی، بەرهەمی چەند هۆکارێکن کە مرۆڤ هیچ دەسەڵاتێکی بەسەریاندا نییە و ئەو دەرەنجامانە دەرەنجامی حەتمین بۆ چەند هۆکارێکی بەدەر لە ویستی مرۆڤ.

کەواتە هەواڵدانی من بۆ تۆ هۆکارێکی حەتمیی و ناچاری نەبوو، هۆکارێکە هانی کارێکی تر دەدات، بەڵام ناچارمان ناکات ئەو کارە بکەین، بەردەوام بوارێك بۆ ویستی ئازادی مرۆڤ دەهێڵێتەوە.

ئێستا من جیاوازی لە نێوان دوو جۆر هۆکاردا دەکەم، هۆکاری فیزیایی کە چارەنووسییەکی فیزیایی بەدوادادێت، کە مرۆڤ تێیدا ناتوانێت ئازادی ویستی تێدا هەبێت.

هەروەها هۆکاری مرۆیی کە تێیدا ئازادی تەواوی هەڵبژاردنمان هەیە، چونکە ویستەکانمان زۆرەملێیان لەسەر نییە، کە نەتوانین ڕووبەڕویان ببینەوە، بەڵکو زۆربەمان توانای جڵەوگیرکردنی ئارەزووەکانمان هەیە. بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەی دەمانەوێت.

بۆ ئەوەی لە بواری ئازادی کاری مرۆڤ تێبگەین، پێویستە بەراوردێك لە نێوان دوو جۆری جووڵەدا بکەین Movings و motions:

Movings: ئەو جووڵەیەیە کە بە ویستی خۆمان دەستپێدەکەین و کۆتایی پێدێنین، وەك چوون لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.

Motions: ئەو جوڵەیەیە کە ناتوانین بە ویستی خۆمان دەستپێبکەین یان کۆتایی پێبێنین، وەك جوڵەی ماسولکەی دڵ.

ئێستا باوەڕم بەوە هەیە کە مرۆڤ بونەوەرێکە توانای هەڵبژاردنی هەیە لە نێوان بژاردە ڕاستەقینەکاندا.

ئێستا باوەڕم بەوە هەیە کە هیوم و (زۆری دی) کەوتوونەتە هەڵەیەکی گەورەوە بە گشتگیرکردنی بنەمای چارەنووسیی یاسا فیزیاییەکان و جێبەجێکردنیان بەسەر ڕەفتاری مرۆڤدا؛ کە وای بۆ دەچن مرۆڤ جگە لەو کارەی ئەنجامی داوە توانای هەڵبژاردنی هیچی تری نەبووە (چارەنووسیی ڕەفتاری مرۆڤ).

ئایا لێرەدا هەست بە هەڵدێرییەکی بنچینەیی ناکەی لە هزری هیومدا. پێشتر حاشای لە بوونی پەیوەندی لە نێوان هۆکار و دەرەنجامدا دەکرد، کە چی

ئێستا باسی چارەنووسییەتی هۆکارە فیزیاییەکان و تەنانەت هۆکارە مرۆییەکانیش دەکات!!

چۆن فەیلەسووفێکی گەورەی وەك دێڤید هیوم دەکەوێتە هەڤدژییەکی وا بنچینەیی و گەورەوە؟ کەم و کورتی لە ڕێبازە فەلسەفییەکەدا نییە، بەڵکو لە توانای مرۆڤدایە کە نەتوانێت پاشەکشە لە یەکێك لە بیروڕاکانی بکات، تا بگاتە ئاستێك لە هەڤدژی هزری کە بە هیچ شێوەیەك نەتوانرێ کۆ بکرێنەوە. بێگومان ئەمە کێشەی گەورەی فەیلەسووفە بێباوەڕەکانی سەردەمی نوێیە.

## باسی سێیەم: لە بێباوەڕییەوە بەرەو گومان بەرەو باوەڕ



دوای ئەوەی قەناعەتە بێباوەڕییەکانم تەواو و تۆکمەبوون، کە لە ساڵی ١٩٧٦ لە کتێبی (گریمانەی بێباوەڕیی The presumption of Atheism) دا چەکەرمیان کرد، چوومە سەر لقە جیاوازەکانی تری فەلسەفە و زانستی کۆمەڵناسی و سیاسەت.

هەنگاوە فراوانەکانی زانست زیاتر گەرمیان دەکردم، بەتایبەت گریمانەی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون، کە درووستبوونی گەردوون شیکار دەکات، هەروەها دۆزینەوە و درووستبوون و میکانیزمی کاری ماددەی بۆماوەیی لە خانە زیندووەکاندا (DNA).

سەرەڕای هەموو ئەمانە، هێشتا گرنگیدان بە فەلسەفەی ئایینەکان بەسەر بیرکردنەوەکانمدا زاڵ بوو. وا دیاربوو کەسانی دی منیان وەك نوێنەر و بەرپرسی هزری بێباوەڕی دەدی، بۆیە بانگهێشتی زۆر گفتوگۆ و دیبەیت کرام، کە لە سێ شێوەدا خۆیان دەبینییەوە؛ یان دیبەیتی گشتی یان گفتوگۆی سنوردار یان دەمەقاڵێی ڕۆژنامە گشتییەکان و گۆڤارە فەلسەفییە تایبەتەکان.

لێرەدا هەندێك لە دیبەیتە گرنگەکان دەخەمەڕوو، کە لە ماوەی ژیانی دوورودرێژی فەلسەفیمدا ئەنجامم داون، کە تێیدا پاشەکشێی هێواش هێواشم لە هەڵوێستە بێباوەڕییەکەمدا بەرەو کۆمەڵی گومانکاراندا پیشان دەدات.

## أ- بەڵگەی پیاوە کەچەڵەکە :

ئەم دیبەیتە لە ساڵی ١٩٧٦ لە زانکۆی ویلایەتی تەکساسی باکور ئەنجامدرا لەگەڵ گەورە فەیلەسووفی ئایینی (د. تۆماس وارین[1] Thomas Warren)، کە بۆ ماوەی چوار شەو بەردەوام بوو، لە بیستی مانگی سێپتەمبەر دەستپێکرد و، لە هەر شەوێکدا نزیکەی ٥ - ٧ هەزار کەس ئامادەی بوون.

پشتم بەو بەڵگانە دەبەست کە د. وارین دژی بیردۆزی پەرەسەندنی داروین بەکاری دەهێنان. بۆیە د.وارین پرسیاری لێکردم، کە ئایا من باوەڕم بەوە هەیە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بوونەوەرێك هەبووبێت کە نیوەی مرۆڤ بووبێت و نیوەی مەیموون بووبێت؟ وەڵامم دایەوە بەوەی کە ئەم پرسیارە وەك ئەوە وایە بپرسین کەی دەتوانین مرۆڤێك بە کەچەڵ دابنێین. وەڵامەکەم بەم شێوەیە شیکردەوە: گومان لەوە دانییە کە مامۆستاکەم (جێلبێرت رایل) کەچەڵ بوو، بەوەی کە سەری بە تەواوی مووی پێوە نەمابوو، لوس وەك توێکڵی هێلکە، بەڵام ئەگەر سەیری پیاوان بکەین، کە چۆن بە هێواشی تاڵ تاڵ قژیان دەوەرێت، ئەوا ئاسان نییە بتوانین ئەوە دیاری بکەین کە ئەو پیاوە کەی کەچەڵ بووە! بۆیە بێگومان پەرەسەندن کردارێکی زۆر هێواش و لەسەرخۆیە.

لە بەهێزترین ئەو دەستەواژانەی لەو دیبەیتەدا گوتوومە و قەناعەتی بێباوەڕی ئەو کاتم دەردەخەن:

- ئەوەی کە بڵێی خودایەك هەیە، ئەوەندە هەڤدژی تێدایە وەك ئەوەی بڵێی کابرای سەڵتی بە ژن، یان بازنەی چوارگۆشە.

- من باوەڕم وایە کە بوون نە سەرەتای هەیە نە کۆتایی، لە ژیانمدا کەسێك بەڵگەیەکی عەقڵی وای بۆ نەخستوومەتەڕوو کە ئەم بۆچونەم بگۆڕم.

---

(١) د. تۆماس وارین Thomas Warren: مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی نۆتردام، لە ویلایەتە یەکگرتووەکان (١٩٢٠ - ٢٠٠٠).

- من باوەڕم وایە کە بوونەوەرە زیندووەکان لە خۆوە لە ماددەی نازیندوو درووست بوون، بە درێژایی ئەم سەردەمە دوورودرێژانە.

- سەرەڕای ئەو پێشوازی و میوانداریيەی لێمکرا، دیبەیتەکەمان کۆتایی هات و هەریەکەمان سووربوو لەسەر هەڵوێست و قەناعەتی خۆی.

## ب- زۆرانبازی گاوانەکان :

ئەم دیبەیتە گرنگەش هەر لە ویلایەتی تەکساس ئەنجامدرا لە ساڵی (١٩٩٨)، کە نزیکەی چوار هەزار کەس ئامادەی بوون. ئەم دیبەیتەمان هاوشێوەی زۆرانبازی بە دەمانچەی گاوانەکانی ڕۆژئاوای ئەمریکا وابوو، ئێمە چوار بێباوەڕ بووین لە بەرامبەر چوار گەورە فەیلەسووفی دیندارا.

هەردوو لایەنەکە پەیوەست بوون بە هەمان پەیڕەوی بنەما یاساییەکە کە (بەڵگە لەسەر ئەو کەسەیە کە بانگەشە دەکات، نەك ئەوەی حاشا دەکات)[١] بەڵام هیچ کام لە ئێمە هەوڵی ئەوەی نەدا کە وا لەلایەنی بەرامبەر بکات قەناعەتی بە بۆچوونەکانی بکات، بەڵکو تەنیا بە تەقە لێکردن وازیدەهێنا!

بەڵگەکانی لایەنی بێباوەڕەکان ئەوە بوو کە بانگەشەکردنی کەسێك کە نێردراوی ئاسمانە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە خودایەك هەیە کە ناردوویەتی، لەوانەیە ئەو هەستە خەیاڵ یان درۆ بێت. جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە کە بەڵگە کلاسیکییەکان لەسەر پرسی خوایەتی بۆ ئێستا کۆن بوون و هێزیان نەماوە.

ڕکابەرە گەورەکەمان (ئەلڤین پلاتینگۆ Alvin Platingo) سووربوو لەسەر ئەوەی کە باوەڕ هەستێکی سرووشتییە و پێویستی بە بەڵگە نییە، بەتەواوی وەك چەمکە روون و بەدیهییەکانی تر وەك (هەموو لە بەشێك گەورەترە)، یان وەك ئەوەی کە (ئێمە بوونمان هەیە).

---

(١) The onus proof lies on the one who affirms, not on the one who denies.

## ج- شەقبوونی دیواری بەرگری

ئەوەی سەرنجی سێ دیبەیتەکانم بدات کە ئێستا باسیان دەکەم، دەزانێت کە بەڵگە و وەڵامەکانم بەرامبەر بە باوەڕداران بێهێز بوون:

١- لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤارە فەلسەفییەکان دیبەیتێکی گەورەم لەگەڵ فەیلەسوفی ئایینی گەورە (تێری میس Terry miethe) ئەنجامدا، کە تێیدا ئەو بەڵگەیەکی گەردوونی سەرسوڕهێنەری خستەڕوو[1]:

- گەردوون چەندان بوونەوەری گۆڕاوی سنووورداری لەخۆ گرتووە.
- ئەم بونەوەرانە هەر دەبێ بەدیهێنەرێکیان هەبێت.
- ناکرێ بە زنجیرە لەگەڵ بونەوەرەکاندا کە پێویستییان بە بەدیهێنەرێك هەیە تا بێ کۆتایی بڕۆین؛ پێویستە لە شوێنێکدا بوەستین و دان بە بەدیهێنەری یەکەمی ئەم بوونەوەرانەدا بنێین.
- ئەم بەدیهێنەرە یەکەمە پێویستە یەك بێت، ئەزەلی بێت، بوونی حەتمی بێت. ئەم سیفەتانەی بەدیهێنەری یەکەم لە ئایینە ئاسمانییەکاندا سیفاتی خودان.

ئەم بەڵگەیە لەسەر چەمکی (بەدیهێنەری پێویست بۆ بوون Existential Causality) بنیاتنراوە.

سەرەڕای جوانی و بەهێزی ئەم بەڵگەیە، بەڵام من ڕەتم کردەوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە گەردوون هۆکاری ماددی وای لەخۆ گرتووە کە پێویستی بە بەدیهێنەر یان هێزێکی دەرەکی نییە.

٢- لە مونازەرەکەمدا، لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم، لەگەڵ (ریچارد سوینبێرن Retchard Swinburn)دا، کە مامۆستای فەلسەفەی ئایینەکان بوو لە ئۆکسفۆرد (باشترین بەرگریکار بوو لە باوەڕ، کە بە ئینگلیزی قسە بکات)،

---

(١) بەڵگە گەردوونییەکە لە بەشی دووەمدا بە دووردرێژتر باس دەکەین.

بەڵگەکانی سوینبێرن لەوەوە دەستی پێکرد، کە دەبێ بەدیهێنەری گەردوونی ماددی سنووردار ناماددی و بێ سنوور بێت، وەڵامی سوینبێرنم دایەوە بەوەی کە من ناتوانم وێنای بوونەوەرێکی بەم سیفەتانە بکەم.

٣- لە دیبەیتەکەمدا لە ساڵی ١٩٩٨ لەگەڵ (ویلیەم لەین کرێگ[١] William Lane Craig)، کرێگ بەوە دەستی پێکرد کە، ئەو گەردوونەی سەرەتایەکی هەیە و بەم ئەندازەیە ڕێکخراوە، ئەگەر بمانەوێ باشترین لێکدانەوەی بۆ بکەین ئەوەیە کە بڵێین خودایەکی بەدیهێنەر بەدیهێناوە. وەڵامم ئەوەبوو: ئێمە پێویستە لە بیرکردنەوە لە سەرەتای درووستبوونی گەردوون بگەڕێینەوە بۆ تەقینەوە گەورەکە (The Big Bang) و ئەو تەقینەوەیە بە حەقیقەتی یەکەم دابنێین. هەرچی بەڵگەی ڕێکخراوی گەردوونە بەوە بەرگریم کرد کە: وردترین بوونەوەری گەردوون، کە مرۆڤە، دەکرێ بوون و توانای بە یاسا سرووشتییەکان لێکبدرێتەوە.

## د- ژانەکانی سەرەتای ڕاستکردنەوەی ڕێگا

### ڕەواندنەوەی تەمی بیردۆزی پەرەسەندن

بیردۆزی پەرەسەندن[٢] کە هی زانای گەورەی بایۆلۆجی چارلس دارونە

---

(١) ویلیەم لەین کرێگ William Lane Craig : مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی بێولا لە کالیفۆرنیا، لە ساڵی ١٩٤٩ لەدایك بووە. گرنگی دەدات بە فەلسەفەی ئایینەکان و مێژوو و ئایینی سرووشتی.

(٢) بیردۆزی پەرەسەندنی داروین لەسەر سێ دەستەواژە بنیاتنراوە:

یەکەم: زیندەوەرە جیاوازەکان بە پەرەسەندن لە زیندەوەری سادەتر لە خۆیان پەرەیان سەندووە و، زانستی بایۆلۆجی ئەم دەستەواژەیە پشتڕاست دەکاتەوە، دوای ئەوەی بەڵگەی زانستی لەسەر ئەوە کەڵەکە بوون، بەتایبەتی بەڵگەی بایۆلۆجیای بەشیی (جینات) سەرەڕای ئەوەی کە هەندێك دیاردە هەن کە پەرەسەندن توانای لێکدانەوەی نییە.

دووەم: پەرەسەندن دەرئەنجامی هەنگاوی هەڕەمەکییە کە بە ڕێکەوت ڕوویداوە، بەڵام زانستی بایۆلۆجیا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە مەحاڵە هەنگاوی هەڕەمەکی بتوانێت زیندەوەرەکان بۆ زیندەوەری بە تواناتر و ئاڵۆزتر پەرە پێبدات.

سێیەم: سیفاتە باشە نوێیەکان، لە ڕێگای بنچینەی هەڵبژاردنی سرووشتی بۆ نەوەکانی دواتر دەگوازرێتەوە، ئەم چەمکەش لە زانستی بایۆلۆجیدا سەلمێنراوە.

لەبەر ئەوە لەسەر زانایانی بایۆلۆجی بووە شتێکی پێویست کە بیرۆکەی ئەوە قەبوڵ بکەن کە سیفاتە نوێیەکان کە دەبنە هۆی پەرەسەندن، درووستکەرێکی زیرەکیان لە پشتەوەیە و ناکرێ بەهۆی هەنگاوی

(پەرەسەندنی زیندەوەرەکان لە ئەنجامی هەنگاوی هەڕەمەکی پەرمیان سەندووە کە بە ڕێکەوت ڕوویداوە) ئەو بیردۆزە یەکێکە لە گرنگترین ئەو بەڵگانەی بێباوەڕەکان پشتی پێدەبەستن، بۆ لێکدانەوەی جۆراوجۆری زیندەوەرەکان، بەبێ ئەوەی پێویستی بە بەدیهێنەرێك هەبێت، لەبەر ئەوە ئەم بیردۆزە یەکێکە لە بابەتە گەرمەکانی دەمەتەقێی نێوان ماددیەکان و باوەڕداران.

لە کتێبەکەمدا (پەرەسەندنی داروینی) باسی ئەوەم کردووە کە بنەمای ((هەڵبژاردنی سرووشتی Natural selection)) (کە ڕێگا بە زیندەوەرەکان دەدات هەنگاوی هەڕەمەکیی باش کە لە جیناتیاندا هەیە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان بیگوازنەوە) ناتوانێت سیفاتی نوێ لە بونەوەرەکاندا درووست بکات، بەڵکو ئەو سیفەتە خراپ و نەخۆشانەی لە زیندەوەرەکاندا هەیە لەناویان دەبات[1].

ئەوەی کە یارمەتیدەری بڵاوبوونەوەی ئەو هەڵەیە بوو، ئەوەبوو کە داروین دەستەواژەگەلێکی وەك (هەڵبژاردنی سرووشتی) و (مانەوە بۆ باشترینە)ی بەکارهێناوە، ئەگەرچی داروین خۆی دوای ماوەیەك لەو هەڵەیە بە ئاگا هاتەوە و ئەو دەستەواژانەی گۆڕین بۆ (پاراستنی سرووشتی Natural Preservation)، بەڵام هەندێك وەك - ریچارد دۆکنز - بەدەستەواژە هەڵەکانەوە نووسابوون و سووربوون لەسەر بەکارهێنانیان، بۆ ئەوەی بەم کارمیان پاڵپشتی هەڵوێستە بێباوەڕییەکانیان بکەن، سەرەڕای ئەوەی کە داروین خۆی بێباوەڕ نەبوو، وەك لە باسی شەشەمدا ڕوونی دەکەینەوە.

یەکێك لە هەوڵەکانی ریچارد دۆکنز بۆ بەکارهێنانی خراپی چەمکی پەرەسەندن بۆ بێباوەڕی ئەوەیە کە لە کتێبی (جینە خۆ پەرستەکە The selfish gene) باسی کردووە، کە دەڵێت: ئێمەو (زیندەوەرانی دی) دەزگای زیندووین و ڕۆبۆتین بەشێوەیەك بەرنامەکراوین کە پارێزگاری لە جینەکانمان بکەین (DNA کۆدی بۆماوەیی جیاکەرەوەی هەر ڕەگەز و هەر تاکێك).

---

کوێرانەوە ڕوویدەن.

(١) ئەمە تێگەیشتنی ئەنتۆنی فلووە، ئەگەرنا ڕاستییە زانستییەکە ئەوەیە کە هەڵبژاردنی سرووشتی وەك چۆن سیفاتە خراپەکان لەناو دەبات، ئاواش چاك و نوێکان بۆ نەوەکانی دواتر دەگوازێتەوە.

دۆكنز وایدەبینێت كە بوونەوەری زیندووی بنچینەیی جینە و، هەموو دەزگا جیاوازەكانی لاشە بەكاردێنێت بۆ ڕێكخستنی كاروباری ژیانی خۆی و مسۆگەركردنی مانەوەی لە ڕێی گواستنەوەی بۆ نەوەكانی دوای خۆی.

سەرەڕای هەڵەیی ئەم چەمكە لە ڕوی بایۆلۆجییەوە[1]، دۆكنز ئێمە دەخاتە ڕیزی گیانەوەرانی دی[2] و هەموو تایبەتمەندیی و جیاوازییەكان لەبەر مرۆڤ دادەماڵێت. كە پێی لە زیندەوەرەكانی دی جیادەكرێتەوە و دەیكاتە بوونەوەرێكی جیاواز.

هەروەها دۆكنز سوورە لەسەر ئەوەی كە ڕەفتارە مرۆڤییەكانی ئێمە دەرەنجامێكی ڕاستەوخۆی یەك جین یان چەند كەمە جینێكە، كە پێی لە ئاژەڵ جیادەكرێینەوە و بەشێوەیەكی حەتمی ڕەفتارەكانمان دیاریدەكات، سەرەڕای ئەوەی كە سەلمێنراوە كە ئاڕاستە ڕەفتارییەكانی زیندەوەر بەگشتی دەرەنجامی ژمارەیەكی زۆری جینە، نەوەك تاكە جینێك یان چەند جینێكی كەم.

هەروەها دۆكنز لەسەر ئەوەش سوورە كە هەوڵدانمان بۆ ئەوەی سیفەتی باش بۆ منداڵەكانمان جێبێڵین، هیچ سوودێكی نییە؛ چونكە ئێمە بە خۆپەرست لەدایك بووین و تەنیا هەوڵ بۆ مانەوەی خۆمان و جینی خۆمان دەدەین. ئایا جینە خۆپەرستەكان دەتوانن ڕێنماییمان بكەن تا ڕەفتارێك بگرینەبەر كە خۆنەویستی و نكۆڵیكردن لە خوود باڵی بەسەردا كێشابێت!!

لێرەوە هەست بە هەڵەی دۆكنز دەكەین (لە ڕووی بایۆلۆجی و پەروەردەیی) و خراپ سوود وەرگرتنی لە بیردۆزی پەرسەندن.

---

(١) ئەگەر دەستەواژەی جینی خۆپەرست ڕاست بێت (كە جین زیندەوەری بنچینەییە و، ئامانجی مانەوەیەتی بە زیندوویی) ئەوا زیاد بوونی یەك ڕەگەزی باشترە؛ بەو پێیەی كە پارێزگاری لە جینەكان دەكات بەبێ گۆڕان و بەبێ دەستكاری. لەگەڵ ئەوەشدا زیاد بوونی دوو ڕەگەزی (نێر و مێ)گەشەی كردووە، وەك هەنگاوێكی پەرەسەندن بەرەو باشتر؛سەرەڕای ئەوەی كە دەبێتە هۆی گۆڕانی ڕیشەیی لە جینە بنچینەییەكاندا: چونكە هەر جینێك دابەش دەبێت بۆ دوو بەش و، نیو جینی تری لە ڕەگەزی دیكەوە بۆ زیاد دەبێت.

(٢) یەكەمین كەس كە ئەو ڕایەی پەیڕەو كرد (دیسمۆند مۆریس Desmond Moris) بوو لە هەردوو كتێبەكەیدا (مەیموونە ڕووتەكە The naked ape) و (باخچەی ئاژەڵیی مرۆڤ The Human Zoo).

ڕووبەڕووبوونەوەی هەڵوێستی بێباوەڕان لە بیردۆزی پەرەسەندن، زۆر بە هەڵە حاڵیبوونی بیردۆزەکەیان بۆ دەرخستم و، ئەو پەردەیەیان لەسەر لادا کە وەك بەڵگەیەکی بێباوەڕی بەکاریهێنرێت و، ڕێگای ئەوەی بۆمن خۆش کرد کە ڕێگاکەم ڕاست بکەمەوە و، وردە وردە باوەڕ بە ڕۆڵی بەدیهێنەرێکی زیرەك[1] بکەم کە ئەو پەرەسەندنەی ئەنجامداوە.

## هـ- پاشان ئاڕاستەکەم گۆڕی :

پاشان ساتە وەختە یەکلاکەرەوەکە هات و، لە گرنگترین دیبەیتە ئاشکراکانمدا (کە لە زانکۆی نیویۆرك لە ساڵی ٢٠٠٤) هەمووانم تووشی سەرسامی کرد، ئەوەم ئاشکرا کرد کە من ئێستا قەبووڵی بیرۆکەی (بوونی خودا) دەکەم! ڕوونم کردەوە کە ئەوەی زانستی سەردەم سەلماندوویەتی لەو ئاڵۆزییە سەرسوڕهێنەرەی کە لە دروستکردنی گەردووندا هەیە، پێویستە بەدیهێنەرێکی زیرەکی هەبێت.

هەروەها توێژینەوە نوێیەکان لەسەر بنچینەی ژیان و، ئەوەی لە بناغەی زیندە ئاڵۆزی DNA[2] دۆزراوەتەوە، بوونی بەدیهێنەرێکی زیرەك بە پێویست و حەتمی دەزانێت.

تۆڕی میدیایی ئەسۆشێتد پرێس ئەو هەواڵەی بە هەموو جیهاندا بڵاوکردەوە لەگەڵ نووسینێکی جوان و ڕاستگۆیانە:

بێگومان گەورەترین و سەرنجڕاکێشترین دۆزینەوەی زانستی سەردەم ئاشکراکردنی ئەوەیە کە خودایەك هەیە.

.Of all the graet discoveries of modern science، the greatest was God

---

(١) د. مستەفا مەحموود ئەم دەستەواژەیە بەوە وەسف دەکات کە یەك پیت کێشەکە چارەسەر دەکات، دەڵێ پەرەپێسەندن (تطویر)ە کە خودا ئەنجامی دەدات، نەك پەرەسەندن (تطور) کە لەخۆیەوە ڕوویدابێت.

(٢) سەیری باسی هەشتەم بکە، بۆ تێگەیشتن لە بنچینە و شێوازی DNA.

## بەڵگەی مەیموونەکە

یاسا فەلسەفییەکە دەڵێت: بەڵگەی فەلسەفی بە تەواو دادەنرێت ئەگەر بەڵگەی ڕاستی بۆچوونەکە و هەڵەیی بۆچوونی بەرامبەری تێدا کۆببووبووەوە. بۆیە هەڵوەشاندنەوەی ئەوەی بە (بەڵگەی مەیموونەکە) ناوی دەبەن لەلایەن زانا (جیراڵد شرۆیدەر[1] (Gerald Schroeder) لە کتێبەکەیدا (زانستی خودا Science of God) زۆر سەرنجی ڕاکێشام.

ئەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە ئەگەری درووستبوونی ژیان بەهۆی ڕێکەوتەوە بە کۆمەڵێك مەیموون دەچوێنن، کە بەردەوام لە کیبۆردی کۆمپیوتەر بدەن و، دەڵێن کە دەکرێ لە یەکێك لە هەوڵە بەردەوامەکان، بتوانن بە ڕێکەوت هۆنراوەی Sonnetی شکسپیر بنووسن.

شرۆیدەر بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەیەك کە لە ئەنجوومەنی گەلانی بەریتانی بۆ هونەر ئەنجامیدا ئەو بۆچوونەی هەڵوەشاندەوە، کاتێك لێکۆڵەرەکان شەش مەیموونیان بۆ ماوەی مانگێك خستە ناو قەفەسێکەوە و کیبۆردیشیان بۆ دانان، کە پێشتر ڕایان هێنابوون چۆن لە کلیلەکانی کیبۆردەکە بدەن.

ئەنجامەکە (٥٠) لاپەڕەی نووسراوبوو، بەبێ ئەوەی تاکە وشەیەکی ڕاستی تێدابێت، تەنانەت ئەگەر وشەکە یەك پیتیش بێت، بۆ نموونە A (کە بۆ ئەوەی بە وشەی دابنێین پێویستە مەودا (سپەیس) لە پێش و پاشیدا هەبێت).

جا ئەگەر کیبۆرد لە سی کلیل پێکبێت (٢٦ پیت + ٤ هێما)، ئەوا ئەگەری ئەوەی بە ڕێکەوت وشەیەکی یەك پیتیمان دەستبکەوێت، لە هەر هەوڵێکدا بریتییە لە ١/٣٠×٣٠×٣٠ واتا ١/٢٧٠٠٠.

---

(١) جیراڵد شرۆیدەر Gerald Schroeder: دکتۆرای لە فیزیای ئەتۆمی و گەردوون MIT لە ویلایەتە یەکگرتووەکان وەرگرت لە ساڵی ١٩٦٠. یەکێك لە ناوە دیارەکان کە قسەیان لێوەردەگیرێت لە بواری (بەدیهێنراوی زیرەك) و سێ کتێبی بەناوبانگی لەسەر ئەو بابەتە هەیە، ئەوانیش:

- Genesis of Big bang 1990
- science of God 1997
- hidden face of God 2002

دوای ئەوەی شرۆیدەر ئەو ئەگەرانەی لەسەر هۆنراوەی (سۆناتای)ی شکسپیر جێبەجێکرد، ئەنجامەکانی بەم شێوەیە بوو:

هۆنراوەی شکسپیر (سۆناتام) هەڵبژارد کە بە دێڕی Shall I compere thee to a summer's day دەستپێدەکات، پیتەکانم ژماردن لە ٤٨٨ پیت پێکدێت. ئەگەری ئەوەی بە لێدانی هەڕەمەکیی لە تەختە کلیلی کۆمپیوتەر ئەم هۆنراوەیەمان دەستبکەوێت بریتییە لە یەك دابەش ٢٦ جارانی خۆی ٤٨٨ جار، واتە $٢٦^{-٤٨٨}$ یەکسانە بە $١٠^{-٦٩٠}$. کاتێك زانایان تەنۆلکەکانی گەردوونیان ژمارد (ئەلیکترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆن) بینیان $١٠^{٨٠}$ واتە یەك و لەلای ڕاستی ٨٠ سفر هەبێت. واتە تەنۆلکەی وا بوونی نییە کە بەشی ئەو هەوڵانە بکات و پێویستیمان بە تەنۆلکەی زیاترە بە ئەندازەی $١٠^{٦٠٠}$.

ئەگەر هەموو ماددەی گەردوون بگۆڕین بۆ پارچەکانی کۆمپیوتەر Computer chips کە هەر یەکێکیان بەشێك لە ملیۆنی گرامێك بێت و وادابنێین هەر پارچەیەك لە جیاتی مەیموون هەوڵەکان ئەنجام بدات، بە خێرایی ملیۆن هەوڵ لە چرکەیەکدا، دەبینین کە ژمارەی ئەو هەوڵانەی لە سەرەتای درووستبوونی گەردوونەوە ئەنجامدراون.$١٠^{٩٠}$ هەوڵە. واتە پێویستیت بە گەردوونێکی تر هەیە بە ئەندازەی $١٠^{٦٠٠}$ یان تەمەنێکی درێژتری گەردوون بە هەمان ئەندازە!

بە دڵنیاییەوە هۆنراوەی سۆناتامان بە ڕێکەوت دەست ناکەوێت، تەنانەت ئەگەر نووسەرەکە کۆمپیوتەریش بێت، چ جای مەیموون!

ڕێکەوت یاسایەکی هەیە، پسپۆڕان ڕێگایان بەوە نەداوە هەرکەسە و لەلای خۆیەوە هەرچی ویستی بیداتە پاڵ ڕێکەوت و هەوڵ بدات نەفامی و بێ بنەمایی بەڵگەکانی خۆی پێ داپۆشێت. پسپۆڕان (ئەندازەی ئەگەری پێویست و مولزم Propability Bound universal)یان دیاریکردووە، کە لە دوای ئەوە ئەگەری پەیدابوونی شتێك بە ڕێکەوت مەحاڵ دەکات. ئەو ئەگەرەش دەگاتە ١ : $١٠^{١٥٠}$، ئایا دەکرێ شتێك بە ڕێکەوت ڕوویدات لە کاتێکدا ئەگەرەکەی دەگاتە ١ : $١٠^{٦٩٠}$؟

بە شرۆیدەرم گوت، کە ئەو لێکدانەوەیەی لەسەر (بەڵگەی مەیموونەکە) بۆی دەرخستم کە جگە لە زبڵ و زاڵێکی کەڵەکەبوو هیچی تر نییە، ئەمە سەرەڕای بوێری ئەوانەی کە ئەو بەڵگەیە دەخەنەڕوو و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە مەیموونەکان دەتوانن ڕۆمانێکی تەواوی شکسپیر وەك هامێڵت یان هەموو بەرهەمەکانی شکسپیر بنووسن.

جا ئەگەر ئەم بۆچوونە دەستەوەستان بێت لە سەلماندنی ئەگەری نووسینی هۆنراوەی سۆناتا بە ڕێکەوت، ئایا سەرکەوتوو دەبێت لە لێکدانەوەی دروستبوونی ژیان بە ڕێکەوت لە ماددەی نازیندووەوە؟!

بەم خستنەڕووەی شرۆیدەر ئەو بەڵگە عەقڵییەی بێباوەڕەکان پشتی پێدەبەستن بەتەواوی داڕما. جا ئەگەر هێزی بەڵگەی ئاڵۆزی گەورەی دروستکردنی گەردوون و DNA بخەینە پاڵ بەڵگەکانی شرۆیدەر، ئەوا بەڵگە فەلسەفییەکەمان (بەڵگە لەسەر ڕاستی بۆچوونەکەمان و هەڵەیی بۆچوونی بەرامبەر) تەواو دەبێت، لەسەر بوونی خودایەکی دانای بەتوانا.




# دۆزینەوەی خودا

## باسی چوارەم: زانست و دانایی

**ئەنتۆنی فلو هەڵوێستە ئیمانییەکەی بەم چیرۆکە ڕەمزییە دەستپێدەکات:**

وادابنێ، کە کۆمەڵێك پیاوی هۆزە سەرەتاییەکان، لە کەناری دوورگە دابڕاوەکەیاندا مۆبایلێکیان دۆزییەوە کە بەپێی مانگی دەستکرد کاردەکات، پیاوەکان دەستیانکرد بە داگرتنی دوگمەکان بەشێوەیەکی هەڕەمەکیی، هەرجارە و گوێیان لە دەنگەدەنگێکی جیاواز دەبو، لێکدانەوەی یەکەمیان ئەوە دەبێت کە ئەو دەنگە لە مۆبایلەکە دێت.

دوای هەوڵدانێکی زۆر و یەك لەدوای یەك، هەندێکیان (زانایانی هۆزەکە) تێبینی ئەوەیان کرد کە بەهەمان ڕیزبەندی دوگمەکان دابگرن ئەوا هەمان دەنگیان گوێ لێدەبێت، بۆیە گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو شتەی لە شوشە و کانزا پێکهاتووە، دەنگێکی هاوشێوەی مرۆڤ دەردەکات و بە پێی ئەو فەرمانانەی پێی دەدەین کاردانەوەی هەیە.

حەکیم و دانای هۆز زاناکانی بانگ کرد بۆ ڕاوێژکردن و، پێی ڕاگەیاندن کە دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر لەو هەواڵانەی پێیان ڕاگەیاندووە، گەیشتۆتە

ئەو دەرەنجامەی کە ئەو دەنگە دەنگەی لە ڕێی ئەو شتەوە گوێیان لێدەبێت، دەنگی مرۆڤانێکی وەك ئەوانە، کە لە شوێنێکی دوور دەژین و بە زمانی جیاواز قسە دەکەن و، ئەو شتە هەڵدەستێت بە کاری پەیوەندی لەگەڵ ئەو مرۆڤانە، داناکە داوای لە زاناکان کرد کە هەموو هەوڵی خۆیان بخەنەگەڕ بۆ دۆزینەوە و تێگەیشتنێکی باشتر بۆ ژیانی دەوروبەریان.

زانایانی هۆزەکە دایان لە قاقای پێکەنین و گاڵتەکردن بەو دەرەنجامەی داناکە پێی گەیشتبو و پێیان گوت: بڕوانە، کاتێك ئەو شتە دەشکێنین دەنگەکە ون دەبێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو پێکهاتەیەی لە شووشە و کانزا و ڕەنگەکان پێکهاتووە، کە ئەو دەنگە دەردەکات و هیچ شتێکی تر نییە. بۆیە بە بەرد کەوتنە سەر مۆبایلەکە و شکاندیان.

ئەم چیرۆکە ڕەمزییە دڵنیامان دەکاتەوە کە تێگەیشتنی پێشوومان ئاڕاستەمان دەکات بۆ لێکدانەوەی دیاردە و بەڵگەکان. بەڵام ڕاستەکە ئەوەیە ڕێگا بدەین بەڵگە نوێیەکان تێگەیشتن و بۆچوونەکانمان دووبارە دابڕێژنەوە چونکە ئەگەر دەست بە تێگەیشتنە کۆنەکانمانەوە بگرین زۆربەی کات ڕێگریمان لێدەکات کە بەڕووی جیهاندا بکرێینەوە و باشتر تێی بگەین[1].

هەروەها چیرۆکەکە ئەوەش دەردەخات کە حەقیقەت چەند ئاستێکی زانستی هەیە، تێگەیشتنی خەڵکی گشتی و تێگەیشتنی زانایان و تێگەیشتنی دانایان هەیە. دەرك کردنیشمان بەو حەقیقەتە لەسەر ئەوە وەستاوە کە چۆن دەتوانین هزرمان ئازاد بکەین و بەبێ هیچ کۆت و بەندێك و بڕیاری پێشوەخت لە پێشەکی و سەلمێنراوە هەڵەکان، تا جارێکی تر بیر بکەینەوە. ئا ئەمە هەمان ئەو بەربەستە عەقڵییە بوو کە تووشی هاوڕێ بێباوەڕەکانم بوو، کاتێك باوەڕبوونم بە بوونی خودا ڕاگەیاند، بە پشت بەستن بە دەرەنجامە ڕاستەقینەکانی زانستی

---

(١) ئەم ڕێگرە عەقڵییە ئەوە لێکدەداتەوە: کە بۆچی سیستەمی کۆمەڵەی خۆر کە کۆپەرنیکۆس پێی گەیشت و کە خۆر دەکاتە چەقی گەردوون و هەسارەکانی تر بەدەوریدا دەخولێنەوە - لەوانە هەسارەی زەوی - ئەو دژایەتییەی کرا لەلایەن باوەڕداران بە سیستەمی پەتلیمۆسی کۆن، کە زەوی دەکاتە چەقی گەردوون و هەسارە و ئەستێرەکانی دی بە دەوریدا دەخولێنەوە.

سەردەم. ئیتر دەستیانکرد بە گوتنەوەی چەند دروشمێکی (خاڵی لە لۆژیك و بەڵگەی زانستی و فەلسەفی) و لە دۆخێکی هبستیریدا درووشمی وایان بەرز کردەوە کە لە ئاستێکی نزمی بیرکردنەوە هێشتیەوە، لەوانە:

- پێویست ناکات بەدوای تەفسیر و لێکدانەوەی درووستبوونی گەردووندا بگەڕێین، تەنیا پێویستە ئەوە قەبووڵ بکەین کە بوونی هەیە.

- ئەگەر قورس بێت بیرۆکەی بوونی بەدیهێنەرێك بۆ گەردوون قەبوڵ بکەین، ئەوا چاکترە کە بیرۆکەی بەدیهێنەری ژیانیش ڕەتبکەینەوە. ئەو کاتەش هیچ ڕێگایەکی ترمان لە بەردەمدا نییە، تەنیا ئەوە نەبێت کە ژیان لە خۆیەوە و بە ڕێکەوت لە ماددەی نازیندوو درووستبووە.

لە بەرامبەر ئەو پڕوپاگەندانە، پرسیارێکی گرنگ لە بێباوەڕان دەکەم:

چاوەڕێی چ جۆرە چۆنیەتییەکی عەقڵی یان زانستی دەکەن، تا قەبووڵ بکەن کە چاو بەو بۆچوونەتاندا بخشێننەوە کە ڕەتی دەکەنەوە لەپشت بوونەوە عەقڵێکی زیرەك هەبێت؟!

## گەڕانەوەی هۆش :

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بیروباوەڕەکەم دەربارەی خودای بەدیهێنەر بخەمەڕوو و، بەڵگەکانم لەسەر ئەوە بخەمەڕوو:

من ئێستا باوەڕێکی تەواوم بەوە هەیە کە گەردوون لە ڕێی بەدیهێنەرێکی زیرەکەوە هاتۆتە بوون و، ئەو یاسا گونجاو و نەگۆڕانەی لە گەردووندا هەن ئەو ڕاستییە دەردەخەن.

هەروەك چۆن باوەڕیشم بەوە هەیە کە درووستبوونی ژیان و ئەو فرەڕەنگییە مەزنەی زیندەوەران، تەنیا لە سەرچاوەیەکی ئاسمانییەوە سەرچاوەیان گرتووە.

بۆچی ئەم بیروباوەڕەم پەسەند کرد، دوای ئەوەی بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدە بێباوەڕ بووم؟

**لە ڕاستیدا زانستی سەردەم، پێنج ڕەهەندمان بۆ دەردەخات، کە بەڵگەن لەسەر بوونی خودایەکی بەدیهێنەر:**

**یەکەم:** گەردوون سەرەتایەکی هەیە و، لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون.

**دووەم:** سرووشت لەسەر یاسا و ڕێسای نەگۆڕ و پەیوەندیدار دەڕوات.

**سێیەم:** درووستبوونی ژیان بەو هەموو وردی و ئامانجدارییە[1]ی تێیدایە، لە ماددەیەکی نازیندووەوە.

**چوارەم:** گەردوون، بە هەموو ئەو بوونەوەر و یاسایانەی تێیدا هەن، بارودۆخێکی نموونەیی بۆ دەرکەوتن و گوزەرانی مرۆڤ دەڕەخسێنێت، کە پێی دەگوترێ (بنەمای مرۆیی Anthropic Principle).

**پێنجەم:** توانای بەرزی عەقڵی مرۆڤ، ناکرێ بەرهەمی ڕاستەوخۆی کرداری کارۆکیمیایی مێشك بێت.

بە تەنیا دەرەنجامەکانی زانستی سەردەم نەبوو کە پاڵنەری گۆڕینی بیروباوەڕەکەم بێت، بەڵکو دووبارە چاوم خشاندەوە بە بەڵگەکانی فەلسەفەی کلاسیکی، کە پێشتر بەرەو بێباوەڕی بردبووم، دواتر هەمان یاسای سوقراتم بەکارهێنا، کە بە درێژایی ژیانی فەلسەفیم لەسەری ژیاوم:

((پێویستە دوای بەڵگە بکەوین، جا بۆ هەر کوێمان ببات))، ئیتر ئەم جارە بەڵگە، بەرەو ئیمان و باوەڕی بردم.

بیرکردنەوە وەك فەیلەسوفێك: ئایا من فەیلەسووفم یان زانا؟

لەوانەیە بپرسی، باشە چۆن تۆ کە فەیلەسووفی، خۆت دەخەیە ناو ئەو پرسە زانستیانەوە؟

بە پرسیارێك وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەمەوە: ئایا ئەوەی بۆ ئێوە لەو تەوەرانەدا خستمەڕوو، زانستە یان فەلسەفە؟

---

(١) مەبەست لە ئامانجداری ئەوەیە: کە ژیان واتا و ئامانجێکی هەیە، کە سنووری جوڵەی ماددی ڕاستەوخۆ دەبەزێنێت. لە بەشی دووەم، باسی دووەم ئەم بابەتە بە درێژی دەتوێژینەوە.

کاتێك دێین لە بنچینەی گەردیلە دەکۆڵینەوە، کە تەنی وردی خوار گەردیلەن (ئەلیکترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆن و کوارکات) ئەوا ئێمە دەربارەی زانست قسە دەکەین. بەڵام کاتێك دەپرسین چۆن ئەو تەنۆلکانە لە خۆوە درووستبوون و بۆچی درووست بوون؟ ئەوا ئێمە دەربارەی فەلسەفە قسە دەکەین.

کاتێك لە ساڵی ٢٠٠٤ ئەوەم ڕاگەیاند کە ناکرێ درووستبوونی ژیان بەوە لێکبدرێتەوە کە لە خۆوە و لە ماددەی نازیندوو درووستبووە، ئەو کات دەربارەی کیمیا و فیزیا و بۆماوەیی قسەم نەدەکرد، بەڵکو (وەك فەیلەسووفێك) دەربارەی ئەوە دەمپرسی، کە واتای چییە شتێك زیندوو بێت، هەروەها دەربارەی پەیوەندی ئەوە بە ڕاستییە کیمیایی و فیزیایی و بۆماوەییەکانەوە چییە.

ئینجا کەسی فەیلەسووف ئەو کەسەیە لە ڕاستییە زانستییەکان دەرەنجامی مەعریفی هەڵدێنجێت. لەوانەیە زۆرێك لە بایۆلۆجییەکان دەربارەی ئەو دەرەنجامانە زانیارییان زیاتر نەبێت لە ئایس کرێم فرۆشێك دەربارەی ئەو یاسایانەی حوکم و کاری لە بۆرسە و یاساکانی بازاڕی ئازاد دەکەن.

من ڕێگری لەوە ناکەم کە زانایان بێنە ناو پرسە فەلسەفییەکانەوە، بەڵام پێویستە لەسەریان کە پاشخانێکی فەلسەفی گونجاویان هەبێت. بەهەرحاڵ، وەك ئەنیشتاین دەڵێت زانایان فەیلەسووفی بێهێزن.

لە خۆشبەختییە، کە زانا دیارەکانی سەدەی بیستەم، گەیشتنە دەرەنجامێکی فەلسەفی زانستیی مەزن، کە زۆر لە دیاردە سرووشتییەکانی دەوروبەرمان بۆ لێکدەدەنەوە و بۆمان دەسەلمێنن کە ئەم گەردوونە و ئەو ووردەکارییەی تێیدا هەیە، بە دیزاینەر و بەدیهێنەرێکی زیرەك نەبێت نایەتە بوون.

هەر لەوەڕا، زۆر لە زانا و فەیلەسووفەکانی سەردەمیش گەیشتوونەتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو پێنج ڕەهەندەی پێشتر باسمانکرد، ناچارمان دەکەن کە دان بە بوونی خودایەکی دانای بەتوانا دابنێین.

## کۆتایی ڕێگا :

لەو دەرەنجامەی پێیگەیشتم دەربارەی سیفەتەکانی خودا، هاوڕابووم لەگەڵ خستنەڕووەکەی گەورە فەیلەسووفی ئینگلیزی دیڤید کۆنوای[1] David Conway، لە کتێبەکەیدا (گەڕانەوە بۆ دانایی The Recovery of wisdom)) باسی کردووە. پێکەوەش هاوڕاین لەسەر ئەو سیفەتانەی خودا کە فەیلەسووفی گەورەترین و مامۆستای یەکەم ئەرستۆ پێش ٢٥ سەدە پێیان گەیشتبوو، کە بەم ڕستانەی خوارەوە دیارییان دەکات و دەڵێت:

God has the following attributes: immutability، immateriality، om-mipotence، omniscience، oneness or indivisibility، perfect good-.ness and necessary existence

خودایەکی تاك و تەنیایە
بوونی پێویست و واجبە
نا ماددی - گۆڕانی بەسەردا نایەت
توانای ڕەهای هەیە - زانستی ڕەهای هەیە.
تەواوی چاکەی هەیە[2].

پاشان کۆنوای دەڵێت:

فەلسەفە کارە گرنگەکەی خۆی بەسەرکەوتنێکی گەورە کۆتایی پێهێنا، کاتێك گەیشتە لێکدانەوەی درووستبوونی بوون بە بوونی عەقڵێکی زانستیی ڕەها و توانایەکی ڕەها، کە بریتییە لە خودای بەدیهێنەر، کە گەردوونی درووست کرد تا ئامادەبێت بۆ پێشوازی بوونەوەرێکی عاقڵ و دانا، کە مرۆڤە.

---

(١) دیڤید کۆنوای David Conway: لە ساڵی ١٩٤٧ لەدایك بووە، مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی میدڵ سیکس، بە شارەزایی لە فەلسەفەی کلاسیکی و فەلسەفەی نوێ بەناوبانگە، هەروەها یەکێکە لە گرنگیدەران بە فەلسەفەی ئایینەکان.

(٢) بێگومان ئەو وەسفەی خودا، بە تەواوی لەگەڵ وەسفی ئایینە ئاسمانییە یەکخوا پەرستەکان یەکدە گرتەوە.

پێویستە لێرەدا دان بەوە دابنێم، کە گەیشتنی من - و کۆنوای و ئەرستۆ - بە بوونی خودا و سیفەتەکانی، لە ڕێی عەقڵەوە بوو، بەبێ ئەوەی پێویستی بە دەستێوەردانێکی یاساشکێن هەبێت، وەك وەحی یان موعجیزە[1] (وەك چۆن لە ئایینە ئاسمانییەکاندا ڕوودەدات). لە باسەکانی دواتر ئەو بەڵگە عەقڵیانە دەخەینەڕوو.

گەیشتنم بە بوونی خودا و هەندێك لە سیفەتەکانی، گەشتی عەقڵ بوو، نەك گەشتی باوەڕ.

---

(١) سەرنجی چیرۆکی (حەیی کوڕی یەقزان) بدە، بەشی دووەم، تەوەرەی دەیەم.



## باسی پێنجەم : ئایا شتێك لە هیچ شتێکەوە (لا شیئ) پەیدا دەبێت[١]؟

((گەورە سێ کوچکەی فەلسەفەی یۆنانی (سوقرات - ئەفلاتون - ئەرستۆ) باوەڕیان بە بوونی خودای بەدیهێنەری گەردوون هەبوو، باوەڕەکەشیان بە بەڵگەی عەقڵی بنیاتنابوو، کاتێك ئەرستۆ بەرگری لە کێشەی درووستبوونی گەردوون کرد، کەوتە هەمان ئەو تەڵەیەی زۆربەی فەیلەسووفە کۆن و نوێکان تێیکەوتبوون، کە بریتی بوو لە بێ توانابیان لە بیرکردنەوە لەوەی دەکرێ شتێك لە هیچ شتێکەوە، واتا لە نەبوونەوە پەیدا ببێت.

بۆ ڕزگاربوون لەو تەڵەیە، ئەرستۆ ناچاربوو بڵێت مەوجوودێکی قەدیمی ناپێکهاتوو هەیە (کە ناوی نا هیۆلی Hioly، بە واتای: ئەسڵ و بنچینە)، کە بریتی بووە لە ماددەیەکی خاو، کە خودا بوونی لێ درووستکردووە.

بەمەش قسەکەی وابووە کە دوو مەوجوودی قەدیم هەن(کە سەرەتایەکیان نییە) ئەوانیش خودا و هیولان، کە لەلای دیندارەکان بە هاوبەشی دانان دادەنرێت.

هەروەها کاتێك ئەفلۆتین[٢] (فەیلەسووفی گەورەی ئەسکەندەرییە) بەرپەرچی ئەو پرسەی دایەوە، ڕەتی کردەوە کە قەدیمێکی دی لەگەڵ خودادا هەبێت و،

---

(١) Nothing comes from nothing پارچەیەکە لە گۆرانی جۆلی ئاندرۆز، لە فلیمی دەنگی مۆسیقا.

(٢) ئەفلۆتین Afloutin = ploinus: لە لیکۆ پۆلیس لە دەلتای میسر لە ساڵی ٢٠٥ ز لەدایك بووە، لە ئەسکەندەرییە خوێندوویەتی و پەروەردە بووە، پاشان بۆ خوێندنی فەلسەفەی هیندی چۆتە هیندستان و، دوای گەڕانەوەی چۆتە ڕۆما و لەوێ ژیاوە. فەیلەسووفێکی سۆفی دینداربووە، فەلسەفەکەی لە ئەفلاتون وەرگرتووە، بۆیە ناونراوە فەلسەفەی ئەفلاتونی نوێ، لە کتێبی (تاسوعات)دا باسی کردووە. بە بیردۆزی (هەڵقوڵان) ناوبانگی دەرکرد، کە دەڵێت: بوونەوەرەکان لە خوداوە هەڵدەقوڵێن (ناوی ناوە بنچینەی یەکەم) بەبێ دەستێوەردانی خۆی. فەلسەفەی سۆفیگەری ئیسلامی، بە ئەندازەیەکی زۆر کەوتۆتە ژێر ئەو بیردۆزەوە.

بۆچوونی وابوو کە خودا بوونەوەری لە خوودی خۆیەوە درووستکردووە، کەواتە بوون هەمووی بەشێکە لە خودا، ئەمەیە یەکبوونی بوون (وحدة الوجود) کە زۆربەی دیندارەکان بە توندی ڕەتیدەکەنەوە)).

**گەردوونێکی کۆن، یان گەردوونێك کە سەرەتای هەیە؟**

بێگومان ئەمە یەکێکە لە پرسە سەرەکیەکان کە زانایانی گەردووناسی و فەیلەسووفەکان و پیاوانی ئایینی سەرقاڵ کردووە[1]، بۆیە ئەم بەشەمان بۆ تەرخان کردووە.

لە یاسا بنەڕەتییەکانی ڕێبازی عەقڵانیی لە فەلسەفەدا، ئەوەیە کە لە کاتی لێکدانەوەمان بۆ هەر پرسێك نابێ لە سەرەتادا هیچ هۆکارێکی بۆ بخەینەڕوو، هەروەها نابێ داوای هیچ لێکدانەوەیەکی بۆ بکەین[2].

لەلای فەیلەسووفە بێباوەڕەکان بوونی گەردوون و یاسا سرووشتییەکان کە گەردوون بەڕێوەدەبەن خاڵی سەرەتایە، کە داوای هیچ لێکدانەوەیەکی بۆ ناکەن لە کاتی توێژینەوەی بابەتە پەیوەندیدارەکانی گەردوون.

بەڵام فەیلەسووفە خودا پەرستەکان بوونی خودای بەدیهێنەری گەردوون و یاسا سرووشتییەکان دەکەنە خاڵی سەرەتا کە لێکدانەوەی نییە. بۆیە جیاوازییەکم بەدی نەدەکرد، لە نێوان خستنەڕووی باوەڕداران و خستنەڕووی بێباوەڕان، چونکە هەردووکیان خاڵێکی سەرەتاییان هەبوو کە نەدەکرا داوای لێکدانەوەی بۆ بکرێت.

---

(١) لە کتێبی (گریمانەی بێباوەڕی) ئەنتۆنی فلو دەڵێت کە بوونی کۆن هیچ سەرەتایەکی نییە، ئەمەش بۆ دەرچوون لە تێکەڵکردن و ئاسوودەبوونی مێشك. بەڵام لە کتێبی (خودایەك هەیە)، فلو بۆچوونەکەی گۆڕیوە.

(٢) بۆ نموونە ئەگەر (هۆکاری گۆڕانی ڕەنگی بۆیاغی پۆتاگاز لە سپیەتییەوە بۆشیری) بخەینەڕوو، دەبینین کە ئەمە بەردەوام لەگەڵ پۆتا گازە ڕەنگکراوەکان بە ڕەنگێکی دیاریکراو ڕوودەدات، بەڵام ئەگەر قوڵتر لێی وردبینەوە دەبینین کە ڕەگەزی گۆگرد کە لە بەرهەمە سوتێنەرەکاندا هەیە و پێکهاتەیەك لەگەڵ ماددەیەکی کیمیاییدا درووستدەکات کە لە بۆیاغەکەدا هەیە، ئەو پێکهاتەیەش بەرپرسە لە ڕەنگی شیری، لەگەڵ وردبوونەوەی زیاتر کار دەگاتە ئەوەی کە یاسا تیۆرییەکان کە پێکهاتە کیمیاییەکان هەڵدەسوڕێنن ئەوان بەرپرسیارن؛ ئەو کات تێدەگەین کە ئەمە خاڵی سەرەتایە کە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە هۆکاری گۆڕانی ڕەنگی بۆیاغی پۆتاگاز داوای لێکدانەوەی ناکەین.

**نەخێر. بەڵکو گەردوونێکە سەرەتای هەیە و، لە نەبوونەوە هاتۆتەبوون**

ئەمە بۆچوونی من بوو، بەرلەوەی زانایانی گەردووناسی بیردۆزی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون Big Bang Theory بخەنەڕوو، کە زیاتر لە هەموو بیردۆزەکانی تر دەربارەی درووستبوونی گەردوون پێشوازی لێکراوە.

بیردۆزەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە گەردوون لە ئەنجامی تەقینەوەیەکی گەورە و لە خاڵێکدا کە هەموو یاسا زانراوەکانی فیزیا دەبڕێت درووست بوو، ئەو خاڵەش پێی دەگوترێت (تاك Singularity). بە بەڵگەی زانستی سەلمێنراوە کە گەردوون سەرەتایەکی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ١٣,٧ بلیۆن ساڵ پێش ئێستا.

کارەکە لێرەدا نەوەستا، بەڵکو زانست چەمکێکی تری وردتر و واتادارتری بەکارهێنا، کە بریتییە لەوەی گەردوون لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون. ئەوەتا زانای فیزیایی ئێدوارد تریۆن Edoward Tryon[1] لە ساڵی ١٩٧٣ پێمان دەڵێت: وزەی گەردوون لە سەرەتادا سفر بووە، چونکە هێزی کێشکردن کە ڕەگەزەکانی گەردوونی لەخۆ گرتووە لە هاوکێشە فیزیاییەکاندا بە سالب هەژمار دەکرێت؛ بەو پێیەی کە بە ئاڕاستەی پێچەوانە کار لە هێزەکانی تر دەکات، وەك هێزی پاڵنەری ناوەندیی کە ئەلیکترۆنەکان فڕێ دەدات دوور لە ناوك و پاڵ بە هەسارەکانەوە دەنێت دوور لە خۆرەکانیان. بە هەمان شێوە ئەگەر بارگە موجەبەکان بۆ گەردەکانی گەردوون بە بارگە سالبەکان هاوتا بکەین، ئەوا وزەی گەردوون دەبێتە سفر.

بە هەمان شێوە (ستیڤن هۆکینگ) و دامەزرێنەرانی فیزیای چەندیی ئەوە دووپات دەکەنەوە، کە فیزیای نوێ ئاماژە بە درووستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە دەکات.

---

(١) ئێدوارد تریۆن Edoward Tryon: مامۆستای فیزیایە لە زانکۆی هێنتەر لە مانهاتن. پسپۆڕە لە بیردۆزی ڕێژەیی و بیردۆزی چەندیی.

گومان لەوەدا نییە کە فەیلەسووفە بێباوەڕەکان تووشی بێهیوایی بوون، چونکە زانست بەڵگەی لەسەر دوو پرسی گرنگ خستۆتەڕوو:

**یەکەم:** گەردوون سەرەتایەکی هەیە و، تا ئەندازەی بێکۆتا نوقمی قەدیمی نییە (ئەزەلی نییە).

**دووەم:** گەردوون لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون.

ئا ئەوەیە کە فەیلەسووفە باوەڕدارەکان بۆ ماوەی سەدان ساڵە لە ڕێگەی عەقڵەوە هەوڵی سەلماندنی دەدەن. کاتێك بۆ یەکەمجار (وەك فەیلەسووفێکی بێباوەڕ) گەیشتمە بیردۆزی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون کە بەرپەرچی بوونی گەردوونی دایەوە، ئەوکات هەستم کرد وا ڕووبەڕووی بیردۆزێکی جیاواز لە بیردۆزەکانی تر دەبمەوە، بیردۆزێك یەکانگیرە لەگەڵ ئەو باسەی لە سفری تەکویندا هاتووە، کە دەڵێت (لە سەرەتادا، خودا ئاسمانەکان و زەوی درووستکرد).

جا ئەگەر کارەکە بەم شێوەیە بێت، ئەوا هیچ ڕێگای ترمان لە بەردەمدا نین جگە لەوەی بەدوای بەدیهێنەری ئەم سەرەتایەدا بگەڕێین.

## فیزیاناسەکان بەدوای دەرچەیەکدا دەگەڕێن

لە سەرەتادا زانایانی گەردوونی ڕەهەندە فەلسەفی و زانستییە گەورەکانی پشت بیردۆزی تەقینەوە گەورەکەیان نەدەزانی کە دۆزیبوویانەوە، هەر کە هەستیان بەوە کرد یەکسەر بەدوای دەروازەیەکی ماددیدا گەڕان بۆ ئەوەی ئەوە لێك بدەنەوە کە ئەو سەرەتایە چۆن بووە.

ستیڤن هۆکینگ[1] لە کتێبی (مێژوویەکی کورتی کات) هەوڵیدا لەو کێشەیە دەربچێت، گوتی: ئەگەر هیچ ڕێگای ترمان نەبێت جگە لەوەی کە گەردوون سەرەتایەکی هەیە، ئەوا کێشە نییە بڵێین گەردوونێکی خۆ تەواوکەر (واتە خۆی

---

(١) بۆ ناسینی زانای فیزیایی گەورە (ستیڤن هۆکینگ) سەرنجی بەشی دووەم باسی یەکەم بدە.

خۆی هێناوەتە بوون). چەند وتەیەکی ئەدەبی جوانە! بەڵام چەند دوورە لە بەڵگەی زانستی و فەلسەفی!

هەروەها وەك هەوڵێکی بێهیوا، زانای فیزیایی ئێدوارد تریۆن ئەوەی ڕاگەیاند کە دەکرێ بە سادەیی سەرەتای دروستبوونی گەردوون بە یەکێك لەو شتانە دابنرێت کە دەکرێ لەخۆوە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر ڕوویدات! ئایا ئەمە دواهەمین شت دەبێت لە گیرفانی زانا بێباوەڕەکاندا؟

لە کۆتاییدا، هۆکینگ هیچ ڕێگایەکی بەدەستەوە نەماوە دانی بەوە دانا کە لە ڕووی فیزیاییەوە مەحاڵە بزانرێ کە تەقینەوە گەورەکە چۆن دەستیپێکردووە.

هەروەها لایەنگرانی فیزیای چەندیی[1] ئەوەیان ڕەتکردەوە کە دروستبوونی گەردوون لەخۆوە بووبێت.

لەڕاستیدا سەلماندنی ئەوەی کە وزەی گەردوون لە کاتی دروستبوونیدا و (تا ئێستاش) سفر بووبێت، ئەوە ناگەیەنێت کە پێویستی بە بەدیهێنەر نەبووبێت. چۆن وزەیەك کە ئەندازەکەی سفر بووبێت، ئەم هەموو جوانیی و وردیی و سەرنجڕاکێشییە بە دەوروبەرمان دەبەخشێت؟!

## فەیلەسووفەکانیش دەخلیسکێن!

فەیلەسوفە بێباوەڕەکان بەوە ڕازی نەبوون دان بەوە دابنێن کە خودا گەردوونی بەدیهێناوە و، ئەو ڕەتکردنەوەیان لەسەر بنەمای سەلماندن (ئەوەی بە هەستەکانمان هەستی پێناکەین، بوونی نییە) بنیات دەنێن. لە پێشەکی کتێبەکەدا ڕێبازی فەلسەفەی مادديگەرایی لۆژیکیمان هەڵوەشاندەوە، کە تەنانەت گفتوگۆ کردنیش لەسەر چەمکی (خودا) ڕەتدەکاتەوە.

لەنێو توندترین ئەو فەیلەسووفانەی دژی گەڕان بوون بەدوای سەرچاوەی دروستبوونی گەردوون دێڤید هیوم بو. بێگومان گەورەترین هەڵەی مەنهەجی

---

(١) بۆ زانینی فیزیای چەندیی و ناسینی زاناکانی، سەرنجی باسی شەشەم بدە.

هیوم بریتی بوو لە ڕەتکردنەوەی پەیوەندی نێوان هۆکار و ئەنجام و هەژمارکردنی پەیوەندی نێوانیان بەوەی کە لە ڕێکەوت دەرناچێت و ئیتر هیچ واتایەك بۆ گەڕان بەدوای هۆکاری درووستبوونی گەردوون یان هۆکاری درووستبوونی هیچ شتێکی تر نامێنێتەوە.

فەیلەسووفە بێباوەڕەکان لە نکۆڵی کردن بەردەوام بوون و دەیانگوت: نەبوون (شتێکی) قەدیمە و سەرەتای نییە و ئەوە ڕەتدەکەنەوە کە بە (نا شتێك - لاشيء) ناوی ببەن!! و پێداگری لەسەر ئەوە دەکەن کە دەکرێ وزە و ماددە لەخۆوە و لەو نەبوونە قەدیمە درووست بووبێت[1]!

## بەڵگەی ماوەی وازلێهێنان

ریچارد سوینبێرن (فەیلەسووفی باوەڕدار) بەرپەرچی بانگەشەکانی بێباوەڕەکانی دایەوە، بە دووبارە خستنەڕووی بەڵگەی (ماوەی وازلێهێنان)[2]. سوینبێرن دەڵێت: ئەگەر نەبوون بۆ ماوەی بێکۆتایی قەدیمی درێژبکرێتەوە و، ئەگەر گەردوون سەرەتایەکی هەبێت، ئەوا بۆچی گەردوون بە دیاریکراوی لەو کاتەدا درووستبوو؟ بۆچی بۆ ماوەیەك بەبێ هێنانەبوون مایەوە، پاشان لە کاتێکی تری کاتی بێکۆتادا گەردوون هاتەبوون؟ پێویستە هۆکارێك هەبێت کە هێنابێتیەبوون Inductive factor or creative factor.

پوختە: خودایەکی قەدیم گەردوونی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون.

فەیلەسووفی گەورە جۆن لێسلی[3] John Lislie پێمان دەڵێت: هەموو چەمکە فیزیاییەکان، چ ئەوانەی ئێستا باون یان ئەوانەی لەکاتی تەقینەوە

---

(١) لەم چەمکەدا فەیلەسووفە بێباوەڕەکان (نەبوون) بە شتێکی ناپێکهاتە وەسف دەکەن، وەك ئەو هیولییەی لەلای ئەرستۆ خودا بوونی لێوە هێناوەتە بوون.

(٢) سوینبێرن پێمان دەڵێت کە بەڵگەی ماوەی وازلێهێنانی لە عیلمی کەلامی موسڵمانان وەرگرتووە.

(٣) جۆن لێسلی John Lislie: مامۆستای فەلسەفە و زانستەکان لە کەنەدا، یەکێکە لە باوەڕداران بە بنەمای مرۆیی، کە وای دەبینێت کە گەردوون بە جۆرێك ئامادەکراوە کە بۆ ژیانی مرۆڤ بشێت. لە بەناوبانگترین کتێبەکانی (عەقڵی ڕەها Infinite mind) یە کە لەساڵی ٢٠٠١ دەرچووە.

گەورەکەی گەردووندا باوبوون، بەهیچ جۆرێك لەگەڵ ئەوە تێکناگیرێن کە بڵێین خودا گەردوونی لە نەبوونەوە هێناوەتەبوون.

لە کۆتاییدا دەگەڕێینەوە بۆلای ستیڤن هۆکینگ، دەبینین بە ناچاری دەڵێت: (ئەگەر هاوکێشەگەلێك بوونیان هەبێت کە ئاماژە بن بۆ دروستبوونی شتێك لە هیچ شتێك، ئەوا بێگومان ئەو هاوکێشانە پێویستیان بە هێزێك هەیە کە توانای کاریان بەبەردا بکات. چونکە هاوکێشەکان بەدیهێنەر نین، بەڵکو کارەکان وەسف دەکەن و دەناسێنن). پاشان (لە دیدارێکدا کە دوای بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی مێژووی کات لە گەڵی ئەنجامدرا) بە ناچاری دەڵێت: (گەیشتنمان بە هاوکێشەگەلێك کە ئەوە ڕوون دەکەنەوە چۆن جیهان دروستبووە، واتای ئەوە ناگەیەنێت کە خودا! بوونی نییە، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێت کە خودا گەردوونی هەڕەمەکی دروستنەکردووە، بەڵکو لەسەر یاسا و ڕێسای جێگیر هێناویەتیە بوون).

## باسی شەشەم : کێ یاساکانی سرووشتی داناوە؟

### بەڵگەی دیزاین = بەڵگە گەردوونییەکە

گومان لەوەدا نییە کە یەکێك لە بەناوبانگترین و بەهێزترین و سادەترین بەڵگە لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر بریتییە لە (بەڵگەی دیزاین Design Argument) یان (بەڵگە گەردوونییەکە Cosmic Argument). کە بە سادەیی واتە: وردیی دروستبوونی گەردوون و ئەو یاساو ڕێکخراوییەی سرووشت لەسەری دەڕوات، بەڵگەیە لەسەر بوونی دیزاینەرێکی زیرەك.

سەرەڕای ئەوەی کە من پێشتر زۆر بە توندی دژی ئەوە بووم کە وردیی دیزاین بەڵگە بێت بۆ بوونی خودا، بەڵام چاوخشاندنەوە بە بەڵگەکەدا و بە شێوازی بەکارهێنانی وەك بەڵگەیەکی فەلسەفی، گەیاندمییە داننان بە بوونی خودایەکی دانای بەدیهێنەر.

بێگومان ئەو زانیارییە زۆرەی زانستی نوێ لە بواری یاساکانی سروشت و دروستبونی گەردووندا و دروستبونی ژیان و جۆراوجۆری زیندەوەرەکان خستوویەتییەڕوو، ئەو بەڵگەیەی بە چەندین بەڵگەی پێشەکییەوە دەوڵەمەندتر کردووە، کە زۆر یارمەتیدەری من بوو بۆ ئەوەی بگەمە ئەو دەرەنجامە.

## بەڵگەی یاساکانی سرووشت

ئەگەر ئێمە یاساکانی سرووشت پێناسە بکەین بەوەی کە بریتییە لە ڕێکخستن و گونجان لە سرووشتدا[١] ئەوا بێگومان بوونی ڕێکخراوی و گونجان (Regularities) گرنگترین ئەو لایەنانەن کە واتا بە یاساکانی سرووشت دەدەن و دەیکەنە بەڵگە لەسەر بوونی دیزاینەرێکی زیرەك.

بەڵام ئەوەی زیاتر بەڵگەیە ئەوەیە کە ئەو یاسایانە هەموو بوونەوەرەکان دەگرنەوە (Universal)ن و، بەیەکەوە پەیوەندیدارن (Tied together) و دەکرێ بە دەستەواژەی بیرکاری ورد گوزارشتیان لێبکرێت (Math ematicaly precise).

لێرەدا پرسیارە تەوەرەییەکە ئەوەیە: چۆن سرووشت لەسەر ئەو یاسایانە و بەو شێوەیە درووستکراوە؟ زۆربەی زاناکانی فیزیا وەڵامێکیان بۆ ئەم پرسیارە نەدۆزیوەتەوە، تەنیا داننان نەبێ بەبوونی خودایەکی دانای بە توانا.

ئەم دەرەنجامە بەدیهییە تەنیا زانا کلاسیکییەکانی وەك ئیسحاق نیوتن[٢] و، جێمس ماکسوێل[٣] باسیان نەکردووە، بەڵکو زۆر لە سەرانی فیزیای نوێش

---

(١) چەند نموونەیەك لەسەر یاساکانی سرووشت:

- یاسای پاراستنی وزە Law of conservation of Energy: قەبارەی وزەی سیستەمێکی داخراو هەر بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە.

- یاسای یەکەمی جووڵەی نیوتن Newton's first law of motion: تەنی جێگیر هەر بە جێگیری دەمێنێتەوە و، تەنی جووڵاو هەر بە جووڵاوی دەمێنێتەوە ئەگەر هێزێکی دەرەکی کاری تێنەکات.

(٢) ئیسحاق نیوتن Isaac Newton: لە ئینگلتەرا لەدایك بووە و ژیاوە (١٦٤٢ - ١٧٢٧) یەکێکە لە کاریگەرترین کەسایەتییەکانی مێژووی مرۆڤایەتی. زۆر بەهرەی هەبوون - ئەو فیزیایی - بیرکاریی - کیمیایی - گەردوونناس - فەیلەسوف بوو، بە دامەزرێنەری فیزیای میکانیکی کلاسیکی دادەنرێت، ئەو سێ یاساکەی جوڵەی داهێنا و، یاسای هێزی کێشکردنی دۆزیەوە. هەروەك چۆن وەسفێکی گەردوونی کرد کە بۆماوەی سێ سەدە باو بوو، کە تا ئێستاش هەر باوە، سەرەرای ئەو گۆڕانکارییانەی بیردۆزی ڕێژەیی و فیزیای کوانتەم تێیاندا ئەنجامداوە.

(٣) جێمس ماکسوێل James Maxwell: زانایەکی فیزیا و بیرکاری سکۆتلەندییە (١٨٢١-١٨٧٩)، خاوەنی بیردۆزی کارۆموگناتیسییە. بەشداری و گرنگی لە زانستی فیزیادا وەکو بەشداری و گرنگی ئیسحاق نیوتن و ئەنیشتاینە.

بۆچوونیان وایە کە یاساکانی سرووشت بیرۆکەی خودای بەدیهێنەرن.

## ئەلبێرت ئەنیشتاین [1]

---

(١) ئەلبێرت ئەنیشتاین Albert Ainstein: خاوەنی بیردۆزی ڕێژەیی، لە ئەڵمانیا لەدایك بووە لەساڵی ١٨٧٩ و لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا لەساڵی ١٩٥٥ کۆچی دوایی کردووە، ناوی هاو واتای وشەی بلیمەتی دەکرێت.

لە ساڵی ١٩٠٥ ئەنیشتاین وەك فەرمانبەرێکی بچوك لە نووسینگەی تۆماری داهێنراوەکان لە سویسرا کاریدەکرد، هەر لەو ساڵەشدا بیردۆزی یەکەمی دەربارەی ڕێژە (ڕێژەیی تایبەت) بڵاوکردەوە. پاشان گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا تا لە زانکۆکانیدا بە پلەبەندی کار بکات، لەساڵی ١٩١٥ بوو بە بەڕێوەبەری پەیمانگای ئیمپراتۆری فەلەکی و بیردۆزی (ڕێژەیی گشتی) دانا.

لە ساڵی ١٩٣٣ ئەنیشتاین لە دەستی زەبروزەنگی نازییەکان ڕایکرد بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان و ڕەگەزنامەی ئەمریکی پێبەخشرا و لە زانکۆکانی ئەوێ وانەی وتەوە تا کۆچی دوایی کرد.

ئەنیشتاین خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت، لەسەر خاسیەتی دوو لایەنەی ڕووناکی (کاتێك وەك شەپۆل کاتێك وەك تەنۆلکە)، نەك لەسەر بیردۆزی ڕێژەیی خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتبێت.

سەرەڕای قورسی خستنەڕووی بیردۆزی ڕێژەیی بە شێوەیەکی سادە، دەتوانین بڵێین: بەپێی ئەم بیردۆزە پێوەرێکی جێگیرمان نییە کە بتوانین بەهۆیەوە شوێنی شتێك دیاری بکەین و، نە بتوانین ڕووبەری نێوان دوو تەن بە ڕەهایی دیاری بکەین و، نە بتوانین خێرایی جووڵەی تەنێك دیاری بکەین، هەروەك چۆن پێوەرێکی جێگیرمان نییە کە لە ڕێیەوە بتوانین ماوەی کاتی ڕوودانی ڕووداوێك لەسەر ئاستی هەموو گەردوون دیاری بکەین.

واتە شوێن و کات و ڕووبەر و جووڵە و قەبارە، هەموویان ڕێژەیین، واتە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازی هەیە، بەهۆی چەند هۆکارێکەوە، گرنگترینیان: خێرایی و ئاراستەی جوڵەیە، بۆ نموونە: ئەگەر لەناو شەمەندەفەرێکدا دانیشتبی کە بە خێرایی سەد کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا دەڕوات و، تۆپێکی تێنس فڕێ بدەی بە ئاڕاستەی سەرەوە، ئەوا تۆپەکە دێتەوە ناو دەستی خۆت یێنەوەی تۆپەکە بەرەو پێشەوە بجوڵێت. هەروەها ئەگەر پیاوێك لە دەرەوەی شەمەندەفەرەکە سەیرت بکات، ئەو وای دەبینێت کە تۆپەکە بە خێرایی شەمەندەفەرەکە بەرەو پێشەوە دەڕوات!

- ئەگەر شەمەندەفەرەکە بە خێرایی هەزار کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا بڕوات و تۆش لە ناویدا دانیشتبی، ئەوا ئەو کاتژمێرەی لە دەستی تۆ دایە کاتێکی هێواشتر لە کاتژمێرەکەی دەستی ئەو کەسەی لە دەرەوەی شەمەندەفەرەکەیە تۆمار دەکات!

- ئەگەر ڕووداوێك لە پێشەوەی شەمەندەفەرەکە و ڕوداوێکیش لە دواوەیدا ڕوویدات، ئەو کەسەی لە ناو شەمەندەفەرەکەدایە وا هەست دەکات لە یەك کاتدا ڕوویانداوە، بەڵام ئەوەی لە دەرەوەیە وا هەستدەکات کە لە دوو کاتی جیاوازدا ڕوویانداوە!

ئەمە بە تەواوی لە فیزیای کلاسیکی جیاوازە (فیزیای نیوتن)، کە وای دەبینێت کە شوێن و کات و ڕووبەر و جووڵە و قەبارە، هەموویان شتی ڕەهان. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە فیزیای نیوتن هەڵە بێت، بەڵکو یاساکانی ڕێژەیی بەسەر خێراییە لە ڕادەبەدەرەکاندا جێبەجێ دەبێت کە لە خێرایی ڕووناکی نزیکن.

دەربارەی ئەو پرسە، دەستپێکێکی باشترمان لە ئەلبێرت ئەنیشتاین دەستناکەوێت بۆ خستنەڕووی چەمکەکانی زانا گەورە نوێکانی فیزیا. ئەنیشتاین دەڵێت: دەمەوێ بزانم خودا چۆن گەردوونی درووستکردووە، دەمەوێ بیرۆکەکانی خودا بزانم، ئەوەی تر تەنیا شتی لاوەکی و تەواوکارین.

ئەنیشتاین زانیاری مرۆیی دەربارەی گەردوون بە منداڵێکی بچووك لەناو کتێبخانەیەکی گەورەدا دەچوێنێت، کە ئەو کتێبخانەیە پڕە لە کتێبی نووسراوە بە زمانە جۆراوجۆرەکان.

منداڵەکە بە دڵنیاییەوە دەزانێت کە نووسەرێك ئەو کتێبانەی نووسیوە، بەڵام نازانێت چۆن، لەو زمانانەش تێناگات کە ئەو کتێبانەی پێ نووسراوە، هەروەك چۆن دەشزانێت کە ئەو کتێبانە بە پێی سیستەمێك ڕێکخراون، بەڵام نازانێت.

ئەنیشتاین بۆچوونی مرۆڤە ژیرەکان دەربارەی خودا بەم نموونەیە دەچوێنێت. ئەو هەموو ڕێکخراوییەی گەردوون دەبینن و دەزانن کە لەسەر یاساگەلێکی بەرزی سرووشتی دەڕوات، بەڵام کەمێك نەبێت لێی تێ ناگەن، بێگومان لەوە تێدەگەن کە هێزێکی شاراوە لە پشت هەموو ئەمانەوە هەیە.

ماکس جامەر Max Jammer یەکێك لە هاوڕێکانی ئەنیشتاین لە کتێبی (ئەنیشتاین و ئاین Einstein and Religion) بیروباوەڕی ئەنیشتاین دەربارەی خودا کورتدەکاتەوە، دەڵێت:

ئەنیشتاین بیرۆکەی خودای بە کەسایەتی کراو (وەك ئەوەی خودا مرۆڤێکی بێ لاشە بێت، ئەگەرچی لە چۆنی و چەندێتی سیفەتەکانی لە سەرووی مرۆڤەوەیە) ڕەتدەکاتەوە، کە هەر ئایینە و بە هی خۆی دەزانێت و بە گەورەی هۆزەکەی خۆی دادەنێت. بەڵکو ئەنیشتاین باوەڕی بە خودایەکی نامادەی هەیە، کە خۆی لە یاساکانی سرووشتدا دەردەخات.

---

ئایا سەرنجی پەلکەزێڕینەت داوە Rainbow؟ ئەو بەرزی و ئەندازە و ڕەنگانەی دوای ڕۆژێکی باراناوی لە ئاسماندا دەیانبینی، جیاوازی هەیە لە سیفەتی ئەو پەلکەزێڕینەیەی هاوڕێکەت لە دووری سەد مەتر دەیبینێت. واتا هەر یەکەمان پەلکەزێڕینەی تایبەتی خۆی هەیە و لەگەڵ جووڵەی دەڕوات، ئەمە بیردۆزی ڕێژەییە!!

هەروەها ئەنیشتاین باوەڕی بەوە هەیە، کە هەر کەسێك لە سرووشت تێبگات خودا دەناسێت، لەبەر ئەوە نا کە سرووشت خودا بێت (وەك سپینۆزای فەیلەسووف)[1] دەڵێت، بەڵکو بەهۆی ئەو یاسایەنەی لە سرووشتدا هەن و بەڵگەن لەسەر بوونی عەقڵێکی بلیمەت لە پشت سرووشتدا و پێویستە عەقڵی مرۆڤ لە بەرامبەر ئەم گەورەیی و داناییەی خودا خۆی بە کەم بزانێت.

کەواتە ئەنیشتاین باوەڕی بە خودایەك هەیە کە زانستی ڕەهای هەیە و، کات و شوێن سنوورداری ناکات. ئەنیشتایین لە نووسینەکانیدا زۆر ناوی لە خودا ناوە: (عەقڵێکی بەرز)، (ڕۆحی بەرزی بێکۆتا)، (عەقڵە بەرزترینەکە).

سەرەڕای ئەوەش زۆر لە شوێنکەوتووانی ئایینە ئاسمانییەکان (جولەکە - دیان - موسڵمان) ئەنیشتاین بە باوکی ڕۆحی بێباوەڕی دەزانن، ئەمەش بەهۆی بەیەکەوە بەستنەوەی خودا و سرووشت. زانای بایۆلۆجی بێباوەڕ ریچارد دۆکنز ڕەواجی بەم بۆچوونەدا و، ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەنیشتایین بەم سیفەتانەی مەبەستی سرووشتە نەك خودا[2].

ئەنیشتایین پێشتر هەردوو هزری بێباوەڕی و یەکبون (وحدة الوجود)[3]ی ڕەتکردبۆوە، تەنانەت لە زۆرێك لە نووسین و وتار و گفتوگۆکانی توڕەیی و بێزاری خۆی ڕاگەیاندبوو، بەرامبەر ئەوەی کە بێباوەڕان بۆ پاڵپشتی کردنی بۆچوونەکانیان ئەو دەدەنە پاڵ بێباوەڕیی.

---

(١) سپینۆزا Spinoza: یەکێکە لە بەناوبانگترین فەیلەسووف و پیاوە لۆژیکییەکانی ئەڵمانیا لە سەدەی حەڤدەهەمدا (١٦٣٢ - ١٦٧٧) بە ڕەخنە و گومانەکانی لەسەر تەورات و ئایین بە گشتی بەناوبانگ بوو، نووسینەکانی بە سەرەتای شەپۆلی گومان و بێباوەڕی دادەنرێن لە سەدەی هەژدەدا.

(٢) لە کتێبی (وەهمی خودا The God Delusion).

(٣) لە باسەکانی پێشوودا هەردوو هزری بێباوەڕی و یەکبوونمان ناساندووە.

## فیزیای چەندیی (کوانتەم)[1] بەرەو خودامان دەبات

ئەنیشتاین تاکە گەورە زانای نوێی فیزیایی نەبوو کە ڕێکخراوی یاساکانی سرووشت و دانایی خودای بەدیهێنەری پێکەوە بەستۆتەوە، ئەوەتا گەورە زانایانی فیزیای چەندیی لەو بۆچوونەدا هاوبەشی دەکەن. لێرەدا تەنیا گرنگی بەخستنەڕووی دید و بۆچوونیان دەدەین چونکە هەندێ کەس بە هەڵە تێدەگەن و وادەزانن کە فیزیای چەندی دەتوانێ درووستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە و بەبێ پێویستی بە خودای بەدیهێنەر لێکبداتەوە، هەروەها دیدی هەریەك لەم زانایانە بەشێکی پەیوەندی نێوان خودا و پرسی خوایەتی دەنوێنێت.

ڤێرنەر هێزنبێرگ[2] Werner Heisenberg خاوەنی (بنەمای ناحەتمی یان گومان Uncertain Principle) دەڵێت: بە درێژایی ژیانم پاڵەپەستۆی ئەوەم لەسەر بوو کە بیر لە پەیوەندی نێوان ئایین و زانست بکەمەوە، هیچ کاتێکیش دەروازەیەکم بۆ هەڵاتن نەدۆزییەوە کە زانست دان بە بوونی خودادا نەنێت.

هەروەها دەڵێت: چی وا لە جووڵەی دەرزی موگناتیسی دەکات بە ئاڕاستەی باکور یان باشور بوەستێت، بە دڵنیاییەوە ئەوە سیستەمێکی سەرسوڕهێنەرە کە هێزێکی دانای بە توانا بەڕێوەی دەبات، هێزێك کە ئەگەر ون ببێت ئەوا کارەساتی زۆر خراپ تووشی ڕەگەزی مرۆڤایەتی دەبێت، کارەساتی زۆر خراپتر لە تەقینەوەی ئەتۆمی و جەنگەکانی لەناوبردنی مرۆڤ.

هەروەها ئێروین شرۆدینگەر[3] Erwin shrodinger دامەزرێنەری زانستی (میکانیکای شەپۆلەکان) دەڵێت: ئەو وێنەیەی زانست بۆ بوونەوەرەکانی دەوروبەرمان دەکێشێت، زۆر کورت بینە. چونکە سەرەڕای ئەو حەقیقەتە زۆرانەی

---

(١) فیزیای چەندیی Quantum Physics: کۆمەڵێك بنەمای هەیە کە کار لەگەڵ سیستەمە فیزیاییە وردەکاندا دەکات، تەنۆلکە و گەردیلە و پڕۆتۆن و نیوترۆن و ئەلیکترۆن و تەنۆلکە بچووکەکانی تری خوار گەردیلە. هەروەها لە شەپۆلەکانی جۆرە جیاوەزەکانی وزەش دەکۆڵێتەوە.

(٢) ڤێرنەر هێزنبێرگ Werner Heisenberg زانایەکی ئەڵمانییە (١٩٠١ - ١٩٧٦)

(٣) ئێروین شرۆدینگەر Erwin shrodinger زانایەکی نەمساوییە (١٨٨٧ - ١٩٦١)

پێشکەشمان دەکات و ئەو یاسایانەمان بۆ دەخاتەڕوو کە بوون بەڕێوەدەبەن، بەڵام زانست بەلاڵ دەوەستێت بەرامبەر ئەو شتانەی لە دڵماندا نزیکن و لە ڕاستیدا زۆر لەلامان گرنگن.

زانست قسەیەکی بۆ هەستکردنمان بە دڵخۆشی و دڵتەنگیی نییە، یان ئەو کاریگەرییانەی ڕەنگەکانی وەك سوور و شین لەسەرمان دادەنێت، بۆچی ئەم دیمەنەمان لەلا جوانە یان شیرینە، چۆن ئەم ڕێکخراویی و گونجانە لێکبدەینەوە، زانست هیچ لەبارەی خێر و شەڕ نازانێت، لە ڕاستیدا ئەم کارانە بە دانان بە خودا نەبێت لێکنادرێنەوە.

شرۆدینگەر هەروەها دەڵێت، هەندێ کات زانا ماددییەکان دەیانەوێ وەڵامی ئەم پرسانە بدەنەوە، بەڵام وەڵامی وا گاڵتەجاڕانە دەدەنەوە کە بەهیچ شێوەیەك ناکرێ بە ڕاستی وەربگیرێن. زۆرجار زانست بەو ڕەنگە سەیر دەکرێت کە بێباوەڕە، ئەم قسەیە جێگای سەرسوڕمان نییە، چونکە ئێمە سیفەتەکانی جوانی و کراوەیی و چاکە و خراپە لەبەر زانست دادەماڵین، جا ئەگەر زانستی ماددی مرۆڤ لە مرۆڤایەتی دابشۆرێت، ئیتر چۆن ئەم جۆرە زانستە دان بە گەورەترین و بەرزترین چەمکدا دەنێت کە عەقڵی مرۆڤ ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

هەرچی (ماکس پلانك[1] Max Plank)ی دامەزرێنەری فیزیای چەندیی)ە دەڵێت: ناتوانین هەڤدژییەکی ڕاستەقینە لە نێوان زانست و ئاییندا بدۆزینەوە، چونکە هەریەکەیان ئەوی دی تەواو دەکات. هەریەکە لە ئایین و زانست لە جەنگێکی بەردەوامدان لەگەڵ پڕوپاگەندە و گومان و خۆسەپاندن و بێباوەڕیدا، بۆ گەیشتن بە ناسینی خودا.

هەروەها پۆل دیراك[2] Paul Dirac (یەکێك لە گەورە دامەزرێنەرانی فیزیای چەندیی) دەڵێت:

---

(١) ماکس پلانك Max Plank زانایەکی ئەڵمانییە (١٨٥٨ - ١٩٤٧)

(٢) پۆل دیراك Paul Dirac زانایەکی ئینگلیزییە (١٩٠٢ - ١٩٨٤)

خودا بەدیهێنەرێکی وردە، بەرزترین ئاستی بیرکاری لە دیزایینی دروستکردنی گەردوون و دانانی یاساکانی بەکارهێناوە.

**لەگەڵ ستیڤن هۆکینگدا :**

دەگەینە گەورە زانای فیزیایی سەردەم (ستیڤن هۆکینگ[١] Stephen Hawking) و لە کۆتایی کتێبەکەیدا (مێژوویەکی کورتی کات Abrief history of time)دا دەڵێت: ئەگەر بگەینە (بیردۆزە جیهانییەکە)[٢] Universal theory ئەوا هەریەکە لە زانایان و فەیلەسووفان، تەنانەت خەڵکی ئاساییش دەگەیەنێتە ئەوەی کە لە هەندێ لایەنەکانی دانایی و حیکمەتی بوونی گەردوون و بوونی ئێمە تێبگات. ئەگەر ئەوەشمان زانی، ئەوەش دەزانین کە خودا چۆن بیردەکاتەوە.

لە شوێنێکی تری کتێبەکەدا دەڵێت: بیردۆزە گشتگیرەکە کۆمەڵێك یاسا و هاوکێشە دەبێت. پرسیارەکە ئەوەیە: کێ هێز و ژیانی بەبەر ئەو هاوکێشە رووتانەدا کردووە تا ئەو گەردوونە ماددییەی لێ پەیدا بێت کە وەسفی دەکات؟ هەروەها هۆکینگ لە یەکێك لە دیدارەکانیدا دەڵێت: هەر چەند زانیاریمان دەربارەی گەردوون و یاسا لۆژیکییەکان کە بەڕێوەی دەبەن زیاتر بێت، زیاتر دەرك بەوە دەکەین کە ڕێکخراویی و گونجانی تێدا هەیە.

---

(١) ستیڤن هۆکینگ Stephen Hawking: زانای فیزیای تیۆری و بیرکاری پراکتیکی بەریتانی، مامۆستای بیرکارییە لە زانکۆی کامبریدج، لە شوێنی ئیسحاق نیوتن. لە ساڵی ١٩٤٢ لەدایك بووە. بە توێژینەوەکانی لە بواری گەردووناسیدا بەناوبانگە بەتایبەت کونە ڕەشەکان. هەوڵی سادەکرنەوەی زانستەکانی داوە بۆ خەڵکی ئاسایی. کتێبەکەی (مێژوویەکی کورتی کات) یەکێکە لە پڕ فرۆشترین کتێبی زانستی بە درێژایی مێژوو، بەو پێیەی هەر ٥٠٠ کەسێك لەسەر ڕوی زەوی کتێبێکی لێ کڕیوە. لە سەرەتای گەنجیدا تووشی نەخۆشی Amyotrophic lateral sclerosis بوو، کە تووشی پەککەوتوویی تەواوی کرد لە ماسولکەکانی مل و سەردا، لە ڕێی دەزگای ئەلیکترۆنییەوە پەیوەندی لەگەڵ دەورووبەریدا هەیە، لە ڕێی جوڵەی چاو و لێوەکانی!!چونکە توانای قسەکردنی لەدەست داوە.

(٢) بیردۆزی جیهانی گشتگیرەکە زاناکان بەدوای یاسا و هاوکێشەی هاوبەشدا دەگەڕێن، کە بتوانێت چوار هێزە سەرەکییەکە لە گەردووندا جێبەجێ بکات: هێزی کارۆموگناتیسی - هێزی کێشکردن - هێزی ئەتۆمی بەهێز - هێزی ئەتۆمی بێهێز.

هەروەها دەڵێت: گومان لەوەدا نییە کە ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان دەربارەی حیکمەت لە بوونی گەردوون پرسیار بکەی لەوانەیە جگە لە ویستی خودا وەڵامێکت دەست نەکەوێت[١].

## لەگەڵ پۆل دێڤیز

پۆل دێڤیز[٢] Paul Davies خەڵاتی تێمپلتۆن[٣] Templeto prizeی لەسەر لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان لۆژیك و گونجانی سرووشت و پرسی خوداییدا وەرگرتووە.

لە وتارەکەیدا بەبۆنەی وەرگرتنی خەڵاتەکەوە، دێڤیز هەموو ئامادەبوانی تووشی شۆك کرد کاتێك ڕایگەیاند کە زانست سنوورێکی تایبەتی پێشکەوتن نابڕێت، مەگەر دان بە چەمکە ئایینییەکاندا بنێت.

هەروەها دەڵێت، سەرەڕای ئەوەی کە بێباوەڕان لە خۆیان ناپرسن کە ئەو یاسایانەی سرووشت لە کوێوە هاتوون، بەڵام هەموویان دان بە ڕێکخراویی ئەو یاسایەنەدا دەنێن، بۆیە دێڤیز بێباوەڕان بە هەڵە دادەنێت لە دوو چەمکدا کە دەستی پێوەدەگرن و بوونەتە بەربەست لەنێوان ئەوان و باوەڕدا:

- **چەمکی یەکەم:** لێکدانەوەیان بۆ ڕێکخراوەیی بناغەی گەردوون، بەوەی کە مادام بەم شێوەیە بینراوە دیارە هەر لەسەر ئەم یاسایانە بووە، ئێمەش بەوە وەڵامیان

---

(١) هۆکینگ لە هەندێ شوێنی تردا ئەوەی ڕاگەیاندووە کە بێباوەڕە و باوەڕی بە بوونی خودا نییە، ئەم هەڤدژییە لەبەرئەوە دەردەکەوێت کاتێك ڕووبەڕووی بەڵگە زۆرەکانی بوونی خودا دەبێتەوە خۆی ناچار دەبینێتەوە کە دان بە حەقیقەتدا بنێت.

(٢) پۆل دێڤیز Paul Davies: زانایەکی بەریتانییە، لە ساڵی ١٩٤٦ لەدایك بووە.
مامۆستای فیزیایە لە زانکۆی ئەریزۆنا، پێشتر لە زانکۆی کامبریدج - لەندەن - نیوکاسڵ مامۆستا بوو.
پسپۆڕی زانستەکانی گەردوون و فیزیای چەندییە. لە ساڵی ١٩٥٥ خەڵاتی تێمپلتۆنی وەرگرت.

(٣) خەڵاتی تێمپلتۆن Templeto prize: خەڵاتێکە دامەزراوەی تێمپلتۆن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٧٣ وە دەیبەخشێت.
ئەو خەڵاتە بۆ ئەو دۆزینەوە و توێژینەوە زانستانەیە کە خزمەتی لایەنەکانی ئایین و ڕۆحانیەت دەکەن، دوای ئەوەی هەستیانکرد خەڵاتی نۆبڵ ئەو لایەنەی پشتگوێ خستووە. نرخەکەی ٦،١ ملیۆن دۆلارە (لە خەڵاتی نۆبڵ بە نرختره کە ٢،١ ملیۆن دۆلارە).

دەدەمینەوە کە ئەگەری ئەوە هەبوو کە بوونێکی نارێکخراوتر و ناگونجاوتر دروست ببێت و بمێنێتەوە، ئەمە نزیکترە لەو بارودۆخە تێکەڵ و پێکەڵەی لە سەرەتای دروستبوونی گەردووندا هەبوو، بۆچی گەردوون لەڕووی دروستبوون و مانەوەدا لەسەر باشترین و ئاڵۆزترین و قورسترین شێوە دەرکەوت؟

- **چەمکی دووەم:** گەمژەییەکی تەواوە، ئەوەی کە ماددیگەراکان دەڵێن کە یاساکانی سرووشت لە دانانی ئێمە خۆمانە و لە ڕاستیدا لە سرووشتدا بوونیان نییە.

من وانازانم هیچ کام لە زانایانی فیزیا پێی وا بێت کە یاساکانی نیوتن (بۆ نموونە) لە دروستکراوی مرۆڤ بێت، بێگومان یاساکانی سرووشت بوونێکی ڕاستەقینەیان هەیە و، ڕۆڵی زانایان لە دۆزینەوە و دارشتنەوەیان دایە، نەك لە داهێنانیان.

**دێڤیز چەند پرسێك دەخاتەڕوو:**

- چۆن یاساکانی سرووشت دروست بوون؟

- بۆچی بە دیاریکراوی ئەم یاسایانە بوون و یاسای تر نەبوون؟

- چۆن ژیانێك کە بەهۆش و عەقڵ و زیرەکی دەڕوات بەڕێوە، لە ماددەی نازیندوو دێتەبوونەوە؟

بەڵگەکانی دێڤیز بە وەڵامە بەهێزەکەی کە عەقڵی بێباوەڕەکان پەکدەخات کۆتایی پێدێنین:

یاساکانی سرووشت لە سەردەمێکی زۆر زووەوە دانراون بۆ ئەوەی دواتر بە ئەرکی خۆیان هەڵبستن لە بوونێکدا کە هێشتا دروست نەبووە[1]، ئای ئەوە چ دیزاین و ئامانجێکی سەرسوڕهێنەرە؟!

---

(١) ئەم چەمکە بە (بنەمای مرۆیی) دەناسرێت. سەرنجی باسی دواتر بدە.

**لەگەڵ زانایانی بیرکاریدا :**

(جۆن بارۆ)[1]ش خەڵاتی تێمپلتۆنی وەرگرت، لەسەر لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی بەڵگەی دیزاین. لە وتارەکەیدا دوای وەرگرتنی خەڵاتەکە، سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشا کە ئەم بوونە و بەو ئاڵۆزییە سەرسوڕهێنەرە بێ وێنەیەی لە بناغە و ڕۆڵدا هەیەتی، شوێنی کەمێك لەو یاسایانە دەکەوێت، کە بتوانرێ بە وردی لە هاوکێشە بیرکارییەکاندا لێکدانەوی بۆ بکرێت و ئەندازەی لاپەڕەیەك داگیر بکات.

هەروەها بارۆ بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە دەڵێن یاساکانی سرووشت لە داهێنراوی خۆمانن بۆ ئەوەی دیاردە سرووشتییەکانی دەوروبەرمانی پێ لێکبدەینەوە، دەڵێت درووستبوونی مرۆڤ و زۆربوونی (کە لە هەموو شتێك زیاتر لامان گرنگە) پێویستی بە گریمانەکردنی بوونی شتی زۆر ئاڵۆز نییە وەك کونەڕەشەکان و.. ئیتر بۆچی زاناکان ئەم چەمکانەیان داهێناوە؟!

هەروەها بارۆ ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە مێژووی زانست پڕە لەو بیردۆزانەی شوێنی بیردۆزەکانی پێشخۆیانیان گرتۆتەوە. سەرەڕای ئەوەی کە بیردۆزی ڕێژەیی پێچەوانەی یاساکانی نیوتن بوو. بەڵام تائێستا و بۆهەزاران ساڵی تریش ئەم بیردۆزە هەر بەکاردێت. ئایا ئەمە بەڵگەنییە لەسەر ئەوەی کە ئەم یاسایانە بە ڕاستەقینە بوونیان هەیە و دید و بۆچوونی ئێمەی مرۆڤ نییە کە هەر کاتێ ویستمان بتوانین بیانگۆڕین؟!

**لەگەڵ زانایانی بایۆلۆجیدا**

دوای ئەم گەشتەمان لەگەڵ زانایانی فیزیا و بیرکاریدا، هەڵوەستەیەك لەلای زانای بایۆلۆجی (چارلس داروین Charles Darwin) دەکەین، خاوەنی بیردۆزی پەرەسەندن کە زۆر بە بێباوەڕی تۆمەتبار دەکرێت، بەڵکو ئەم چەند

---

(١) جۆن بارۆ John Barrow: لە لەندەن لەدایك بووە لە ساڵی ١٩٥٢.
مامۆستای بیرکارییە لە زانکۆی کامبریدج. گرنگی تایبەتی دەدات بە فیزیای تیۆری و فیزیای گەردوون. لە ساڵی ٢٠٠٦ خەڵاتی تێمپلتۆنی وەرگرت.

دێرە بێ تاوانی ئەو بسەلمێنێت و ببێتە بەڵگە لەسەر بێباوەڕان. داروین لە ژیاننامەی تایبەتی خۆیدا دەڵێت:

Reason tells me of the] extreme difficulty or rather impossibil-])) ity of conceiving this immense and wonderful universe, including man with his ca-paibility of looking far into futurity, as the result of blind chance or necessity. When thus reflecting I feel compelled to look to a First Cause having an in-telligent mind in some degree analogous to that of man; and I deserve to be called a Theist))

((زۆر قورسە، بەڵکو مەحاڵە، بیر لە گەردوونێکی گەورە و سەرسوڕهێنەری وەك گەردوونی ئێمە بکەینەوە، کە بوونەوەرێکی تێدا دەژی وەك ئێمەی مرۆڤ کە توانایەکی سەرنجڕاکێشی هەیە، لە ئەنجامی ڕێکەوتی کوێر و هەڕەمەکی درووستبووبێت. بۆیە کاتێك لە دەوروبەرمدا بەدوای هۆکاری یەکەمی دواوەی بووندا دەگەڕێم، ناچار دەبم دان بە بەدیهێنەرێکی زیرەکدا بنێم. ئا لێرەدا من باوەڕم بە بوونی خودا هەیە)).

**فەیلەسووفەکان گەشتی زاناکان تەواو دەکەن خودا بەدیهێنەری یاساکانە :**

پوختەی قسان، جۆن فۆستەر John Foster، کە مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، لە کتێبەکەیدا (خودا بەدیهێنەری یاساکانە The Divine Lawmaker)دا دەڵێت: ئەگەر دان بە بوونی یاساکانی سرووشتدا بنێین، ئەوا ئەم ڕێکخراویی و گونجانە، بە سادەیی و بە جوانترین شێوە بوونی خودایەکی دانای بە توانامان پێدەڵێت.

هەروەها فەیلەسووفی گەورە ریچارد سوینبێرن لەسەر بەڵگەی دیزاین پێمان دەڵێت: ئەگەر بڵێین، هەموو تەنەکان (بە پێی یاسای هێزی کێشکردن) یەکتر کێش بکەن، ئەوا لۆژیکیتر و ئاسانترە کە بڵێین سەرچاوەی هەموو ئەو تەنانە یەك سەرچاوەیە، لە جیاتی ئەوەی گریمانەی ئەوە بکەین کە هەر تەنێك لە

تەنەکان بە ڕێکەوت ئەم هێزەی تێدا درووستبووە و مرۆڤ لەم لەیەکچوونە هەڕەمەکییە یاسایەکی داناوە.

سوینبێرن لەگەڵ جۆن فۆستەر هاوڕایە لەسەر ئەوەی کە باشترین لێکدانەوە بۆ ئەم ڕێکخراوییە بوونی خودایەکی دانای بە توانایە، کە ئایینە ئاسمانییەکان وەسفی دەکەن.

ئەو زانایانەی دان بە بوونی حیکمەتێکی خوداییدا دەنێن لە پشت گەردوون، بەڵگەکان لە پێناو بەرگریکردن لە چەمکێکی فەلسەفی ناخەنەڕوو، بەڵکو گوزارشت لە واقیعێك دەکەن کە زانستی سەردەم خستوویەتییەڕوو بەسەر عەقڵە لۆژیکیی مەندەکانیشی سەپاندووە بە بەڵگەیەکی بەهێزی وا کە جێگای هەڵوەشاندنەوە و پشتگوێ خستن نین.



## باسی حەوتەم : گەردوونێك بۆ پێشوازی لە ئێمە ئامادەكراوە!

بیریكەوە ئەگەر لەگەشتەكەتدا چووی بۆ ئوتێلێك..

كاتێك چوویە ژوورەكەت، بینیت ئەو وێنەیەی لە پشت قەرەوێڵەكە هەڵواسراوە هاوشێوەی هەمان ئەو وێنەیەیە كە چەند ساڵێكە لە پشتەوەی قەرەوێڵەكەی ماڵەوەت هەڵواسراوە. ئەو فەرشەی لەژوورەكە ڕاخراوە، هاوشێوەی فەرشی ژوورەكەتە، هەروەها هەمان گوڵدان و گوڵی لێیە كە تۆ حەزت لێیەتی.

لەسەر مێزی گۆشەی ژوورەكەشدا، بینیت ئەو دیوانە شیعرەی ئارەزووت لێیەتی و تاونا تاوێك ئارەزوو دەكەی بیخوێنیتەوە لەسەر مێزەكەیە، هەروەها ئەو ڕۆژنامەیەش كە ڕاهاتووی ڕۆژانە بیخوێنیتەوە.

لەناو بەفرگرەكەشدا، هەموو ئەو خواردنەوە و شوكولاتەی ئارەزووت لێیە تێیدایە و، ئەو دەفری ئاوەشی كە تۆ لە ماڵەوەدا بەكاری دێنی هەمان دەفری ماڵەكەتە و هەمان ئاوە كانزاییەكەی نیشتیمانەكەتی تێدایە.

كاتێك تەلەفزیۆنەكەت خستە كار، بینیت هەمان ئەو فیلمانەی ئارەزووی دەكەی پەخشی دەكات، هەروەها كەناڵی ناوخۆیی ئوتێلەكەش ئەو پارچە مۆسیقایەی ئارەزووت لێیانە پەخشی دەكات.

لە گەرماوەكەشدا، بینیت دیوارەكانی بە هەمان ڕەنگی گەرماوی ماڵەوەت كە ئارەزووی دەكەی ڕەنگكراوە، هەروەها لەسەر ڕەفەكان هەمان شامپۆ و سابوونی لەسەرە كە ڕاهاتووی بە كاریان بێنی.

هەرچۆنێك چاوبگێڕی هەموو ئەو شتانە دەبینی کە ئارەزووت لێیانە و پێیانەوە ڕاهاتووی. بێگومان ئەگەری ئەوەی کە بە ڕێکەوت ئەمە ڕوویدابێت وردە وردە لەلات کەمدەبێتەوە، تا دڵنیا دەبیەوە کە یەکێك لە بەڕێوەبەرانی ئوتێلەکە وردەکارییەکانی ژیانت و ئارەزووەکانتی زانیوە.

## ئێمە و بوون بە یەکەوە گونجاوین

ئەو ئامادەکارییە چاوەڕواننەکراوانەی لە ئوتێلەکەدا هاتنەپێشت و جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە کەسێك لە ئوتێلەکەدا هەیە تۆ لە نزیکەوە دەناسێت و پێشتر زانیویەتی کە تۆ دێیت بۆ ئوتێلەکە، فەیلەسووفەکان ناوی دەنێن بەڵگەی گونجان Fine tuning argument.

زانای فیزیایی گەورە (فریمان دیسۆن[1] Freeman Dyson) ئەم بەڵگەیە وەسف دەکات و دەڵێت: (هەرچەند گونجانی زیاتر لە وردەکارییەکانی گەردوون و پێداویستییەکانی خۆمان بەدی دەکەم، هەستم زیاتر دەبێت کە گەردوون بۆ پێشوازی لە ئێمە ئامادەکراوە).

ئەو چەمکەی گەردوون وای دەبینێت کە گەردوون بە جۆرێك دروستکراوە کە گونجاو بێت بۆ ژیانی مرۆڤ پێی دەگوترێ (بنەمای مرۆیی The anthropic principle)[2] لێرەدا پرسیارێکی گرنگ خۆی دەخاتەڕوو، ئایا دەکرێ ئەو ڕێکخراوەیی و گونجاوییەی لە نێوان یاسا و بنەما فیزیاییەکاندا هەیە، کە ڕێگایانداوە ژیان لە گەردوون دروست ببێت و بوونەوەرەکان دروست ببن بۆ ڕێکەوت بگێڕینەوە؟ لە ئێستادا هیچ لە زانا فیزیاییە گەورەکان ئەو قسەیە ناکەن، چونکە ئەوان پێیان وایە کە ناکرێ ئەم گونجان و ڕێکخراوییە لەناو یەك گەردووندا Universe لەڕێی ڕێکەوتەوە دروست بوویێت!

---

(١) فریمان دیسۆن Freeman Dyson: لە ئینگلتەرا لەدایك بووە لەساڵی ١٩٢٣. مامۆستای بیرکاری و فیزیایە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. گرنگی دەدات بە ئەندازیاری ئەتۆمی و فیزیای چەندیی. لە ساڵی ٢٠٠٠ خەڵاتی تێمپلتۆنی وەرگرت.

(٢) لە بەشی دووەم، باسی دووەم بە درێژی باسی بنەمای مرۆیی دەکەین.

کەواتە، زانایان چی دەخەنەڕوو؟

زانایان دوو بژاردە دەخەنەڕوو. یان ئەوەتا دان بنێین بە بوونی بەدیهێنەرێکی زیرەکی دانای بە توانا کە هەموو ئەم ڕێکخراوییەی بە ویست و توانای خۆی ڕێکخستووە، یان ئەوەتا بڵێین کە چەند گەردوونێکی جیاواز هەن Multiverses کە سرووشتی جیاوازیان هەبووە و، بە ڕێکەوت لەسەر یەکێك لە گەردوونەکان (گەردوونەکەی ئێمە) بارودۆخی گونجاو بۆ ژیان ڕەخساوە.

## باسی چەند گەردوونیی[١]

یەکێك لە بەناوبانگترین زانایانی گەردوونناسی کە پشتگیری لە بیرۆکەی چەند گەردوونیی دەکات (مارتن ریز[٢] Martin Rees)ە، وەرن با پێکەوە سەرنجی قسەکانی بدەین کە پێی وایە:

بۆ ئەوەی یەکێك لە گەردوونەکان شیاو بێت بۆ ژیان، پێویستە بارودۆخ و یاسا و بنەمای فیزیایی وای تێدابێت کە لە گەردوونی ئێمەدا هەیە.

هەروەها کە هەندێ لەو میکانیزمانە دەخاتەڕوو کە گەردوونناسان بۆ لێکدانەوەی چۆنیەتی دروستبوونی گەردوونە جیاوازەکان دایاندەنێن. یەکێك لەو میکانیزمانە ڕوودانی (تەقینەوە گەردوونییە جۆراو جۆرەکانن Multiple Big Bangs، کە لە هەر یەکێکیان گەردوونێکی جیاواز دروستبوو. هەروەها بیردۆزی کونە ڕەشە جۆراو جۆرەکان کە لە وزەی هەر یەکێکیان گەردوونێکی جیاواز دروست دەبێت.

---

(١) چەمکی چەند گەردوونیی بۆ یەکەمجار وەك چیرۆکێك لە چیرۆکەکانی خەیاڵی زانستی خرایەڕوو بەناوی Star maker لە ساڵی ١٩٧٣. چیرۆکەکە وەك ڕووبارێك سەیری کات دەکات کە کۆمەڵێك بڵقی هەڵگرتبێت، کە هەر یەکێکیان ئاماژە بێت بۆ گەردوونێکی جیاواز، کە لە نەبوونەوە لە شێوەی خاڵێکی وزە دەرکەوتوون. هەریەکە لەم گەردوونانە لە ماددەی جیاواز پێکهاتوون کە ملکەچی یاسای فیزیایی جیاوازن. ماددە و یاسای یەکێك لەم گەردوونانە بە تەواوی بۆ ژیانی ئێمە گونجاو بووە.
لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم زانای بایۆلۆجی F.A.Pantin کەوتە دوای ئەم دیدە خەیاڵییە و، بیردۆزێکی زانستی لێ دروستکرد کە تیایدا ئێمە دەچوێنێ بە دوکانێکی جل و بەرگ کە مۆدێل و قەبارەی جیاوازی تێدایە و، کڕیارەکە (کە ئێمەین) ئەو جلەی هەڵبژارد کە بۆی گونجاو بوو (کە گەردوونی ئێمەیە).

(٢) مارتن ریز Martin Rees: مامۆستای فەلەك و زانای گەردوونناسی بەریتانی، لە ساڵی ١٩٤٢ لەدایك بووە.

هەروەها ریز ئاماژە بۆ ئەوەشدەکات کە لێکدانەوە جیاوازەکان زۆر لەگەڵ یەکدا هەڤدژن و، بۆ سەلماندن و ڕەتکردنەوەمیان پێویستی بەوە هەیە کە بنەمای فیزیایی وامان هەبێت کە ملیۆن جار لەو بنەمایانە بەهێزتر بێت کە دەیانزانین، وەك چڕی زۆر و قەبارەی زێدە گەورە و زێدە بچوك و، گەرمی زۆر و خێرایی خێراتر لە خێرایی ڕووناکی. ئەو بۆچوونی وایە کە تێگەیشتنی زیاتر دەبێتە هۆی لەکارخستنی زۆرێك لەو بژاردانە، تا دەگەینە ئەوەی بڵێین یەك گەردوون هەیە!!

## بیردۆزی چەند گەردوونیی لە تەرازوودا

زۆربەی گەورە زانایانی فیزیا و فەیلەسوفەکان گاڵتە بە بۆچوونی چەند گەردوونیی دەکەن. لێرەدا قسەی یەکێك لە گەورە زانایانی فیزیا و گەورە فەیلەسووفێك دەخەینەڕوو.

زانای فیزیایی (پۆل دیڤیز Paul Devis) دەڵێت:

ئاسانە بڵێین کە ئەگەر ئێمە تەمەنێکی ئەبەدی (بێ سەرەتا)مان داوەتە گەردوونێك لە گەردوونەکان، ئەوا لەو ماوە ناکۆتاییە زۆرەدا ئەگەری درووستبوونی هەر شتێکی لێ چاوەڕوان دەکرا، بەڵام ئەم قسەیە بۆ لێکدانەوەی بوونی ژیان لەسەر ئەم گەردوونەمان بە هیچ جۆرێك قەبوڵ نییە.

بە هەمان شێوە ئەگەر پەنا ببەینە بەر فیزیای چەندیی، ئەوا هیچ کەس ناتوانێت شتێك بسەلمێنێت یان ڕەتی بکاتەوە، چونکە هەمووی ئەگەرە. لە هەمان کاتدا، ئێمە تەنها توانیومانە بەرگێکی زانستی بەبەر پرسەکەدا بکەین دوای ئەوەی تۆوی گومانمان لە عەقڵ و دڵی هەموو مرۆڤێکدا چاند.

گوتنی ئەم درووشمانە دەکرێ بۆ سەلماندنی هەر شتێك و لە هەر بوارێکدابێ بەکاربێت، بەڵام لە ڕاستیدا تاکە بەڵگەیەکیشی نەخستۆتەڕوو.

پێویستە بەڵگەی زانستی وەك گوللە وابێت، بە تەواوی و بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو ئاڕاستە بکرێت، پاشان، باسی چەند گەردوونیی بۆ ئەندازەیەکی ناکۆتا لە گەردوونەکان و قەدیمییان بۆ ناکۆتا لە قەدیمیدا، تەنها لەبەر خاتری

ئەوەی یەكێك لە گەردوونەكان بارودۆخی گونجاوی تێدا بخولقێت و بۆ ژیان بشێت، ئەمە شێوازێكی زۆر مەترسیدارە؛ چونكە چەمكی بەڵگەی زانستی لە رەگ و ریشەوە هەڵدەكێشێت.

چەند گەردوونیی كە ئەگەری رێكەوت دەكاتە پێوەر بۆ ئەوەی یەكێكیان بۆ ژیان بشێت، قەبارەی كێشەكە گەورەتر دەكات؛ چونكە دەیكاتە ئەنجامی لێكدانی كێشە × ژمارەی گەردوونە گریمانەییەكان. ئەمە وەك ئەم قوتابییە وایە كە مامۆستاكەی باوەڕی بە پاساوەكەی نەدەكرد كە سەگێك دەفتەری ئەركەكانی قوتابخانەی خواردووە، پاشان قوتابییەكە قوڕەكە خەستتر بكات و لە وەڵامدا بڵێت، ژمارەیەك سەگ (كە ژمارەكەیان نەزانراوە) دەفتەری ئەركەكانی قوتابخانەیان خواردووە!!

ئەگەر بگوترێ یاسای گونجاو بۆ دروستبوونی ژیان بە رێكەوت و لە دوای ساردبوونەوەی یەكێك لە گەردوونەكان لە دوای تەقینەوە گەورەكە دروستبووە. ئەوا یاسا فیزیاییەكان كە لە كاتی ساردبوونەوەی ئەم گەردوونەدا بوونیان هەبووە، دەبو شوێنی یاسای باڵاتر بكەون، بەڵام دواتر چۆن یاسای باڵاتر دەركەوت. بۆیە بەردەوام پێویستیمان بە زانینی سەرچاوەی دروستبوونی یاسای باڵا پاشان باڵاتر و باڵاتر دەبێت، هەروەها دیدی چەند گەردوونیی پێویستی دەستێوەردانی خودایی رەتناكاتەوە.

**لەگەڵ فەلسەفەدا:**

فەیلەسووفی گەورە (ریچارد سوینبێرن Richard swin burne) لەگەڵ پۆل دێڤیزدا هاوبەشی دەكات لە گاڵتە كردن بە گریمانەی چەند گەردوونیی و دەڵێت: گەمژانەیە كە بڵێین چەندان تریلیۆن گەردوون كە دەگەڕێتەوە بۆ چەندان تریلیۆن ساڵ، لێكدانەوەیەكی شیاوە بۆ دروستبوونی بارودۆخێكی گونجاو لەسەر یەك گەردوون (گەردوونی ئێمە)، لە كاتێكدا دەكرێ هەموو بوون بە بوونی (یەك خودا) بە ژیرانە لێكبدرێتەوە.

گریمانەی چەندگەردوونیی، کە تەنیا بارودۆخی یەکێکیان گونجاو بوو بۆ ژیان، نەیتوانی وەڵامی پرسیارە گەورەکە بداتەوە: چۆن یاساکانی سەر ئەم گەردوونە درووستبوون؟

جا ئەگەر گریمانەی چەندگەردوونیی وەك لێکدانەوە بۆ درووستبوونی ژیان لەسەر گەردوونی ئێمە ڕەتبکەینەوە، ئەوا ڕێگایەکی ترمان لە بەردەمدا نییە، تەنیا دانان نەبێت بە خودا، بەدیهێنەری گەردوون و ژیان، کە بەڵگەی گونجان ئاماژەی بۆ دەکات.

## بەڵگەی گونجان Fine tuning argument

فەیلەسوو فی زانستەکان (جۆن لیسلی John Leslie) کە یەکێکە لە گەورەترین لایەنگرانی بنەمای مرۆیی لە کتێبەکەیدا (عەقڵی ڕەها Infinite mind)دا دەڵێت: گومان لەوەدا نییە کە گەردوون بۆ درووستبوونی ژیان ئامادەکراوە، ئەمەش لەڕێی ڕێکخستنێکی وردی یاساکانی گەردوون و بنەما چەسپاوە فیزیاییەکان، بەڵام ئەوەی بەڕاستی توشی سەرسوڕمانی کردووین، ئەوەیە کە ئەو گونجان و ڕێکخراوییە زۆر زیاترە لەوەی کە بۆ درووستبوونی ژیان پێویستە.

**کارۆموگناتیسی .. وەك نموونە:**

جۆن لیسلی نموونەی گونجان بە وزەی کارۆموگناتیسی دێنێتەوە، کە کۆنترۆڵی هەموو ڕێکخستنەکانی گەردوون دەکات، هەر لە بچوکترین پێکهاتە (گەردیلە) تا دەگاتە گەورەترین پێکهاتە (گەلەستێرە)[١]، کە هەموویان ملکەچی هەمان یاسان (یاساکانی فیزیای چەندیی).

---

(١) گەلەستێرە Galaxyies: بنیادێکی گەردوونییە لە کۆمەڵێکی زۆر ئەستێرە و تۆز و گاز و ماددەی تاریك پێکهاتووە، کە لە ڕێگەی هێزی کێشکردنی ئاڵوگۆڕ پێکەوە بەستراون و بە دەوری ناوەندێکی هاوبەشدا دەخولێتەوە.
فەلەکناسان گەلەستێرەکان مەزەندە دەکەن بەوەی کە $١٠^{١٠}$ تا $١٠^{١٢}$ گەلەستێرە لە گەردوونیی بینراودا هەیە. قەبارەی گەلەستێرە گەورەکان دەکاتە ١/٢ ملیۆن ساڵی ڕووناکی و زیاتر لە $١٠^{١٢}$ ئەستێرە لەخۆ دەگرێت.

لەسەر ئاستی گەردیلەکانیش، وزەی کارۆموگناتیسی پارێزگاری ئەلیکترۆنەکان دەکات لە خوولگەکانیدا، بەجۆرێك کە لەژێر کاریگەری وزەی دەرکەری ناوەندی زۆر دوور نەکەونەوە و، لە هەمان کاتیشدا، نەچنە ناو ناوکە گەردیلەکانەوە[1]، ئەمەش بەسەر هەموو گەردیلەکاندا جێبەجێ دەبێت، لە بچوکترینەوە تا گەورەترین. ئەم یاسایە بە تەنیا، هەموو سیستەمە جۆراوجۆرەکان بە تەواوی بەڕێوە دەبات، هەر لە DNA ناو خانەی زیندوو بگرە، تا دەگاتە سووتانی ناو ئەستێرەی گەلەستێرە جیاوازەکان و دەرچوونی وزە لێیانەوە بەدرێژایی بلیۆنان ساڵ.

چۆن تاکە هێزێك، کە بە یەکەیەکی پێوانەیی جێگیر دەپێورێت و ملکەچی یەك یاسای فیزیایی بێت، توانای ئەوەی هەیە بەم هەموو فەرمانە جیاوازانە هەڵبستێت. ئەمە لە کاتێکدا کە هەریەك لەم فەرمانانە پێویستی بە ئەندازەی جیاواز و شێوەی جیاوازی وزە هەیە؟

**دوو خاڵ دەمێنن، کە پێویستە دەربارەی بەڵگەی گونجان بیانخەینەڕوو:**

١- ئەم یاسا و نەگۆڕە فیزیاییانەی ئێستا هەن و ڕێ بە بەردەوام بوونی ژیان دەدەن، ڕێگایان بە دەرکەوتنی ژیان نەدەدا. بۆیە پێویستی بە بارودۆخ و یاسای تری جیاواز هەبوو کە پێش نزیکەی چوار بلیۆن ساڵ درووست بوو تا ژیان دەستپێبکات.

٢- ئەگەر هەندێك لە یاسا و نەگۆڕە فیزیاییەکان کە ئێستا هەن بگۆڕین ئەوا ناتوانرێ ژیان بەردەوام بێت.

یاساکانی سرووشت بەجۆرێك ڕێکخراون کە بۆ درووستبوونی ژیانی مرۆڤ و بەردەوام بوونی گونجاو بێت.

---

(١) گەردیلە لە ناوکێك پێکدێت کە بەهۆی کاریگەری کارۆموگناتیسی و وزەی دوورخەرەوەی ناوەندیی ئەلیکترۆنەکان بە دەوریدا دەخولێنەوە. ناوکیش لە پرۆتۆن و نیوترۆن و کوارك پێکدێت، کە یەکەی بنچینەی ئەم پرۆتۆن و نیوترۆنانەیە.

## باسی هەشتەم: چۆن ژیان درووستبوو؟

یەکێك لەو کێشانەی ڕووبەڕووی فەیلەسووفەکان دەبێتەوە لەکاتی ڕەفتارکردن لەگەڵ زانا ماددیگەراکاندا، کەمی دەرك کردنیانە بەو کاریگەرییە زانستیانەی بەهۆی لێکدانەوە ماددیەکانیان درووستدەبن، لەوانەیە وا بیربکەنەوە کە ئێمەی فەیلەسووف خۆمان خستۆتە دەریایەکەوە کە توانای بەرگەگرتنیمان نییە دەریای (بایۆلۆجیا).

لەکاتێکدا کە فەیلەسووفەکان پرسیاری (چۆن گەردوونێك کە لە ماددەیەکی نازیندووی نا عاقڵ دەتوانێت ژیانێکی عاقڵ و بەتوانا لەسەر زۆربوونمان بۆ بەدیبهێنێت؟) بەجۆرێك سەیر دەکەن کە ئەمە پرسێکی فەلسەفییە بەر لەوەی پرسێکی زانستی بایۆلۆجی بێت.

### خاسیەتەکانی بوونەوەری زیندوو :

ئەگەر بە دیدێکی فەلسەفییانە سەیری چەمکی ژیان بکەین، دەبینین کە خاسیەتی سەرەکی جیاکەرەوەی ژیان ئەوەیە کە زیندەوەرەکان ئامانج و مەبەستێکی بنەڕەتی لە درووستکردنیاندا هەیە (ئامانجدارێتی Teleology)، ئەم ئامانجە بریتییە لە پارێزگاریکردن لە بوون، ئەمە ئەو ئامانجەیە کە لەو ماددەی نازیندووەدا بوونی نەبوو کە لێی هێنرایە بوون، جا کاتێك ئەرستۆ باسی پەیوەندی نێوان ژیان و ئامانجدارێتی کرد، ژیانی بەوە پێناسەکرد کە بریتییە لەوەی شتێك ئامانج لە بوونیدا هەبێت.

خاسیەتی دووەمی ژیان بریتییە لە توانای زۆربوون. سەرەڕای ئەوەی کە هەموو بیردۆزەکانی درووستبوونی ژیان دەڕواننە زۆربوون وەك کارێکی سرووشتی هاوڕێ لەگەڵ ژیان، بەڵام لە ڕاستیدا زۆربوون خاسیەتێکی تەواو جیاوازە لە ژیان.

هەرچی خاسیەتی سێیەمی پەیوەست بە ژیانە، بریتییە لە سیستەمی کۆدی Coding system و چارەسەرکردنی زانیاری Information Processing کە لە هەموو جۆرەکانی زیندەوەردا بوونیان هەیە. (دیڤید بێرلینسکی[1] David Berlinski) زانای بیرکاری مەبەستی ئەم سیستەمەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، دەڵێت:

سیستەمی کۆدی ئەو سیستەمەیە کە دوو شت یان دوو سیستەم لە ڕێی ڕەمز و کۆدەوە بەیەکەوە دەبەستێتەوە. بۆ ئەوەی لەوە تێبگەین. با سەرنجی کۆدی مۆریس Morse code (تەلیگراف) بدەین، کە لەسەر سێ هەنگاو بنیاتنراوە:

کۆد - گواستنەوەی زانیاری - کردنەوەی کۆدەکە.

نێرەری کۆدەکە پیتەکانی ئەو وشانەی دەیەوێت بیانێرێت دەیانگۆڕێت بۆ دوو ڕەمز (خاڵ و نیشانە) و، هەموو پیتەکان بەم دوو ڕەمزە و بە ڕێگای بیرکاریانە دەخرێنەڕوو (کرداری بەکۆدکردن).

(أ = -- . --   گ = -- . -- و = . -- . بەم شێوەیە)، پاشان ئەم ڕەمزانە دەگۆڕدرێن بۆ ئاماژەی کارەبایی، کە لە ڕێی وایەرەوە بۆ شوێنی وەرگرەکە دەگوازرێنەوە، کە هەڵدەستێت بە کردنەوەی کۆدەکە و وەرگێڕانی بۆ واتا ئەسڵەکەی Decoding. ئەگەر ئەوەی لەناو خانەدا ڕوودەدات لەسەر ئەم سیستەمە جێبەجێ بکەین، دەبینین هەمان هەنگاو ڕوودەدەن:

چونکە زانیارییە تایبەتییەکان بە خانە و خاسیەتەکانی زیندەوەر کە بۆ نەوەکانی دواتر دەگوازرێنەوە، کە کرۆمۆسۆم جینەکانی هەڵگرتووە و لە تەنیشت یەك

---

(١) دیڤید بێرلینسکی David Berlinski: لە ساڵی ١٩٤٢ لە نیویۆرك لەدایك بووە، مامۆستای بیرکارییە و دکتۆرای لە فەلسەفە هەیە و یەکێکە لە گەورە لایەنگرانی دیزاینی زیرەك.

ڕیزدەبن بۆ ئەوەی کرۆمۆسۆماتی ناوکی خانە پێکبهێنن. ئەم زانیاریانە لە شێوەی ڕەمز بوونیان هەیە، کە چوار پیت بەکاردەهێنرێن[1] کە لە تەنیشت یەك بەپێی ڕێکخستنێکی بیرکاری جیاواز ڕێکدەخرێن، بۆ ئەوەی گوزارشت لە هەموو زانیارییەکان بکات کە ناوکی خانە هەڵیگرتووە و، ئەم پێکهاتە کیمیاییانە ترشی ناوکی بەناوبانگ پێکدەهێنن، کە کرۆمۆسۆمەکانی لێ پێکدێت و بەناوی DNA ناسراوە.

زانیارییەکان لە کرۆمۆسۆمەکانی ناو ناوکی خانە دەگوازرێنەوە بۆ تەنۆلکەی ناو شلەی خانەیی (سایتۆسۆڵ) و دەرەوەی ناوك و پێی دەگوترێ ڕایبۆسۆم و هەڵدەستێت بە گواستنەوەی ترشێکی ناوکی تر کە پێی دەگوترێ RNA (لە سیستەمی تەلیگرافدا بەرامبەر ئەو وایەرانەی کە کۆدەکە دەگوازنەوە).

لەسەر بنچینەی ئەو زانیارییانەی RNA لە DNA وە هەڵیگرتووە بۆ ڕایبۆسۆم، ئەوەی کۆتایی هەڵدەستێت بە کردنەوەی کۆدەکەو تێگەیشتن لە ناوەڕۆکەکەی و وەرگێڕانی زانیارییەکە Translation = Decoding و ترشە ئەمینییەکان بەیەکەوە دەبەسترێن بۆ پێکهێنانی پرۆتین، کە بە زۆربەی فەرمانەکانی خانە هەڵدەستێت.

ئەم سیستەمەی کۆد و چارەسەرکردنی زانیارییەکان، کە هەردوو ترشە ناوکیەکە DNA و RNA بەکاردەهێنێت، لە خانەی هەموو زیندەوەرەکاندا بوونی هەیە.

((کارل وۆیز[2] Carl woese)) (پێشەوای لێکۆڵینەوە لە بنچینەی ژیان) سیستەمی کۆد و چارەسەر کردنی زانیاری بەوە وەسف دەکات کە چەند لایەنەیە، بۆیە پێویستە تیایدا جیاوازی بکەین لە نێوان:

١- میکانیزمی کارکردنی سیستەمی کۆدی (DNA و RNA و پرۆتینات).

٢- سەرچاوەی سیستەمی کۆدی و چارەسەرکردنی زانیاری.

---

(١) ئەم چوار پیتە ٤ پێکهاتەی کیمیایین، لە کۆمەڵەی بە ناوی (نیکلۆتایدات Nucleotides).

(٢) کارل وۆیز Carl woese: ئەمریکیە و لە ساڵی ١٩٢٨ لەدایك بووە، مامۆستای مایکرۆبایۆلۆجیایە لە زانکۆی ئەلینۆس لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. ئارکیا Archia ی دۆزیەوە، کە کۆمەڵێکی سەربەخۆ و جیاوازە لە بەکتریا و پێکەوە دەبنە کۆمەڵە خانەیەکی بێ ناوك Rrokaryotes.

**٣- پەیوەندی ئەم میکانیزمە بە گەشەسەندنی زیندەوەرەکانەوە.**

بە وردبوونەوە لەم لایەنە، دەبینین کە ئەگەر هاتوو لەسەر بنچینەی ماددی لە بنەما و میکانیزمی کارکردنی (DNA) و (RNA) و پرۆتینات تێگەیشتین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە هیچ دەربارەی ئەوە نازانین کە چۆن و لەکوێوە ماددەی نازیندوو میکانیزمی کۆدی چارەسەرکردنی زانیاری و بەم شێوەیە ئاڵۆز و سەرسوڕهێنەرە پەیداکردووە.

## کێشەی (پێکهاتن) Morphogenesis :

ژیان چەند کارلێکێکی کیمیایی ئاڵۆز نییە کە بە درووستبوونی پرۆتینە پێویستەکان بۆ ژیان کۆتایی بێت، هەروەها بەتەنیا بریتی نییە لە هەڵگرتنی زانیاری و سیفەتە بۆماوەییەکان و گواستنەوەیان بۆ نەوەکانی دواتر. کێشەی ئاڵۆزتر کە ڕووبەڕووی ماددیگەراکان دەبێتەوە دەربارەی ژیان بریتییە لە کێشەی (پێکهاتن Morphogenesis).

چەمکی باوی لای ماددیگەرا وردکەرەوەکان[1] Reductionists ئەوەیە کە (DNA) کە بۆهێڵەکانی خانەی لێ پێکدێت، بەرپرسە لە هەمبەر هەموو سیفەتەکانی بوونەوەر لە ڕووی لاشەیی و دەروونی و ڕەفتار و، بێگومان ئەم دیدە وردکەرەوەیە لە کەمتەرخەمییەکەیدا مەترسیدارە؛ چونکە بۆ بایۆلۆجییەکان سەلمێنراوە کە (DNA)، بەو میکانیزمانەی تا ئێستا پێی گەیشتووین، بەتەواوی بێ توانایە لە پێکهێنانی بوونەوەر لەسەر شێوە ڕاستەقینەکەی Morphogenesis (واتە گۆڕینی تەنیا لە زانیاری بۆ بوونێکی ڕاستەقینە).

دەتوانین چەمکی پێکهاتن بە نموونەیەك ڕوونتر بکەینەوە: چۆن دەکرێ ئەو وشانەی کە لەسەر لاپەڕەیەك نووسیومانە و وەسفی شێوەی مرۆڤمان کردووە، هەرچەند ورد بێت، ئەو وشانە ببنە مرۆڤێکی ڕاستەقینە (بە گۆشت و خوێنەوە)! ئیتر بۆتە شتێکی پێویست کە دان بەوەدا بنرێت کە سیستەمێکی تر

---

(١) هزری ماددیگەرایی وردکەرەوە: سەرنجی باسی هەشتەم، بەشی دووەم بدە.

هەیە (کە هێشتا نەزانراوە) بەرپرسە لەم پێکهاتنە. بەڵام چۆن؟ ئەم سیستەمە چ سیستەمێکە؟ هێشتا نەزانراوێکی ڕەهایە.

**کێشەکە چەند لایەنەیە :**

زانایانی بایۆلۆجی و فەیلەسوفە ماددیەکان ڕووبەڕووی کێشەیەکی فەلسەفی و زانستی وا بوونەتەوە کە جێگای بەزەیین، کێشەکە چەند لایەنەیە و، لێکدانەوەی پێویستیان بۆ هیچ کام لەم لایەنانە نەخستۆتەڕوو:

**یەکەم:** ماددەی نازیندوو ئامانجداریی لە کوێ هێناوە؟ تا ببێتە بوونەوەرێکی زیندوو؟

**دووەم:** ماددەی نازیندوو (تەنانەت ماددەی زیندووی سەرەتاییش) توانای زۆربوونی لەکوێ هێناوە، ئەو توانایەی کە مەرجە بۆ بەردەوام بوونی جۆرەکان و پێشکەوتنی لەسەر پلیکانەکانی پەرەسەندندا؟

**سێیەم:** ماددەی نازیندوو میکانیزمی کۆدی و چارەسەرکردنی زانیاری لەکوێ هێناوە کە بوونەوەرە زیندووەکان لە بوونەوەرەکانی تر جیا دەکاتەوە؟

**چوارەم:** چۆن ئەو زانیارییانەی بە مەرەکەب نووسراونەتەوە دەبنە بوونەوەرێکی زیندوو، کرداری پێکهاتن Morphogenesis).

بۆ ئەوەی قورسی ئەو هەڵوێستە بزانین کە ماددیگەراکان لە لێکدانەوەی ئەم کێشانەدا ڕووبەڕووی دەبنەوە، با بۆچوونی پێشەوایانی زانستی بایۆلۆجی لە جیهاندا بزانین:

(ئاندرۆ کنۆڵ[1] Andrew knoll) مامۆستا لە زانکۆی هارڤارد دەڵێت:

ئەگەر بمانەوێ کۆتا زانیاری کە زانست دەربارەی درووستبوونی ژیان پێی گەیشتووە هەڵسەنگێنین، دەبینین کە:

---

(١) ئاندرۆ کنۆڵ Andrew knoll: لەساڵی ١٩٥١ لەدایك بووە، لە تەمەنی سی ساڵیدا بوو بە مامۆستای مێژووی سرووشتی لە زانکۆی هارڤارد. لە بەناوبانگترین کتێبی (ژیان لەسەر گەردوونە لاوەکە Lifeon a young planet)یە.

١- هێشتا نازانین بە دیاریکراوی کەی ژیان دەستی پێکردووە!

٢- هێشتا نازانین لە ژێر چ بارودۆخێکدا ژیان پەیدا بووە!

٣- هێشتا نازانین چۆن ژیان لەسەر ئەم هەسارەیە دەستی پێکردووە!

ئەمە سەبارەت بە لایەنە ماددیەکانی درووستبوونی ژیان، ئەدی بە چ شێوەیەك دەتوانین وەڵامی پرسیارە فەلسەفییە ئاڵۆزترەکان بدەینەوە؟

زانای فیزیای ئەتۆمی (جیراڵد شرۆیدەر[١] Gereld Schroeder) دەڵێت: بەتەنیا بوونی بارودۆخی گونجاو بۆ درووستبوونی ژیان، ئەوەمان بۆ دەرناخات کە چۆن درووستبووە. باشترین شت کە بتوانین بڵێین ئەوەیە کە ئەم بارودۆخە ڕێگای داوە کە ژیان لەسەر هەسارەکەمان درووست بێت و بەردەوام بێت. بەڵام هەموو ئەو یاسا سرووشتیانەی ئێمە دەیانزانین کۆڕان لەسەر ئەوەی کە ناکرێ ژیان لە ماددەیەکی نازیندوو درووست ببێت.

(جۆن مادۆکس[٢] John Maddox) سەرنووسەری فەخری گۆڤاری سرووشت Nature دەربارەی پرسیاری (کەی و چۆن زۆربوونی ڕەگەزیی درووست بووە؟) دەڵێت: نازانم!

هەروەها (ئەنتۆنیۆ لازکانۆ[٣] Antonio Lazcano) سەرۆکی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی بۆ لێکۆڵینەوە لە بنچینەی ژیان دەڵێت: یەکێك لەو بابەتە لۆژیکی و فەلسەفییانەی پێویستە دانی پێدا بنێین، ئەوەیە کە ژیان درووست نەدەبوو ئەگەر (میکانیزمی بۆماوەیی Genetic mechanism) نەبوایە، توانای هەڵگرتنی

---

(١) جیراڵد شرۆیدەر Gereld Schroeder: ئەمریکییە، دکتۆرای لە فیزیای ئەتۆمی و گەردوونناسی هەیە کە لەساڵی١٩٦٥ لە MIT وەرگرتووە. مامۆستای زانکۆی عیبرییە لە قودس. گرنگی دەدات بە پەیوەندی نێوان زانست و ڕۆحانییات و لە بەناوبانگترین کتێبەکانی Science of God.

(٢) سێر جۆن مادۆکس sir John Maddox: لە ئینگلتەرا لە ساڵی ١٩٢٥ لەدایك بووە. پسپۆڕی کیمیا و فیزیا و بایۆلۆجییە و وەك نووسەرێکی زانستی لە تەمەنی بیست و دوو ساڵییەوە لە گۆڤاری (سرووشت Nature) کاردەکات.

(٣) ئەنتۆنیۆ لازکانۆ Antonio Lazcano: مامۆستای بایۆلۆجی مەکسیکی، بەناوبانگترین کتێبی The orign of life.

زانیاری و گواستنەوەی هەیە بۆ نەوەکانی دواتر، لەگەڵ ئەگەری گۆڕانکاری تێیدا (پەرەسەندن)، ئیتر چۆن ئەم مادده نازیندووە ئەم میکانیزمەی لە کوێ هێناوە؟ نازانین!

## ڕووینەوەی تەمومژەکە :

گەورە زانای فیسیۆلۆجی (جۆرج والد[1] George wald) خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ، لە ڕاستی بنچینەی ژیان نزیکمان دەکاتەوە و دەڵێت:

سەرەڕای ئەوەی کە لەسەرەتادا بۆ بیرکردنەوە زانستییەکەم وەك شۆك وابوو، بەڵام پێویستە دان بە بوونی زیرەکی و دیزایین Intelligence and design دابنێم کە لەپشت درووست بوونی گەردوونەوەیە و بۆتە هۆکاری ئەوەی کە بۆ درووستبوونی ژیان و پەرەسەندنی لەسەر هەسارەکەمان بارودۆخی گونجاوبێت. لەوەش ئاڵۆزتر، درووستبوونی ژیان خۆی، پاشان دەرکەوتنی زیندەوەرەکان، کە بە پلەبەندی گەشەیان سەندووە تا دەگاتە بوونەوەرە ژیرەکە، کە توانای گەیشتنی هەیە بە دۆزینەوە زانستییەکان و داهێنانی هونەر و تەکنەلۆژیا وروژاندنی پرسیارەکان، بەڵام ئەگەر نکۆڵی لە زیرەکی و دیزاین بکەین و بڵێین: ژیان بە ڕێکەوت درووستبووە، ئەوا لێکدانەوە قورسترینەکەمان هەڵبژاردووە.

**ئەمە بیروباوەڕی منە:** تاکە لێکدانەوەی لۆژیکی و عەقڵانی بۆ ژیانێکی ئامانجدار و بە توانا بۆ زۆربوون، کە میکانیزمی کۆدی بەڕێوەدەبات، بریتییە لە داننان بە بوونی خودایەکی قەدیمی دانای بەتوانا.

---

(١) جۆرج والد George wald: ئەمریکییە (١٩٠٦ - ١٩٩٧). لە زانکۆی هارڤارد مامۆستای فەرمانی ئەندامەکانی جەستەبوو، خەڵاتی نۆبڵی لەسەر توێژینەوەکانی دەربارەی تۆڕی چاو وەرگرتووە.

## باسی نۆیەم : کەوتنی بەریەستەکان



دوای ئەوەی لە ڕێی فەلسەفە و زانست گەیشتمە حەتمییەت و مسۆگەریی بوونی خودایەکی بەدیهێنەری گەردوون، کێشەی وێناکردنی ئەم خودایە ئەزەلییەی کە سەرەتای نییە و سیفەتەکانی بە جۆرێکن کە لە ژیان و هەسارەکەمان پێیان ڕانەهاتووین هەر لە مێشکمدا مایەوە.

پێشتر لە کتێبەکەمدا (فەلسەفە و خودا) ئەوەم خستبووەڕوو کە توانای ئەوەم نییە بیر لەو خودایە بکەمەوە کە دیندارەکان باسی دەکەن، بەوەی کە ((ڕۆحە، نامادديە، هەموو بوونە Incorpoeal omnipresent spirit))، چونکە ئێمە وا ڕاهاتووین کە وەك (گۆشت و خوێن) سەیری مرۆڤ بکەین، بۆیە بۆچوونی: مەوجوود بوونەوەرێکی ژیری بێ لاشەیە، وەك ئەوە وایە بڵێی: مرۆڤە بەڵام مرۆڤ نییە! بۆیە ئەگەر باسەکە باسی مرۆڤێك بێت کە لاشەی نییە، ئەوا پێویستە سەرەتا دووبارە پێناسەی مرۆڤ بکەینەوە.

### تەواوبوونی وێنەی خودا :

لە هەشتاکان و نەوەدەکانی سەدەی بیستەم، فەیلەسوفە شیکارییەکان[1] بزووتنەوەیەکی ژیانەوەی ئایینییان دەستپێکرد بۆ سەلماندنی ئەگەر - یان حەتمییەتی - بوونی

---

(١) فەلسەفەی شیکاری: شیکاری: شیکردنەوە و گێڕانەوەی بابەتی توێژینەوە کە بۆ سەرچاوە و ڕەگەزە سەرەتاییەکانی.

فەلسەفەی شیکاری: کرداری لادانی ناڕوونییە لە پێکهاتەکەیدا و گەڕانەوەیەتی بۆ ئەو بەشە جۆراوجۆرانەی لێی پێکهاتووە. دوو بەشە: شیکاری لۆژیکی، لە پێشەواکانی (بێرتراند راسل)ە و شیکاری زمانەوانیی، کە لە باسی یەکەمدا ئاماژەمان پێکرد.

خودایەکی نامادەدی و هەموو بوون، لە دەرەوەی سنووری کات و شوێندا، لە بەڵگەکانیشیان جەختیان لەسەر زاڵبوون بەسەر کۆسپی نەتوانینی بیرکردنەوە لەم خودا نامادەدیە دەکردەوە.

تۆماس تراسی[١] Tomas Tracy بوونەوەری عاقڵ (زەمینی یان ئاسمانی) بەوە پێناسە دەکات کە توانای ئەوەی هەیە ئازادانە ویست و مەبەستی خۆی ئاراستە بکات. جا ئەگەر مرۆڤ لەژێر ئەم پێناسەیەدا پۆلێن بکرێت، ئەوا واتای ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو بوونێك کە مەبەست و ویستێکی لەپشت بێت وەکو بەرجەستە و لاشە بێت. ئا لێرەوە، بەرجەستەنەبوونی خودا ئەوە ڕەتناکاتەوە کە مەبەست و ویست وەسف بکرێت، تەنانەت لە توانای بەدیهێنانی هەموو بوونەوەرانی ناو بووندا.

هەروەها تراسی دەڵێت، ئەگەر خودا بەرجەستە نەبێت، زیندوویێت و ویستی ڕەها و توانای ڕەهای هەبێت، ئەوا شتێکی سرووشتییە کە ژیان و ویست و توانای وەك ژیان و ویست و توانای ئێمە نەبێت و سیفەتەکانی تری وەك خۆشەویستی و دانایی و هێمنی و سیفەتەکانی تریشی بە هەمان شێوە. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم دیدوبۆچوونە یارمەتیمان دەدات بۆ تێگەیشتن لە سیفەتە خوداییەکان، بەڵام هێشتا تێگەیشتنمان لەو سیفەتانە و لە زاتی خودایی زۆر کەم و کورت بینە.

## خودا لە دەرەوەی سنووری کات و شوێندایە

براین لیفتۆ[٢] Brain Leftow لە کتێبەکەیدا (کات و نەمریی)دا دەڵێت: لە ڕاستیدا چەمکی خودا، لە دەرەوەی سنووری کات و شوێندا هەیە، لەگەڵ بیردۆزی ڕێژەیی تایبەتدا دێتەوە. چونکە بیردۆزی ڕێژەیی تایبەت بە شێوەی

---

(١) تۆماس تراسی Tomas Tracy: مامۆستای ئاییینەکان لە زانکۆی Maine لە Bates لە بەناوبانگترین کتێبەکانی: - God Action and Embodiment . The God who acts.

(٢) براین لیفتۆ Brain Leftow: مامۆستای فەلسەفەی ئاییینەکان لە ئۆکسفۆرد، جێنشینی ڕیچارد سوینبێرن. لە بەناوبانگترین بەرهەمەکانی: Divine Ideas. .Necessary Being and concept of god. ..Time and Eternity. .Can philosophy Argu god's existeance

چوار دووری سەیری بوون دەکات و کات رەهەندی چوارەمییەتی[1]، کەواتە ئەو خودایەی شوێن سنوورداری ناکات پێویستە لەدەرەوەی (کات)یش بێت.

بۆیە دەرك کردنمان بە بوونی خودا لە دەرەوەی کات یارمەتیمان دەدات بۆ گەیشتن بە زۆر لە سیفەتەکانی. چونکە بوونی لە دەرەوەی کاتدا واتە هیچ شتێك لەبیر ناکات، چونکە ئێمە ئەوەی لە ڕابردوودا ڕوویداوە لەبیری دەکەین، خوداش ڕابردووی نییە. هەروەها ئەوە دەگەیەنێت کە خودا لەکار ناوەستێت، چونکە وەستان لە کارێك واتە تەواو بوونی کاتی ئەم کارە و، بەم شێوەیە ...

هەروەها کە دەڵێین خودا لە دەرەوەی سنووری کاتدایە، واتای ئەوەیە کە خودا هەرچی دەیکات لە کاتی خۆیدا دەیکات atonce، in asingle act و هیچ کارێك پێش کارێکی تر ناکات، بەڵام لەوانەیە بۆ ئێمە هەندێك کار پێش کاری تر بکەون.

ویست و کرداری خودا بۆ خۆرهەڵاتن ئەوەیە، کە خۆرهەڵاتنی سبەی و دووسبەی و.. بە دوادابێت.

خودای چاکەخواز و کێشەی خراپە و ئازار ...

گومان لەوە دانییە کە کێشەی خراپە و ئازار (کە لە پشت ڕەوتی بێباوەڕی منەوە بوو) لەلای فەیلەسووفەکان کێشەیەکە خاوەن قورسایی و سەنگی خۆیەتی. بەڵام من دڵنیا بوومەوە کە تێنەگەیشتن لەو کێشەیە نابێت ببێتە هۆی ئەوەی باوەڕمان بە بوونی خودا نەبێت، دوای ئەوەی بەڵگە فەلسەفی و عەقڵی و زانستییەکان ئەم بوونەیان سەلماندووە. لە ڕاستیدا بوونی خراپە و ئازار لە ژیانی مرۆڤدا پەیوەندی بە سیفەتەکانی خوداوە هەیە نەك بە بوون و نەبوونی خودا.

من توانیم بگەمە برێك لەو حیکمەتەی لە پشت ئەوەوە هەیە، کاتێك دڵنیابووم کە مرۆڤ ئازادی هەڵبژاردنی هەیە، کە لە ئاژەڵ و ڕووەکی جیادەکاتەوە و ئەو ئازادییەی کە ڕێمان پێدەدات کە بوونی خودا قەبووڵ بکەین یان ڕەتبکەینەوە،

---

(١) چوار دوورییەکە: سێ دووری شوێنییین سەرەوە و خوارەوە، ڕاست و چەپ، پێش و پاش، دووری چوارەمی (کات)ە.

یان هەوڵ بۆ ڕازیبوونی بدەین یان گوێ بەوە نەدەین، بۆیە پێویستە چاکە و خراپە هەبێت تا بە ئازادی خۆمان یەکێکیان هەڵبژێرین.

لە ڕاستیدا ئازادی هەڵبژاردن چەکێکی دوو سەرەیە؛ چونکە مرۆڤ دەتوانێت خراپە هەڵبژێرێت، ئەمەش ئەوە دەخوازێت کە سیفەتەکانی ئەو جیهانە دیاری بکەین کە پێمان وایە چاکە:

ماددیگەراکان بەو جۆرە سەیری چاکە دەکەن کە دەبێ بزانین چ سودێکی لێ پەیدا دەبێت. بۆنموونە دەوڵەمەندی و سەفەری خێرا بە کیشوەرەکاندا و ناوەندە ژمارەی تەمەنی مرۆڤ. دەبێ لە ئامانجەکانی مرۆڤ بن.

بەڵام دینداره‌کان پێیان وایە چاکە ئەوەیە کە لە خودات نزیك بکاتەوە، بەڵام بە سرووشت ئەوە ڕێگر نییە لەبەردەم ئەوەی کە بەدیهێنانی سوودیش گرنگی خۆی هەیە.

فەیلەسووفەکانیش ڕووبەڕووی ئاستەنگێکی گەورە بوونەوە لە پێناسە کردن و شیکردنەوەی بەهاکانی چاکە و حەق و جوانی.

بۆیە دەبینین کە گرێکوێرەی چاکە گرانی و ئەستەمییەکەی کەمتر نییە - بەڵکو لەوانەیە زیاتریش بێت - لە کێشەی خراپە.

خراپەش دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر، جۆرێکیان بەرهەمی مرۆڤ خۆیەتی و دەگەڕێتەوە بۆ کەموکوڕییەکانی دەروونی مرۆڤ. چونکە خودا کۆمەڵگاکانی بۆ ویست و کردەوە و هەڵبژاردنی مرۆڤ جێهێشتووە، بەڵام مرۆڤ زۆرجار زیان و ئازار بە براکەی دەگەیەنێت.

جۆرێکی خراپەش هەیە کە مرۆڤ دەستی تێدا نییە، وەك بومەلەرزە و لافاو و نەخۆشی. لەڕێی هەندێ لێکدانەوەوە توانیم ڕوودانی ئەم کارەساتانە لە چوارچێوەی خودای چاکە خوازدا جێبکەمەوە:

١- سرووشت یاسای وای تێدایە کە ڕێگا بە ڕوودانی بومەلەرزە و لافاو و کارەساتەکانی تر دەدات، لە هەمان کاتدا، ناکرێ سرووشت لەم یاسایانە دابماڵدرێت،

ئەگەرنا وجود و بوون تووشی گێرەشێوێنی و هەرەمەکی دەبێت، واتە ئێمە لە چوارچێوەی هۆکار و ئەنجامی ئەم یاسا سرووشتیانەدا دەژین.

٢- ئەو کارەساتە سرووشتیانە هانی مرۆڤ دەدەن کە هەوڵی ڕووبەڕووبوونەوەیان بدات، ئەمەش بۆتە هۆی پێشکەوتنێکی بەرچاو.

٣- ئەو کارەساتانە لایەنی ڕۆحی و بەهای مرۆڤیی بەرز دەکەنەوە، لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم مەینەتییانە.

٤- گومان لەوەدا نییە کە دیدی ئایینەکان بۆ ژیانی دوای مردن و ئەو خۆڕاگرییەی بە مرۆڤ دەبەخشێت بەهۆی پاداشت و بەرزبوونەوەی پلەی لە ژیانی دیکە لێکدانەوەی تەواوەتی کێشەی خراپە و ئازارە.

لە کۆتاییدا دەپرسم، ئایا ژیانی بێ خراپە و ناخۆشی بەو جۆرەی کە ئێمە خەیاڵی دەکەین مرۆڤ ڕازی دەکات؟ هەموو ئەو بۆچوونانەی فەیلەسووفەکان بۆ شارە پیرۆزەکە دایاننناوە لەملاولەولا دژیەکی و کەموکورتی تێدا دەدۆزرێتەوە و، فەیلەسووفەکان بەدوای شێوازێکی باشتردا دەگەڕێن.

پاشان چی؟

دووبارەی دەکەمەوە: گەشتی من بەرەو خودا گەشتێکی تەواو عەقڵی بوو؛ شوێنی بەڵگە کەوتم بۆ ئەو شوێنەی بردمی، ئەمجارەیان بەڵگە بەرەو خودای زیندووی زاتی بێ کەموکورتی ئەزەلی ناماددی، تەواوی بوون، تەواویی زانست، تەواویی توانای بردم.

بۆیە زۆر پێویستیمان بەوەیە کە زیاتر دەربارەی خودا بزانین! هەروەها زۆر پێویستیمان بەوە هەیە پەیوەندیمان لەگەڵ ئەو خودایەدا هەبێت.

دەگەڕێینەوە بۆ لای چیرۆکە ڕەمزییەکە، ئەو پیاوانەی مۆبایلەکەیان لە کەناری دوورگەکەیان دۆزیبووەوە، ئەگەر چیرۆکەکە بە ڕەتکردنەوەی زاناکان بۆ لێکدانەوەی دانای دوورگەکە بۆ بابەتەکە و ڕەتکردنەوەی بانگەوازی داناکە بۆ گەڕان و پەیوەندی کردن لەگەڵ دەرەوەدا کۆتایی هات، با کۆتاییەکی تر بۆ چیرۆکەکە خەیاڵ بکەین:

تۆ بڵێی ئەگەر زاناکان بە بۆچوونی دانای دوورگەکە ڕازی بوویان و بە جددی گەڕابان بەدوای ئەو مرۆڤە زیرەکانەی ئەو ئامێرمیان داهێناوە چی ڕوویدەدا؟ چی ڕوویدەدا ئەگەر هەندێك لە زاناکان هەوڵی ئەومیان دابا کە کۆدەکانی ئەو دەنگانە بکەنەوە کە گوێیان لێبوو؟ بێگومان ژیانیان جیاوازتر دەبوو و تێڕوانینیشیان بۆ جیهان جیاواز دەبوو. دەیانزانی کە ئەوان بە تەنیا نین، یاخود لەوانەیە لەوەدا سەرکەوتوو بوویان کە پەیوەندی بەو کەسانەوە بکەن.

ئەگەر گەشتی فەیلەسووفە عەقڵییەکان و گەشتی زانا لێکۆڵەرەکان گەیشتبێتە ئەوەی کە خوداییێکی دانای بە توانا هەیە، ئەوا هیچ بەربەستێك لەبەردەم ئەوەدا نابینم کە ئەو خودایە لە ڕێی وەحی و ناردنی پێغەمبەرانەوە خۆی بە بەندەکانی بناسێنێت، ئەگەر بەڵگەم لەسەر ئەوە دەستکەوت.

کەسی وا هەیە دەڵێت: کە لەوەدا سەرکەوتوو بووە کە پەیوەندی بە خوداوە بکات، بەڵام ئەوەی هێشتا بۆ من ڕووینەداوە. لەوانەیە ئەو ڕۆژە بێت کە گوێم لە دەنگی ئەوە بێت کە بانگم دەکات: (ئێستا گوێت لە منە؟)!!

## کۆتـایی[1]

ئەو ڕەتکردنەوەی نکۆڵیکارانی بوونی خودا دەیگرنەبەر هەر لەدێر زەمانەوە تا دەرکەوتنی بێباوەڕیی نوێ هەر لەسەر هەمان کۆڵەگە و پایە دامەزراوە. سەرەڕای ئەوەش زۆرێك بۆچوونیان وایە کە ژیارستانیەنی ماددی و زانستی نوێ وێنەیەکی تەواوی بوونیان خستۆتەڕوو (گەردوون و ژیان و مرۆڤ) کە جێگایەکی بۆ خودا تێدا نییە.

بەڵام لە ڕاستیدا پێچەوانەیە؛ چونکە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە زانست کۆمەڵێك دیاردەی خستەڕوو کە بێباوەڕانی دەمکوت کرد، لەوانە:

- لۆژیکیی لە بنچینە و کاری هەموو شتێکی دەوروبەرمان (لە بووندا) Rationality.

---

(١) ڕۆی ئەبراهم ڤارجیس کۆتاییەکەی نووسیوە، کە پێشەکییەکەیشی نووسیبوو. دانەری کتێبی (سەیروسەمەرەی بوون The Wonder of the world)ە، کە پێشتر لە پەراوێز ئاماژەمان پێکردووە.

- وشیاری Consciousness
- ژیان Life .
- بیرکردنەوە Thinking .
- هەستکردن بە خۆمان The self.

**بەڵگەکان لێمانەوە نزیکن:**

ئێمە لێرەدا باسی ئەگەر و گریمانە ناکەین، بەڵکو باسی چەند حەقیقەتێك دەکەین کە نکۆڵی کردن لێیان دەبێتەهۆی درووستبوونی دژیەکییەکی زۆر لە دیدوبۆچونمان دەربارەی خۆمان و بوون. بۆیە دەڵێین: بێباوەڕی لە نەبوونی بەڵگە سەرهەڵنادات بەڵکو لە ڕەتکردنەوەی بێباوەڕان بۆ بیرکردنەوە لە خۆیان و بوونی دەورویەریان سەرهەڵدەدات. بۆ ئەوەی هەست بەوە بکەی کە تا چ ئاستێك بەڵگە خوداییەکان پێمانەوە لکاون ئەم تاقیکرنەوەیە ئەنجام بدە:

بۆ ماوەی یەك خولەك بیر لەو مێزەی بەرامبەرت (یان هەر شتێکی تری بێگیان) بکەوە، ئایا پێت وایە لە ماوەی ملیارێك ساڵ یان ماوەیەکی نادیاردا ئەو ماددەیە عەقڵێکی وای بۆ پەیدابێت کە خۆی بناسێت و بیربکاتەوە، وەك ئێمە هەمانە؟ گومان لەوەدا نییە ئەگەر تۆزقاڵێك زانیاریمان دەربارەی ماددە و یاساکانی هەبێت، دەڵێین ئەوە مەحاڵە!

بەڵام بێباوەڕان ڕایەکی دیکەیان هەیە. ئەوان بۆچوونیان وایە کە لە کاتێکی نادیار لە ڕابردوودا ژیان هاتۆتەبەر ماددەی نازیندوو و هۆشی بۆ پەیدابووە و توانای بیرکرنەوەی بۆ دروستبووە و توانیویەتی خۆی بناسێت و بڵێت: (من)!

لە ماوەی سەدەی ڕابردوودا ڕێژەیەکی زۆر زانیاری بۆ مرۆڤ پەیدابووە، کە بە خەیاڵی پێشینانماندا نەدەهات، پێشتر دوو ساڵ جارێك زانیارییە کەمەکانمان دوو ئەوەندە زیادی دەکرد، بەڵام ئێستا هەموو ساڵێك ئەوە ڕوودەدات.

لەو زانیارییانە، گەیشتن بە بوونی پەیوەندی لەنێوان ماددەی بۆماوەیی و بازنەی مێشك و دەمار، هەروەها لە نێوان ژیان و هۆش و بیرکردنەوە و خۆ ناسینمان سەرەڕای ئەوەی کە ئێستا زیاتر لە پێشوو دەربارەی لایەنی ماددی ئەو دیاردانە

دەزانین، بەڵام لە ڕاستیدا زانست دەربارەی حەقیقەتی ئەو چوار دیاردەیە هیچ شتێکی زیادی نەخستۆتەسەر.

سەرەڕای ئەوەی کە زانا بێباوەڕەکان وەك بەرهەمی ڕاستەوخۆی مادده سەیری ئەو دیاردانە دەکەن، بەڵام من پێم وانییە کە تێگەیشتنم لەو کتێبە یان چەمکەکانی وەك ئازادی و دادگەری و یەکسانی (بۆ نموونە) جگە لە شەپۆلی کارەبایی هیچی تر نییە.

گومان لەوەدا نییە کە پشکنینە نوێیەکان چالاکییەکی کارەبایی لەکاتی ئەنجامدانی بیرکردنەوەدا لە هەندێك ناوچەی مێشکدا دەردەخەن، بەڵام دانانی ئەوەی کە ئەم چالاکییە بەرپرسە لە بیرکردنەوە، بەتەواوی وەك ئەوە وایە کە بڵێی: لە چەمکێکی وەك (دادگەریی) ئەو مەرەکەبە لێی بەرپرسە کە ئەو وشەیەی پێ نووسراوە.

## یەکەم: لۆژیك Rationality[1]

### کێ خودای درووستکردووە؟

بێباوەڕان دەپرسن: ئەگەر خودا بوونی بەدیهێناوە، ئەی کێ خودای درووستکردووە؟

کاتێك بێباوەڕان ئەم پرسە دەخەنەڕوو، ئەوا لەگەڵ باوەڕداراندا هاوڕان لەسەر ئەوەی کە پێویستە هەموو بەدیهێنراوێك بەدیهێنەرێکی هەبێت، بەڵام لەوە بێئاگان کە دەبێت بە زنجیرە بڕۆین تا دەگەینە بەدیهێنەری یەکەم، کە بەدیهێنەری نییە. لەبەر حەتمییەت و پێویستی بوونی ئەم بەدیهێنەرە فەیلەسووفەکان دەستەواژەی (واجب الوجود)یان بۆ بەکارهێناوە، واتا: ئەو زاتەی بوونی واجب و حەتمییە.

کەواتە، پرسیاری (کێ ئەم بەدیهێنەرەی بەدیهێناوە؟) لە ڕووی عەقڵییەوە پرسیارێکی هەڵەیە، ئەوەتا ئێمە بە (واجب الوجود) ناوی دەنێین، بەوە کە

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم چەمکە. سەرنجی باسی یەکەم (بەڵگەی گەردوونیی لە تەرازوودا) لە بەشی دووەمی کتێبەکە بدە.

بەدیهێنەری یەکەمە و بەدیهێنەری نییە، هەموو کات هەبووە و دەبێت و ئەزەلییە و سەرەتای نییە.

خۆ ئەگەر پرسیارەکە بە چەند وشەیەکی تر دەرببڕین و بڵێین: کێ بەدیهێنەری بەدیهێناوە؟ ئەوا زیاتر هەست بەو هەڵە عەقڵییە دەکەین کە تێیکەوتووین.

**هەڵبژێرە...**

لەسەرمان پێویستە کە بوونەوەر و مەوجوودێکی قەدیمی ئەزەلی هەڵبژێرین کە بەدیهێنەری نەبێت، خودا یان گەردوون.

ئەگەر گەردوون هەڵبژێری (وەك بێباوەڕەکانی تر)، ئەوا پێویستە ئەوەشت قەبووڵ بێت کە گەردوونێکی ماددی ئەزەلی قەدیم هەیە و بەدیهێنەری نییە و لەخۆوە دروستبووە بۆ ئەمەش داوای شیکردنەوە مەکە.

بەڵام ئەگەر خودا هەڵبژێری وەك بوونێکی ئەزەلی، ئەوا هیچ تەفسیر و لێکدانەوەیەکمان بۆی لە دەستدا نییە، بەڵام ئەوەیان بە شتێکی لۆژیکی دەبینم، لەبەر ئەوەی توانا عەقڵیەکانی ئێمە سنووردارن و بێتوانان لە دەرك کردن بە حەقیقەتی خودا، ئەمەش شتێکی نامۆ نییە، بەتایبەت لە کاتێکدا کە ئێمە لە دەرك کردن بە حەقیقەتی خۆشمان بێتواناین.

**لە خوداوە بەرەو بوون...**

دوای ئەوەی - لەڕێی لۆژیکی عەقڵییەوە - پێویستی بوونی (واجب الوجود) مان بۆ دەرکەوت، دەتوانین بڕۆینە ئاستی نزمتر لە لۆژیکییەت، کە لە هەموو بووندا خۆی دەنوێنێت.

چونکە گەردوون یاسای ڕێکخراوی سرووشت بەڕێوەی دەبات، کە (ئەنتۆنی فلو لە باسی شەشەمدا بەڵگەکانی خستۆتەڕوو، بەڵام ئایا یاساکانی سرووشت ئەم ڕێکخراوییەیان لەکوێ هێناوە (لۆژیکییەت)؟

ئاستی سێیەمی لۆژیکییەت: ئەگەر سەرنجی میکانیزمی پەرەسەندن بدەین، کە ئەو ژمارە زۆرەی زیندەوەری بۆ دەرکردووین، ئەوا دەبینین کە پەرەسەندن

(کە بێباوەڕان بێ بەڵگە پشتی پێدەبەستن) زۆرێك لە لۆژیکی تێدایە. ئا لەوێدا DNA هەیە، کە بواری دەستکاری کردنی هەیە و، ئەمەش ڕێ بەوە دەدات کە پەرەسەندن ڕووبدات، هەروەها یاسا سرووشتییەکان هەن، کە DNA ئاڕاستە دەکەن و، میکانیزمی هەڵبژاردنی سرووشتیش هەن، کە پارێزگاری لە سیفەتە نوێیە باشەکان دەکەن.

بە لۆژیك دەگەین بە ئاستی مرۆڤە ژیرەکان، دەبینین مرۆڤە ژیرەکان لۆژیك دەستی بەسەر هزر و ڕەفتاریاندا گرتووە.

لۆژیك لە هەموو بەشێکی بووندا بوونی هەیە، ئەی سەرچاوەکەی چییە؟ ئایا خودا تەنیا بریتییە لە گریمانەیەك کە ناچارین بڵێین، لەوکاتەی ڕووبەڕووی حەتمییەتی داننان بووین بە(واجب الوجود). یان ڕاستییەکە کە سەرچاوەی هەموو لۆژیکی بوونە؟

بێباوەڕان لۆژیك ڕەتدەکەنەوە

بێباوەڕان کۆمەڵێك بۆچوون دەخەنەڕوو، کە زیاتر لە گاڵتەوە نزیکن، بۆ ئەوەی سەرچاوەی گەردوون و یاسا سرووشتی و لۆژیکییەکانی گەردوونی پێ لێکبدەنەوە.

یەکێك لەو بۆچوونانە، بۆچوونی بێباوەڕی فیزیایی (ڤیکتۆر ستینگەر)[1]ە، کە دەڵێت ئەوانەی ناومان ناون یاسا سرووشتییەکان پێویستییان بە بەدیهێنەر نییە و، بە شێوەیەکی ڕاستەقینە خاسیەتەکانی ماددە ئاڕاستە ناکەن. ئەمانە کۆمەڵێك کۆت و بەندن کە فیزیاییەکان ناچاربوون ئەو ڕایە قەبووڵ بکەن، کاتێك هەوڵیاندا خاسیەتەکانی ماددە بە ڕێگای بیرکاری وەسف بکەن! واتە یاسا سرووشتییەکان بوونێکی ڕاستەقینە یان دانراوی ئێمەی مرۆڤن.

---

(١) ڤیکتۆر ستینگەر Victor Stenger: مامۆستای فیزیای ئەمریکی لە زانکۆی هاوای، لە ساڵی ١٩٣٥ لە دایك بووە. یەکێك لە نەیارانی چەمکی دیزایینی زیرەك. لە بەناوبانگترین کتێبەکانی Not by Design. باوەڕی بەوە هەیە کە زانست دەتوانێت بگاتە سەرچاوەی ماددی عەقڵی مرۆڤ، بەبێ گێڕانەوەی بۆ سەرچاوەیەکی نامادددی.

جا بۆ تەواوکردنی سیناریۆی هەڵاتن لە داننان بە بوونی عەقڵێکی بە توانا لەپشت بوونی لۆژیك لە یاسا سرووشتیەکاندا، هەروەها لە پشت درووستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە، ستێنگەر پەنای بردۆتەبەر فێڵ، کە زۆر لە فەیلەسووفە کۆن و نوێیەکانیش پەنایان بۆ بردووە. ئەوان نەبوونیان بە شت داناوە Nothing is something و، بوون بە شێوەیەکی خۆکار لەو شتە درووستبووە کە نەبوونە! تکایە وا تێمەگە کە خەریکە گاڵتەت لەگەڵ دەکەم، هەر بەڕاستی ئەوە قسەی ئەوانە!!

ستێنگەر و بێباوەڕانی دی ئەوەیان لە کیس چووە، کە نەبوون واتە نەبوونی وزە، نەبوونی بواری فیزیایی، نەبوونی یاسا، نەبوونی بۆشاییەك کە گەردوونی تێدا بێتەبوون، نەبوونی ڕەهەندێکی ماددی و عەقڵی لەهەر جۆرێك بێت. نەبوون نەبوونێکی ڕەهایە Absolute nothingness، کە ناتوانێت شتێك بێنێتە بوون، تەنانەت ئەگەر کاتێکی بێ کۆتاشی پێبدرێت، لە ڕاستیدا نەبوون کاتی تێدا نییە.

پاشان، ئەوەی زانست سەلماندوویەتی کە لەکاتی درووستبوونیدا وزەی گەردوون سفر بووە، ئەوە دەخوازێت کە پێویستی بە عەقڵێکی لۆژیکی بە توانای بەدیهێنەر هەبووە تا بیهێنێتە بوون، چونکە سەرەڕای ئەو ڕێکخراوییەی تێیدایە، لەگەڵ پێویست بوون بە خودا تێکناگیرێت.

**بەڵێ بۆ عەقڵ، نا بۆ وێناکردن[١]:**

ئەم بەشەی لۆژیك بە چیرۆکی هاوڕێیەکەم کۆتایی پێدێنم. گوتی: من ئێستا بە تەواوی قەناعەتم هات (لەڕێی لۆژیکی عەقڵی) کە پێویستە خودایەکی ئەزەلی (واجب الوجوب) هەبێت، بەڵام هێشتا ناتوانم (وێنا)ی بوونێك بکەم کە بەدیهێنەری نەبێت.

پێم گوت، هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئێمە هەمیشە بێتواناین لە وێناکردنی ئەو شتەی کە لە ئەزموونمان جیاواز بێت، ئێمە لە ژیانماندا بوونەوەرێکمان نەدیوە کە بەدیهێنەری نەبێت؛ ئەمەش هۆکاری ئەوەیە کە لە وێناکردنی (واجب الوجود) بێتواناین.

---

(١) ئەم بەشە لە نووسینی نووسەری کتێبی (گەشتی عەقڵ)ە.

بێتوانایی لە وێناکردن لە زۆر کاری تردا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، بۆ نموونە، دەتوانی وێنای ئەوە بکەی کە دەزووی DNA کە لەناو ناوکی خانەکانی لاشەدا هەیە دەتوانێت پێنج ملیۆن جار لەنێوان زەوی و خۆر بڕوات و بێت، ئەمە لە بیرکاریدا سەلمێنراوە و، لۆژیکی عەقڵیش پشتڕاستی کردۆتەوە، ئەمە لە کاتێکدا کە ناتوانین وێنای بکەین!

دووەم: ژیان Life :

پێناسەکردنی ژیان، یەکێکە لە گەورەترین ئەو کێشانەی ڕووبەڕووی زانا و فەیلەسووفەکان بۆتەوە، وەك زۆر دیاردەی تر کە لە ڕێی لێکۆڵینەوە لە خاسیەتەکانیەوە پێناسە دەکرێت. بۆیە لێرەدا بەوەندە وازدێنین کە بڵێین، گیانلەبەر پێویستە سێ خاسیەتی هەبێت:

- ئامانجێکی هەبێت Goal seeker، وەك پارێزگاریکردن لە جۆر و گەڕان بەدوای خۆراکدا.

- بوونەوەرێك بێت کە بەخۆی زۆر ببێت Self Replicator.

- بوونەوەرێك بوونەکەی لە کۆد (Coding System) سەرچاوە بگرێت، کە چالاکییە کیمیاییەکانی بەڕێوە ببات.

- ئێمە هێشتا لە نەزانییەکی قوڵداین، لە بارەی ئەوەی کە چۆن ماددەی نازیندوو ئەم خاسیەتانەی پەیداکردوون تا بتوانێت موعجیزەی یەکەم (خانە) بەرهەم بهێنێت، کە لێیەوە زیندەوەرەکانی تر پەرەیان سەندووە.

لە ڕاستیدا، شتێکی وام نییە کە بیخەمە سەر ئەوەی ئەنتۆنی فلو کە(لە باسی هەشتەم) دەربارەی درووستبوونی ژیان و بەڵگەی لەسەر بوونی بەدیهێنەر خستوویەتیەڕوو، بۆیە تەنیا بە خستنەڕووی دژە بۆچوونی پێشەوای نوێی بێباوەڕان ریچارد دۆکنز وازدێنم، بۆ ئەوەی بۆمان دەربکەوێت کە چۆن لە ڕاستی ڕادەکات و بەڵگەکانی چەند بێهێزن و چەند بێتوانایە لە بەرامبەر خستنەڕووی

تاکە بۆچوونێکی ڕاستەقینەی زانستی، دەربارەی کێشەی درووستبوونی ژیان.

دۆکنز، لە زۆر بۆنەی جیاوازدا دەڵێت:

- ژیان لە دەرەنجامی ڕوودانی کارلێکی کیمیایی دەستیپێکردووە، کە بۆتە هۆی ڕەخساندنی بارودۆخێکی زیندوو کە بوار بۆ هەڵبژاردنی سرووشتی فەراهەم بکات!

- کاتێك DNA درووستبوو، پەرەسەندنی هەڵبژاردنی سرووشتی دەستپێکرد!

- چۆن ئەوە ڕوویدا؟ زانایان باوەڕیان بە قودرەت و توانای جادووگەرانە ژمارە گەورەکان (ژمارەی بەشی بچووك و، کاتی دووروودرێژ) هەیە کە هەرشتێك بەرهەمبێنێت!

- ئەوەی پێویستمانە تەنیا بەشێکی بچووکی جادوویی و کاتێکی کەمە!

ئایا تۆش وای نابینی کە بەو قسە بێمانا جادووییە، ئەگەری ڕوودانی هەرشتێك لە هەرشوێنێکدا هەیە؟!

## سێیەم: هۆشیاریی Consciousness :

مرۆڤ بە شەش فەرمانی بنچینەیی گرنگ هەڵدەستێت، ئەوانیش: هۆشیاری، بیرکردنەوە، یادەوەری، زمان، لۆژیك، توانای بڕیاردان لەسەر شتەکان. پسپۆڕان ئەم فەرمانانە ناودەبەن بە: عەقڵ.

لێرەدا مەبەست لە هۆشیاری، ئەوەیە کە بزانین خەریکین چی دەکەین و چی لە مێشکماندایە و ئەوەی لە دەوروپشتمان دەیبینین[١].

هەروەك چۆن ماددیگەراکان بوێری ئەوەیان نەبووە کە نکۆڵی لە جیاوازییە جەوهەرییەکانی نێوان زیندەوەرەکان و ماددەی نازیندوو بکەن، بەهەمان شێوە نکۆڵیان لەوە نەکردووە کە ئێمە وەك مرۆڤ هۆشیاریمان هەیە و دەرك بە

---

(١) باشترین ڕێگا کە لە واتای هۆشیاری نزیکمان بکاتەوە، ئەوەیە کە بەراوردێك لە نێوان چالاکییە عەقڵییەکاندا بکەین،لە کاتی خەوتن و دوای ئەوەی لەخەو هەڵدەستین و هۆشیاریمان بۆ دەگەڕێتەوە.

شتەکان دەکەین و، ئەمەش بە جیاوازییەکی جەوهەری دادەندرێت لەنێوان ئێمە و زیندەوەرانی تردا.

**مێشــك و هۆشــیاری...**

کاتێك زانست گەیشتە زانینی بنچینە و میکانیزمی کارکردنی خانەی دەمار، قەبارەی ئەو تەنگ و چەڵەمەیە دەرکەوت کە ماددیگەراکان ڕووبەڕووی دەبنەوە، چونکە خاسیەتەکانی دەمارەخانەکان، لە ڕووی بایۆلۆجی و فیزیایی و کیمیاییەوە، بەهیچ جۆرێك ئاماژە بۆ ئەوە ناکەن کە ئەگەری ئەوە هەیە لێیانەوە هۆشیاریی و دەرك کردن پەیدابێت.

بە هەمان شێوە خانە خۆیشی کە دەرککردنی لەگەڵدایە کاتێك لەناو توێکڵی خانەدایە، بە هیچ جۆرێك هۆشیاری و دەرککردنی لەگەڵدانییە ئەگەر لە شوێنێکی تری دەمارەخانەکاندا بوونی هەبێت (قەدی مێشك یان دڕکەپەتك).

(سام هاریس[1] Sam Haris) سرووشتی هۆشیاری بەدەر لە سنووری ماددە شیدەکاتەوە و دەڵێت:

بنچینەی مێشك و شێوازی ئەنجامدانی فەرمانەکەی، ناتوانن ئەوە ڕوون بکەنەوە، کە چۆن شەپۆلی کارەبایی و گوازراوەی کیمیایی کە مێشك بەهۆیانەوە فەرمانە جوڵەیی و هەستییەکانی ئەنجام دەدات دەگۆڕێن بۆ کردارە عەقڵییەکان کە هەموومان دەیزانین. ئەمە پاڵنەرمانە تا دان بەوە دابنێین کە عەقڵ بەرهەمی ڕاستەوخۆی مێشکی ماددی نییە، پاشان ئەمە پاڵنەرمانە تا بەدوای سەرچاوەی غەیبی عەقڵدا بگەڕێین.

زانای فیزیایی (جیراڵد شرۆیدەر Gerald Schroeder) دەمانخاتە بەردەم جیاوازییەکی زۆر یەکلاییکەرەوە، کاتێك ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ئەگەر بێتوو

---

(١) سام هاریس Sam Haris: لێکۆڵەر و نووسەرێکی ئەمریکییە، فەلسەفەی لە زانکۆی ستانفۆرد خوێندووە، توێژینەوەکانی بۆ دکتۆراکەی لەسەر بەکارهێنانی تیشکی موگناتیسیە بۆ لێکۆڵینەوە لە پاشخانی بایۆلۆجی باوەڕ و بێباوەڕی.
لە بەناوبانگترین کتێبەکانی: (کۆتایی باوەڕ The end of faith) کە لە ساڵی ٢٠٠٤ دەرچووە، هەروەها نامەیەك بۆ گەلی مەسیحی Letter to a Christian nation کە لە ساڵی ٢٠٠٦ دەرچووە.

بنچینەی ماددی بکەینە پێوەر، ئەوا جیاوازییەکی ئەوتۆ نابینین، لە نێوان عەقڵی ئەنیشتاین و مشتێ لم، چونکە هەردووکیان لە هەمان گەردیلە پێکدێن و هەمان پرۆتۆن و نیوترۆن و ئەلیکترۆن لەخۆ دەگرێت.

## بێباوەڕان و هۆشیاریی

سەرەڕای ئەو سرووشتە موعجیزەیەی هۆش کە زانست دۆزیویەتەوە، هێشتا کەمینەیەکی کەم دەبینین کە نکۆڵی لەم ڕاستییە ئاشکرایە دەکەن. با بۆچوونی بێباوەڕی خۆبەفەیلەسووفزان (دانییل دێنیت[1]) دەربارەی هۆش بخوێنینەوە!

گومان لەوەدا نییە کە ئامێرەکانیش دەکرێ هۆشیان هەبێت، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەوەیە کە ئێمە ئامێری هۆشیارین!! بە هەمان شێوە پێویست بەوە ناکات کە دۆخێکی تایبەت بدەینە چالاکی عەقڵی، چونکە کاری ئەویش وەکو کار و چالاکییەکانی ترە، وەك هەستکردن بە برسیەتی و ئازار و تینوێتی، چونکە هەریەکەیان لە بەشێکی تایبەتی مێشکدا ڕوودەدەن. هەروەك چۆن کۆمپیوتەر بە چالاکییەکی عەقڵی هەڵدەستێت!! ئیتر پێویست بەوە ناکات تایبەتمەندی بدرێتە ئەو چالاکییە عەقڵییەی مرۆڤ ئەنجامی دەدات، کە سنووری ئەو یاسا فیزیاییانە دەبڕێت کە کۆمپیوتەری پێ درووستکراوە.

وڵامدانەوەی ئەو قسە بێبنەمایانە بۆ یەکێك لە گەورە زانایانی فیزیایی هاوڕێی دێنیت لێدەگەڕێین، ئەویش زانا (جۆن سێر)ە، کە لە وەڵامیدا دەڵێت: ((گومان لەوەدا نییە کە کردارە عەقڵییەکانی مرۆڤ، بە تەواوی لە چالاکییەکانی تری مێشك جیاوازە و، بە هیچ جۆرێکیش ناچێتە ژێر باری یاسا فیزیاییەکان. ئەوەی نکۆڵی لەوە بکات پێویستی بەوە نییە بە بەڵگە وەڵامی بدەیەوە، بەڵکو پێویستی بە چارەسەری دەروونی هەیە)).

ئەوەی نکۆڵی لە هۆش بکات، دەکەوێتە هەڵدژییەکی گەورە و شەرمەزارکەرەوە؛ چونکە بۆ نکۆڵی کردنی لە هۆش پێویستە قەبارەی ئەو پرسە بزانێت کە نکۆڵی لێدەکات!

---

(١) دانیال دینیت Daniel Dennett: مامۆستای فەلسەفەی ئەمریکی لە بۆستن، لە ساڵی ١٩٤٢ لە دایك بووە. یەکێکە لەوانەی گرنگی بە فەلسەی زانست و عەقڵ و پەیوەندییان بە پەرەسەندنەوە دەدات.

بۆیە هەندێ لە ماددیگەراییەکان هیچ ڕێگایەکیان بۆ نەماوەتەوە لە بەردەم داننان بە بێتواناییان لە بەرامبەر پرسی عەقڵ و هۆش، ئەوەتا دۆکنز خۆی جارێکیان دەڵێت: بەڕاستی زۆر زەحمەتە لێکدانەوەیەکی سرووشتیی بۆ هۆشی مرۆڤ و سەرچاوەکەی بکەین.

تکایە تۆپەکە لە من دوورخەنەوە و بیخەنە گۆڕەپانی یەکێکی تر. ئەوەتا هاوڕێ بەناو فەیلەسووفە ماددیگەراییەکەیشی ولبێرت دەڵێت: من بە ئەنقەست خۆم لە هەموو گفتوگۆیەك لەسەر هۆش دەدزمەوە.

بە ویژدانەوە بڕیار بدەن، ئەوانە لە کوێ و ڕاستگۆیی و ئەمینی ئەنتۆنی فلو لە کوێ، کە بەڵگە بۆ کوێی ببات بۆ ئەوێ دەڕوات؟!

## چوارەم: بیرکردنەوە Thinking :

ئەگەر هۆش ئەوە بێت کە بزانین چی دەکەین و چی لە مێشك و دەوروبەرمان دەگوزەرێ، ئەوا (بیرکردنەوە)، ئەوەیە کە لەوە تێبگەین کە دەرکی پێدەکەین و پێیەوە هۆشیارین، تێگەیشتنیش زۆر ئاستی هەیە.

یەکێك لە ئەرکە هەرە سەرسوڕهێنەرەکانی بیرکردنەوە، بریتییە لە هەستکردن بە جیاوازی نێوان واتا لەیەك نزیکەکان، هەروەها دۆزینەوەی گونجانی نێوان واتا لەیەك دوورەکان و، لە کۆتاییدا دەرخستنی دەرەنجامێك کە فەیلەسووفەکان پێی دەڵێن: چەمکەکان Concepts.

بۆچی منداڵ وا هەستدەکات کە سەگە گەورە و زەبەلاحە بە هێزە موو ڕەشە کەڵبە تیژەکەی و، لولوی سەگی بچوکی موو سپی بە نازی نەرم و نیانی دراوسێکەی، لە یەك جۆرن کە جۆری (سەگ)ەکانن؟

بۆچی تۆ دەتوانی بیر لە ڕەنگی سوور بکەیەوە وەك ڕەنگێك، بەبێ ئەوەی ناچاربی بیر لە شتێکی ڕەنگ سوور بکەیەوە؟ تەنانەت دەتوانی بیر لە چەمکانێك بکەیەوە کە بوونێکی ماددی بەرجەستەیان نییە وەك دادگەریی و ئازادیی.

ئێمە ئەم توانایە بەشێوەیەکی سرووشتی بەکاردێنین، کە پێویستی بە ماندووبوونێکی زۆر و ڕاهێنان نییە.

**بیرکردنەوە و مێشك :**

ئایا هیچ کات لە کاتی بیرکردنەوەدا بیرت لەوە کردۆتەوە کە ئەوە تۆی بیر دەکەیەوە نەك مێشکت بیر بکاتەوە؟! ئەم کردارە لە جوڵاندنی پەنجەکانی دەستت جیاوازە، کە لەبەر دەمتە و دەبینی کە دەستت خەریکی ئەنجامدانی کارێکە. ئەگەر مێشك یارمەتیدەربێت بۆ بیرکردنەوە، ئەمە واتای ئەوە نییە کە تێگەیشتنیش هەر لەوێدا ڕوودەدات، تەنیا لەبەر ئەوەی کە هەندێ دەمارەخانەت خستۆتە کار و ڕێگات پێداوە شەپۆلە کارەباییەکان بگوازێتەوە خانەکانی تەنیشتی.

بۆ ئەوەی لە سرووشتی بیرکردنەوە تێبگەی، بیر لە کارێکی وەك بانگهێشت کردنی هاوڕێکانت بۆ ژەمی ئێوارە بکە و، لە پڕ کۆمەڵێك پرسیار دێنە بیرت، کێ بانگ بکەم؟ کەی؟ لە کوێ؟ چییان پێشکەش بکەم؟.. ئایا هەستت کرد کە بیرکردنەوە لەم پرسیارانە کردارێکی ماددییە، وەك ڕۆیشتن و سەرکەوتن بە پلیکانەدا؟

بە هەمان شێوە کاتێك زمان لە قسەکردن و نووسین و خوێندنەوەدا بەکاردێنین، لەو کاتەدا زمان ئامرازی بیرکردنەوەمانە، نەك خوودی بیرکردنەوە بێت. بە تەواوی وەك ئەوەی کە ئێمە یاری شەترەنج دەکەین بە بەکارهێنانی تەختەی شەترەنج و سی و دوو پارچەکە، بەڵام پلان و بڕیار و تێگەیشتن لە جووڵەی بەرامبەر، شتێکی ترە.

ئەگەر لەو شتانە تێبگەین لەوە تێدەگەین کە بیرکردنەوە شتێکە سنووری ئامرازە ماددییەکان دەبڕێت، ئەگەرچی لە زۆربەی کاتەکاندا (وەك ماددەیەکی خاو) پێویستیمان بەو زانیاریانە هەیە کە هەستە ماددییەکانمان پێمان دەدەن وەك (بیستن - بینین - بەرکەوتن ...).

**ئێمە و کۆمپیوتەر :**

زۆربەمان لە لێکچواندنی بیرکردنەوەی مرۆڤ، بە کاری کۆمپیوتەر هەڵە دەکەین. بۆ ئەوەی ئەو لێ تێکەڵبوونە لاببەین، با بەراوردێك بکەین لەنێوان بیری مرۆڤ لەگەڵ کۆمپیوتەرە هەرە زیرەکەکانی وەك کۆمپیوتەری جینی شین Blue Gene کە بە زیاتر لە دووسەد ترلیۆن کرداری حیسابی لە چرکەیەکدا هەڵدەستێت.

یەکەمین هەڵە کە تێی دەکەوین، ئەوەیە کە وادابنێین کۆمپیوتەر کیان و بوونێکی سەربەخۆی هەیە، وەك بەکتریا و پەپولە و. چونکە ئەم زیندەوەرانە ئامانجێکی بەرزیان هەیە کە هەموو پێکهاتە و ئامرازەکانی لە پێناویدا کاردەکەن، ئەویش بریتییە لە پارێزگاریکردن لە مانەوە و بەردەوام بوونی جۆر و زۆربوون. بەڵام کۆمپیوتەری جینی شین کۆمەڵێك پارچەیە و دروستکەرەکەی ڕێکی خستووە تا بە کارێك هەڵبستن کە دروستکەرەکە دەیەوێت، بەبێ ئەوەی ئامانجێکی دیاریکراو هەبێت کە ئامێرەکە هەستی پێبکات. واتە کۆمپیوتەر بەبێ دروستکەر و بەرنامە ڕێژەکەی هیچ نییە، واتە کیانێکی سەربەخۆی نییە.

هەڵەی دووەم، ئەوەیە کە کۆمپیوتەر لە کاتی ئەنجامدانی کردارێك نازانێت چی دەکات، چونکە چالاکییەکانی کۆمپیوتەر (بۆ ئامێرەکە) تەنیا کۆمەڵێك شەپۆل و بازنەی کارەبایین کە تەنیا دوو هێما بەکاردێنێت ئەوانیش (سفر و یەك)ن. تا ئێستا ماددیگەراییەکان بوێری ئەوەیان نەبووە بانگەشەی ئەوە بکەن کە کۆمپیوتەر دەزانێت چی ئەنجام دەدات.

هەڵەی سێیەم، ئەگەر کاری کۆمپیوتەر لێکەوتەیەکی لێبکەوێتەوە مانایەکی بۆ ئێمە هەبێت (وەك ئەوەی کە بەدڵنیایەوە بزانین کە ئێمە لەسەر لێواری مایەپوچ بوونین، کە چ دەرەنجامێکی دەروونیی و کۆمەڵایەتی هەیە، ئەمەش دوای ئەوەی کۆمپیوتەر بۆی خستوینەتەڕوو، کە حسابی بانکیمان بەم شێوەیەیە) ئەوا ئەم دەرخستانە بۆ کۆمپیوتەر هیچ واتایەك ناگەیەنن، هەموو کارەکە

سیستەمێکی ژمارمییە، کە لە کۆمەڵێك سفر و یەکە پێکهاتووە.

کەواتە ئێمە ئەوەی ئەنجامی دەدەین بە مەبەستەوە ئەنجامی دەدەین Intention.

هەروەها دەزانین کە خەریکین چی دەکەین Awareness.

هەروەها لەوەی دەیکەین تێدەگەین Understanding.

ئایا هیچ لێکچوونێك لە نێوان بیرکردنەوەی ئێمە و کردارە حیسابیەکانی کۆمپیوتەر بەدی دەکەی؟ بانگەشەی ئەوەی کە کۆمپیوتەری جینی شین دەزانێت چی دەکات، وەك بانگەشەی ئەوە وایە کە DVD Player دیڤیدی لەو مۆسیقا و گۆرانی و فیلمانەی پیشانمان دەدات تێبگات و چێژی لێ وەربگرێت!!

## پێنجەم: هەستکردن بە خوود The self :

یەکێك لە پرسە گاڵتە ئامێز و ئازار بەخشەکان، کە زۆرترین ئەو دیاردانەی بێباوەڕان خۆی لێ دەبوێرن، ئەو پرسانەن کە لەخۆیانەوە نزیکن، کە بریتییە لە هەستکردن بە خودی خۆیان.

پێشەوای بێباوەڕیی دیڤید هیوم دەڵێت:

هەرچەندە زیاتر و زیاتر لەوە نزیك دەبمەوە لەوەی پێی دەڵێم (خۆم)، هەست ناکەم کە جیاواز بێت لە دەرککردن و تێبینی کردنم، تا ئەو ئاستەی بە تەواوی دەزانم کە بوونێکی سەربەخۆم نییە کە بە دەرککردن و تێبینی کردن هەڵدەستێت و تەواو دڵنیا دەبم کە جگە لە دەرککردن و تێبینی کردن هیچی تر نییە.

لە ڕاستیدا (هیوم) نکۆڵی لە خودی خۆی دەکات - بە سادەیی - لەبەرئەوەی کە ناتوانێت دەستی لێبدات.

کاتێك پرسیاری لێکرا (کێ)یە کە دەرك بە زانیاری و تێبینیەکانی جیهانی دەرەوە دەکات و وامان لێدەکات کە هەست بکەین کە ئێمە لە پلەی چاودێری سەر ئەم جیهانەین. کێیە دەرك بەوە دەکات کە ئەوەی دەوری ئێمەی داوە جیاوازە

لە ئێمە، کە دەکرێ بگۆڕێت، لە کاتێکدا ئێمە خەریکی سەیری ئەم گۆڕینە دەبین و ئەو پرسیارانە دەخەینەڕوو.

هیوم وەڵامی دایەوە، خودی من بیرکردنەوە و هەست و تێبینیەکانمە و، جگە لەوە خودێکی تر بوونی نییە!!

گومان لەوەدا نییە کە (خوود) گەورەترین کۆسپی بەردەم فەیلەسووفە ماددیگەراکانە و نکۆڵی کردن لێی ڕووبەڕووی کۆسپی گەورەیان دەکاتەوە.

کاتێك یەکێکیان لێی پرسی چۆن بۆم دەسەلمێنی کە من (خوود)ێکم هەیە؟

سەرسام بوو و بە وەڵامێك کە لە هەموو لایەکەوە بەسەری دەبارێت، گووتی: ئەی پرسیارکەرەکە کێیە؟!

خستنەڕووی بۆچوونی ماددیگەراییەکان تەواو بوو، با ئێستا بیر لە خودیْ خۆمان بکەینەوە:

کاتێك دەڵێین ((من)) (جێناوی قسەکەر، یان کە دەڵێین شتەکەم (ئەو میمە) یان کە دەڵێین ئەو پیاوە لێیدام (ئەو بزوێنە (ە)) پاشان کە بیر لەو سێ لایەنە دەکەینەوە کە ئاماژەن بۆ ئێمە، خۆمان لە بەردەم ڕووبەڕووبوونەوەی یەکێك لە سەرسوڕهێنەرترین و چێژبەخشترین مەتەڵ دەبینینەوە، کە بوون و خوودی خۆمانە.

خودی ئێمە حەقیقەتی ئێمەیە نەك شتێك بێت خاوەندارێتی بکەین، بەمەش هەموو شتێکی بۆ بگەڕێتەوە، جا ئەگەر مەحاڵ بێت کە دەستمان بخەینە سەر، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بوونێکی ماددی نییە، یان دۆخێکی عەقڵی یان مەعنەوی نییە کە تێبینی بکرێت و وەسفی بکرێت.

خوودی خۆمان گەورەترین ڕاستیە کە هەموومان دەیزانین ئەویش ئێمەمانانە. گومانیش لەوەدا نییە کە بنچینەی دەرککردنمان بە بوونی دەوروبەرمان و تێگەیشتن لەو هزر و پرسە فەلسەفیە سەرەکییەکانەی لە عەقڵماندا هەن بریتییە لە ناسینی خۆمان.

ئەگەر دیکارت گوتبێتی: (من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم)، دەتوانین دەستەواژەکە پێچەوانە بکەینەوە و فراوانتری بکەین: من هەم، کەواتە من بیردەکەمەوە - هۆشیارم - مەبەستێکم هەیە - نیازم هەیە - کاردانەوەم هەیە.

خوودی خۆمان شتێکە هەستی پێدەکەین، بەڵام ناتوانین وەسفی بکەین، باشتر بڵێین ناتوانین بە دەرەنجامە فیزیایی و کیمیاییەکان شیبکەینەوە. زانست ناتوانێت پەردە لەسەر خوود لابەرێت، بەڵکو خود زانست دەدۆزێتەوە. ئەگەر نکۆڵی لە خودی خۆمان بکەین ئەوا مێژوو و ڕابردوو و ئاینده دەبنە سەرابێکی نارێك و، بەڵکو دەبنە خەیاڵێکی بەریەککەوتووی دژیەك.

بەڵگەمان نییە لەسەر ئەوەی کە خوود لە بەشێکی دیاریکراوی لاشەدا بوونی هەیە، یان لە کۆمەڵێك خانەی دیاریکراوی مێشك، چونکە خانەکانی لاشەمان دەگۆڕێن و ئێمە هەر وەك خۆمان دەمێنینەوە. ئەگەر بڵێین زۆربەی خانەکانی مێشکمان ناگۆڕێن، ئەوا لێکۆڵینەوەی ورد لەو خانانە ئەوا نە یەکێکیان و نە بەشێکیان نامانگەیەننە (من = خوود).

گومان لەوەدا نییە کە خودی خۆمان شتێکی ماددی ڕووت نییە، هەروەك چۆن شتێکی مەعنەوی ڕووتیش نییە.

دەتوانین بڵێین: گیانەکانمان بەرجەستەن یان جەستەکانمان بەرگیانن. بۆیە بۆ ئەوەی مرۆڤێك بیت کە خوودت هەبێت، پێویستە جەستە[1] و گیانت بەیەکەوە هەبێت.

لە کۆتاییدا دەڵێین: بابەتەکە پێویستی بە باوەڕێکی کوێرانە بە ماددە هەیە، کە لە باوەڕی باوەڕداران بە خودا بەرزتر بێت، تا بتوانین وێنای ئەوە بکەین کە ماددەی نازیندوو دەکرێ ژیان و عەقڵ و هۆش و بیرکردنەوە و ناسینی خودی لێ پەیدا ببێت!

---

(١) مەبەست لە (گیان) لێرەدا: بوونێکی نامادییە، کە توانای بەرجەستەی هەبێت. نووسەری ئەم کۆتاییە بۆچوونی وایە کە گیانی مرۆڤ بریتییە لە خودی مرۆڤ.

## سەرچاوەی دیاردە نامادديەکان :

سەرچاوەی پێنج دیاردەکە چییە کە باسمان کردن (لۆژیك - ژیان - هۆش - بیرکردنەوە - هەستکردن بە خود)؟

ئەگەر دیاردە فیزیاییە ئاڵۆزەکان (وەك بوومەلەرزە) لە دیاردە فیزیاییە سادەکان پەیدا ببن (پێکهاتەی تونکڵی زەوی + بەرزبوونەوەی پەستان لەناو زەوی + پێکهاتەی تەقینەوەی ئەتۆمی لە ژێر زەوی + ...) ئەوا ئەو پێنج دیاردانە بە تەواوی لە دیاردە سادە و ئاڵۆزە فیزیاییەکان جیاوازن.

ئەگەر مادديگەراییە پەرەسەندنیەکان بۆمان شیبکەنەوە کە چۆن ماسی بۆتە بۆق و، چۆن داینەسوڕە بچووکەکان پەڕوباڵی فڕینیان پەیدا کردووە، ئەوا بۆ درووستبوونی ئەو پێنج دیاردەیە هیچ شیکردنەوە و لێکدانەوەیەك شك نابەن.

ئەمانە دیاردەی نامادین، پاشان تاکە لێکدانەوە کە بتوانێت ئەو پێنج دیاردەیە بە یەکەوە کۆبکاتەوە ئەوەیە کە بوونیان لە سەرچاوەیەکی بەرز سەرچاوەی گرتووە، لە بوونێکی نامادی کە هەمان سیفاتی هەبێت، بەدیهێنەرێکی هەستپێکەری بیرکەرەوەی لۆژیکی، چونکە ئەوەی هیچی نەبێت هیچ نابەخشێت.

### خوێنەری ئازیز...[1]

چەند لایەنێکی تری پرسەکە لەبەردەم فەیلەسووف و زانایاندا هەن، لەوانە:
ئایا ژیان و عەقڵ و خوود بوونێکی نامادین کە لە لاشەدا بەرجەستەن، یان لە دەرەوەی لاشە هەن و پەیوەندیان پێیەوە هەیە؟

بۆ ئەوەی ئەو پرسە ڕوون بکەینەوە، با سەیری وزەی خۆر بکەین. چونکە ژیان لە هەسارەکەمان لە خۆرەوە سەرچاوە دەگرێت بەڵام خۆر لەناو هەسارەی

---

(١) ئەم بەشە لە نووسینی نووسەری کتێبی (گەشتی عەقڵ)ە.

زەویدا نییە، بەڵکو دوورە، بەڵام لە هەمان کاتدا وزەی پێویستمان بۆ ژیان و بوون پێدەبەخشێت.

کەواتە، ئایا ژیان و عەقڵ و خوود لە دەرەوەی لاشە و مێشکەکانماندا بوونی هەیە و لە دوورەوە یارمەتیمان پێدەدەن، هەروەك پەخشی تەلەفزیۆنی. چونکە ئەکتەر و پێشکەشکار و مۆسیقاژەکان بوونیان هەیە، لە دوورەوەن و، شەپۆلەکان بڵاودەکرێنەوە و لە ڕێی ئامێرەکانەوە دێنە بەر چاو و گوێ و عەقڵمان.

ئەگەر کەموکوڕییەك لە بەشێکی مێشك ڕوویدات لەوانەیە بیرکردنەوە پەك بخات، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بیرکردنەوە لە مێشکدا ئەنجام دەدرێت! هەروەك چۆن ئەگەر هەڵەیەك لە ئامێری وەرگری تەلەفزیۆنەکەماندایە ڕوویدات، ڕاستە تەلەفزیۆنەکە لەکار دەکەوێت بەڵام پەخشەکە هەر بەردەوام دەبێت و شەپۆلەکان هەوای دەوروبەرمانی پڕکردووە.

ئەو دیاردە نامادديانەی باسمان کردن، ناکرێ بە ڕێبازی ماددیگەرایی لێکبدرێنەوە، کە هەمووشتێك لێکدەداتەوە تا دەگاتە ئاستی بوارەکانی وزە. لەو سنوورەدا، دیاردەی ژیان (و هۆشیاری و بیرکردنەوە و ناسینی خود) هەر بە تەواوی ون دەبن!!

ڕێبازی ماددیگەرایی لە شانۆی ژیاندا ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەبینێت، بەڵام نابێت لە شوێنێك بەکاری بێنین کە بواری خۆی نەبێت.

دەتوانین بە باوەڕەوە بڵێین: کاتی ئەوە هاتووە زانستی نوێ یارمەتی لە ئاسمان وەربگرێت تاگەشتی تێگەیشتن لە ناوەوە و دەوروبەرمان تەواوبکات.

## سەرنجێك لەوەی پێشتر باسمان كرد

سێر ئەنتۆنی فلو ژیانە فەلسەفیە دوورودرێژەكەی، هەر لەو كاتەی بێباوەڕی خۆی ڕاگەیاند لە تەمەنی پازدە ساڵی و تا نزیكی تەمەنی نەوەد ساڵی لەژێر سایەی یاسا فەلسەفییە بەناوبانگەكەی سوقرات ژیا، كە دەڵێت: (شوێنی بەڵگە دەكەوین جا بۆ هەركوێمان ببات To Follow The argument wherever it leads).

بینیمان چۆن بەڵگە بە درێژایی شەست و پێنج ساڵ بەرەو بێباوەڕیی برد، پاشان فەیلەسووفە گەورەكە (لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا) دوو دڵ نەبوو كە بە تەواوی بیروباوەڕەكەی بگۆڕێت و بۆ هەموو جیهانی ئاشكرا بكات كە ئێستا باوەڕی وایە كە (خودایەك هەیە).

ئەنتۆنی فلو پێی ڕاگەیاندین كە ئەوەی زانست دەربارەی گەردوون و ژیان و مرۆڤ پێی گەیشتووە، بەڵگەی تەواوی پێشكەشی ئەو و هەموو مرۆڤەكان كردووە بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن لەسەر بوونی (دیزاینەرێكی زیرەك).

هەروەها چاوخشاندنەوەی بە بەڵگە فەلسەفییەكاندا، كاریگەرییەكی زۆری هەبوو لەسەر گۆڕینی بیروباوەڕە ئیمانیەكانی.

**لە كتێبی ئەنتۆنی فلو چوار ڕاستی هەڵدێنجین (كە پێویست ناكات كەس خۆی لێ بەدەر بكات) كە بەرەو باوەڕبوون بە بوونی خودامان دەبات:**

**یەكەم:** نیمچە كۆدەنگییەك لە نێوان زانا پسپۆڕەكاندا هەیە، لەسەر ئەوەی كە بۆشایی (شوێن) و كات و وزە و ماددە، كە هەموویان لە نەبوونەوە هاتونەتە بوون، پێش نزیكەی ١٣,٧ بلیۆن ساڵ، لە ئەنجامی ڕووداوێكی گرنگ بووە كە پێی دەگوترێ تەقینەوە گەورەكەی گەردوون.

وەك دەزانین كە هەموو بوونەوەرێك ملكەچی یاسای (هەموو ڕووداوێك هۆكارێكی هەیە The law cause and effect)یە، بەو پێیەی بە هیچ جۆرێك

ناکرێ گەردوون لە نەبوونێکی ڕەها بێتە بوون، مەگەر بەدیهێنەری یەکەم نەبێت کە بەدیهێنەری نییە و توانای ئەوەی هەیە کە بوونەوەر لە نەبوونەوە بێنێتە بوون.

**دووەم:** ژیان دیاردەیەکە بەدەرە لە سنووری هەموو کارلێکە کیمیایی و یاسا فیزیاییەکان، ئیتر چۆن بەشەکانی ماددەی نازیندوو، ژیانیان پەیداکردووە؟ ناکرێت ئەمە ڕووبدات مەگەر لە ڕێی سەرچاوەیەکی تری بەرزتر کە ژیانی ڕەهای هەبێت.

**سێیەم:** زیرەکی و لۆژیکی و ئامانجداری لە بنچینە و چالاکی هەموو شتێکی دەوروبەرمان خۆی دەنوێنێت، لە ئەلیکترۆنەوە تا دەگاتە DNA لە زیندەوەرەکاندا. گومان لەوەدا نییە کە بەدیهێنەرەکەی ئەو سیفەتانەی تێدا هەیە.

**چوارەم:** مرۆڤ بەهرەیەکی زۆر گرنگی هەیە، کە عەقڵە. هەروەها گومان لەوەدا نییە کە ماددەی کوێری نازیندوو ناتوانێ لە خۆیەوە عەقڵێك بەرهەمبێنێت و، تەنیا لە ڕێی بەدیهێنەرێکی زانا و داناوە ئەمە دەکرێت.

ئەو ڕاستیانە بە ڕووکەش نین. تا لە ئاییندە زانست بتوانێت لێکدانەوەیەکی ماددی گرنگیان بۆ بدۆزێتەوە، بەڵکو یەکێکە لە چەمکە بنچینەییە کۆتاییەکان کە زانست هەرچەندە ئاڵۆزی زیاتری بۆ بدۆزرێتەوە زیاتر بێتوانایی خۆی لە بەردەم ئەو دیاردانە دەردەخات.

**بەڵگەکانی پێشووی ئەنتۆنی فلو لەسەر بوونی خودا، ئاماژە بۆ بوونی دوو چەمکی زۆر گرنگ دەکەن:**

**یەکەمیان:** چەمکی بەڵگەی گەردوونیی (بەڵگەی دیزاین) Cosmic، Design Argument، کە بە واتای ئەوە دێت کە بنچینەی گەردوون و یاساکانی بەڵگەن لەسەر بوونی دیزاینەرێکی زیرەك (خودای بەدیهێنەر).

**دووەم:** چەمکی بنەمای مرۆیی Anthropic Principle، کە بە واتای ئەوە دێت کە گەردوون بەجۆرێك درووستکراوە کە بە تەواوی گونجاوە بۆ ژیانی مرۆڤ.

سەرەڕای ئەو بەڵگە بەهێزانەی کە ئەنتۆنی فلو لەسەر ڕاستی ئەم دوو چەمکە خستویەتیەڕوو، هێشتا بێباوەڕان نکۆڵی لەوە دەکەن کە ئەم دوو بەڵگەیە بەڵگەبن لەسەر بوونی خودا. بۆیە لەم بەشەی کتێبەکە ئەم دوو چەمکە بە دووردرێژتر باس دەکەین، هەروەك چۆن بنەما عەقڵی و فەلسەفی و زانستییەکان لە سەر پەیوەندی مرۆڤ بە خودا و، پەیوەندی مرۆڤ بە ئایین دەخەینەڕوو.

## باسی یەکەم: بەڵگەی گەردوونی لە تەرازوودا

**((درووستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە، هەروەك چۆن بنچینەی گەردوون و یاساکانیشی، بەڵگەن لەسەر بوونی دیزاینەرێکی زیرەك (خودا) )).**

### چەند چەمکێکی بنەڕەتی ڕێخۆشکەر

چەند چەمکێکی بنەڕەتی ڕێخۆشکەر هەن، کە پێویستە لە بیری ئێمەدا روون بن لەکاتی لێکۆڵینەوەی بەڵگەی گەردوونیی.

**یەکەم:** زانست سنوورێکی هەیە، کە پێویستە کەسی توێژەر ئەو ڕاستییە بزانێت، بۆ ئەوەی زانست سنووری خۆی نەبەزێنێت و لە هەمان کاتدا سنووری زانستیش نەبەزێنرێت، لەو سنوورانەش:

١- زانست مامەڵە دەکات لەگەڵ شتەکان Things و ئەو یاسایانەی بەڕێوەیان دەبەن Laws، بەڵام بە هیچ جۆرێك مامەڵە لەگەڵ نەبوون Nothingness دا ناکات، کە لە پێش ئەو شت و یاسایانەدا هەبوون.

٢- زانست تەنیا لەگەڵ ئەو شتانەدا مامەڵە دەکات کە دەکرێ تێبینی بکرێن و بپێورێن Observable and measurable و، هیچ توانایەکی لەگەڵ غەیب یان خودا یان لەگەڵ پێش کات و دەرەوەی شوێندا نییە.

٣- زانست لە دانان بە هەندێ بنەما دەستپێدەکات کە لەلای ئێمە شتی سرووشتین و ناتوانین بیانسەلمێنین. لەو بەدیهیاتانە، ئێمە بوونمان هەیە و،

بەشێك بچووكترە لە هەموو و، هەموو ئەنجامێك هۆكارێكی هەیە The Law of Cause and Effect.

بە دڵنیاییەوە دەتوانین بەدیهیەتی كۆتایی ڕەتبكەینەوە، هەروەك چۆن دیڤید هیوم كردی، بەڵام ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی كە هەموو یاساكانی زانست ڕەتبكەینەوە كە لەسەر پەیوەندی نێوان هۆ و ئەنجام بنیاتنراون.

٤- بابەتە گەردوونیەكان لە هەموو لقەكانی زانیاری زیاترە كە تێیدا تێكەڵی لە نێوان زانست Science لەگەڵ زانستی ساختە Pesudoscience دا دەكرێت.

ئەگەر زانست بواری ئەوەی لەبەردەم بێت كە توێژینەوە لە زۆر شت بكات و زۆر شت بڵێت دەربارەی دۆخی ئێستای گەردوون و، بواری دانانی گریمانەی هەبێت لەسەر دۆخی گەردوون و ڕابردوودا، ئەوا دەربارەی پرسەكانی وەك سەرەتای یەكەم و نەبوونی ڕەها و درووستبوونی بوون لە نەبوون، زانست هیچ قسەیەكی بۆ وتن پێ نییە و، دواتر دەبینین كە ئەوەی لەو بارەیەوە وتراوە لە خەیاڵی زانستی نزیكە.

دووەم: لێكۆڵینەوە لە سەرچاوەی شتەكان لە هەموو كارێك قورسترە، بە تایبەت ئەگەر بابەتەكە لێكۆڵینەوە لەسەر گەردوون بێت.

پێویستە ئێمە (وەك بێباوەڕەكان نەبین) تەنیا بەوەی كە تەقینەوە گەورەكە هۆكاری درووستبوونی گەردوونە واز نەهێنین. چونكە تەقینەوە گەورەكەی گەردوون خۆی لە خۆیدا پێویستی بە هۆكارێك هەیە تا ڕوویدات.

ئەگەر ریچارد دۆكنز پێی وابێت كە یاساكانی سرووشت لە پشت ڕوودانی خۆكاری هەڕەمەكی درووستبوونی گەردوون و ژیانە و بە درووستكەرێكی كوێری كاتژمێر چواندوویەتی كە نازانێت چی دەكات، ئەوا دەكرێ ئەوەش قەبووڵ بكەین كە پێویستی بە درووستكەرێكی بینای دانا هەیە كە بتوانێت ئەم ئامرازانە بەكاربێنێت. تەقینەوە گەورەكەش بە هەمان شێوە، ئامرازێكی كوێرە لە دەستی درووستكەرێكی بینای دانادا.

بە تەنیا وازهێنان بە تەقینەوە گەورەکە وەك سەرچاوەی گەردوون، هیچ نییە جگە لە بەرەو پێشبردنی کێشەکە، بە تەواوی وەك ئەوەی کە درووستبوونی ژیان بەوە لێکبداتەوە کە لە هەسارەیەکی ترەوە هاتووە.

سێیەم: ئەزەلی. ئەبەدی. سەرمەدی

ئەگەر زانایان ئەوەیان سەلماندبێت کە کات لەگەڵ تەقینەوە گەورەکەدا درووستبووە، ئایا تۆ ڕۆژێ لە ڕۆژان بیرت لەوە کردۆتەوە کە چی پێش درووستبوونی کات ڕوویداوە؟ یان چی دوای کۆتایی هاتنی کات ڕوودەدات؟ ئەوە پرسێکی لۆژیکی فەلسەفی زانستی قورسە، بەڵام تا بڵێی گرنگە. جا بۆ ئەوەی سادەتری بکەینەوە، با سەرنجی جیهانی ژمارەکان بدەین.

لە کاتی مامەڵەکردنمان لەگەڵ ژمارەکاندا، دەبینین کە دەکرێ (١) بدرێتە پاڵ هەر ژمارەیەك و بە ئەندازەی یەك زیاد بکات و، دەکرێ بۆ ماوەی بلیۆنان ساڵ لەوە بەردەوام بین و، ناگەین بە ژمارەیەك کە بە ژمارەی کۆتایی دابنرێت، کە هیچ ژمارەیەکی لەدوا نەبێت. واتا ناتوانرێ بگەینە کۆتایی، لە ڕێگەی دانەپاڵی ژمارە یان بەش بۆ یەکتر، هەرچەندە هەوڵ بدەین.

لە ڕاستیدا پێناسەکردنی ناکۆتایی ئەوەیە: کە ناکرێ بژمێردرێت یان سنووری بزانرێت. کەواتە، ئەوەی دەکرێ بژمێردرێت لە ژمارە و بەش ناکۆتایی نییە.

کات وەك ژمارەکان وایە، دەکرێ بژمێردرێت و پێوانە بکرێت بە چرکە و خولەك و کاتژمێر ....

لەبەر ئەوە ناتوانین لە ئایندەدا بگەینە کۆتایی، هەرچەندە ساڵیش بخەینە سەر ئەو کاتەی ئێستامان. بە هەمان ئەندازە ناتوانین لە ڕابردوودا بە سڕینەوەی ساڵ لەم کاتەی ئێستامان بگەینە کۆتایی، واتە هەرچەندە لە ئاییندە و قەدیمییەتی ڕابردوودا نقوم ببین ناگەینە (کۆتایی).

واتە هەرچەندە ساڵ بسڕینەوە ناگەین بە (ئەزەل)، کە بەر لە سەرەتای کاتە. بە هەمان شێوە هەرچەند ساڵ بخەینە سەر کاتی ئێستامان ناگەین بە (ئەبەد)،

ئەبەد دوای کۆتایی کاتە. هەروەها بە دڵنیاییەوە ناگەین بە (سەرمەدیەت Eternary) کە ئەزەلی و ئەبەدییە لە هەمان کاتدا. فەیلەسووفەکانی ڕۆژئاوا باسیان لەوە کردووە بەوەی (Eterniry is not forever) واتە (نقوم بوون لە کاتدا جیاوازە لە سەرمەدیەت، سەرمەدیەت بەر لە درووستبوونی کات و دوای کاتە، واتە لە دەرەوەی کاتدایە).

بەمەش پرسیارکردن دەربارەی ئەندازەی کات بەر لە درووستبوونی گەردوون و دوای کۆتایی هاتنی، پرسیارێکی بێمانایە. وەك ئەوە وایە. بپرسی چی لە باکوری بەستەڵەکی باکور هەیە؟ بێگومان وەڵامێکمان دەستناکەوێت. چونکە بەستەڵەکی باکور سەرەتای باکورە لەسەر هەسارەی زەوی.

## بەڵگەی گەردوونیی لە تەرازوودا :

دوای ئەوەی زانایانی گەردوونناسی لە خستنەڕووی لێکدانەوەیەکی ماددی قایلکەر بۆ تەفینەوە گەورەکەی گەردوون بێ توانابوون، زۆرێك لە فەیلەسووف و زانایان ئەومیان خستەڕوو کە پێی دەگوترێ (بەڵگەی گەردوونی یان بەڵگەی دیزاین)، کە لە هەموو بەڵگە (زانستی/ لۆژیکی)یەکانی تر بەهێزترە لەسەر بوونی خودایەك بۆ گەردوون.

**ئەم بەڵگەیە لە دوو پێشەکی و دەرەنجامێك پێکدێت:**

أ- هەموو بوونەوەرێك سەرەتایەکی هەیە، کە پێویستە سەرچاوەیەکی هەبێت (بەدیهێنەر).

ب- گەردوون سەرەتایەکی هەیە.

کەواتە: پێویستە گەردوون سەرچاوەیەکی پێشخۆی هەبێت (بەدیهێنەر).

سەرەڕای ڕەوانی و درووستی ئەم دەرەنجامە لۆژیکییە و پشتبەستنی بەزانست و فەلسەفە، بەڵام هێشتا هەندێك هەن کە لە داننان بە بەدیهێنەرێکی زیرەکی بەتوانا ڕادەکەن، کە ئەم گەردوونەی ئێمەی درووستکردووە.

بە سەرنجدان بە درووستی ئەم دەرەنجامە، بێباوەڕان جەختیان لەسەر هەردوو پێشەکییەکەی بەڵگە کە (أ، ب) کردۆتەوە و زۆر بەرپەرچدانەوەیان لە بارەیەوە خستۆتەڕوو، کە دەکرێ لە هەشت خاڵدا کۆبکرێنەوە:

**یەکەم: گەردوونەکەمان قەدیمە و سەرەتای نییە (ئەزەلییە):**

ئەم بەرپەرچدانەوەیە کە لە ڕابردوودا لە بەهێزترین بەڵگەکانی دژی بەڵگەی گەردوونی بوو، تا ئەو کاتەی زانست سەلماندی (و بێباوەڕان دانیان بەوە دانا) کە گەردوونەکەمان سەرەتایەکی هەیە.

**دووەم: گەردوونەکەمان سەرەتایەکی هەیە، بەڵام پێویستی بە بەدیهێنەر نییە:**

بۆ دەرچوون لە کێشەی پێشوو، نکۆڵیکارانی ئەوەی کە خودا گەردوونی بەدیهێناوە، پەنایان بردە بەر خستنەڕووی چەند بیردۆزێك کە دەیسەلمێنن گەردوونەکەمان سەرەتایەکی هەیە و پێویستی بە بەدیهێنەر نییە.

لە گرنگترین ئەو بیردۆزانە، بیردۆزی ((گەردوونی ناجێگیر Oscillating universe))ە کە لە بیردۆزی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون Big bang دەچێت، بەڵام وایدەبینێت کە گەردوون لە ((تەقینەوە گەورەکە)) درووستبووە و بە دوایدا (ورد و خاشبوونێکی گەورە) ڕوویداوە، کە گەردوونی گەڕاندۆتەوە دۆخی تاکێتی، پاشان دوای ئەوە تەقینەوەیەکی تری گەورە ڕوویداوە، پاشان ورد و خاشبوونێکی تر، بەم شێوەیە تا ناکۆتایی لە قەدیمیدا، واتە ئەم ناجێگیرییە ئەزەلییە.

بەڵام ئەم گریمانەیە لە زۆربەی ناوەندە زانستییەکاندا ڕەتکراوەتەوە[1]، بەڵکو

---

(١) سێ هۆکاری سەرەکی هەن بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم بیردۆزە لەلایەن زانایانەوە:
١- فیزیا سەلماندوویەتی کە ئەم گەردوونەمان بە تەقینەوە گەورەکە دەستپێکردووە و ورد و خاشبوونێکی گەورەی بە دوادا دێت، بەڵام تاکە بەڵگەیەکی زانستی نییە لەسەر ئەوەی کە دوای ورد و خاش بوونەکە تەقینەوەیەکی تر بێت.
٢- بە هەمان شێوە هیچ بەڵگەیەکە زانستی نییە لەسەر ئەوەی ئەم گەردوونەمان گەردوونێکی تری ورد و خاش لە پێشدا هەبووە، کەواتە بابەتەکە لە گریمانەیەك زیاتر هیچی تر نییە.
٣- لە نمونەی گەردوونی ناجێگیردا یاساکانی داینامیکای گەرمی ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە کاتی ڕوودانی خولی داهاتوو پێویستە لەو خولەی ئێستادا درێژتر بێت و ئەگەر بۆ دواوە بگەڕێینەوە و ژماردنەکە

دوو زانا رووسیەکە[1] کە ئەم بیردۆزەیان پێشکەشکردووە لە ساڵی ١٩٦٣، دوای تەنیا حەوت ساڵ لە خستنەڕووی ئەو بیردۆزە پەشیمان بوونەوە. بەڵام سەرەڕای ئەوەش بێباوەڕان پێداگری لەسەر دەکەن و بە بەڵگە دەیهێننەوە.

چەمکێکی تر هاوشێوەی گەردوونی ناجێگیرە، وای دەبینێت ئەو مادده سەرەتاییەی تەقینەوە گەورەکەی گەردوونی لێوە درووستبوو دەکرێ ئەزەلی بێت و بەو پێیەش تەقینەوە گەورەکە سەرەتایەکی دەبێت، بەڵام پێویستی بە بەدیهێنەر نییە.

ئەو بیردۆزە (وەك ئەوەی پێشتر) پێویستی بە بەڵگەیەکی زانستی هەیە.

سێیەم: گەردوونێکی گەورەی بێ سنوور (ئەزەلی) هەیە کە زۆر گەردوونی بەرهەمهێناوە، لەوانە گەردوونی ئێمە:

ئەم بەرپەرچدانەوەیە درێژەی بەرپەرچدانەوەی پێشووترە، لەگەڵ بوونی یەك جیاوازی، ئەویش دانەپاڵی ئەزەلیەتە بۆ ((گەردوونی دایك)).

گومان لەوەدا نییە کە بێباوەڕان ناتوانن ئەزەلییەتی گەردوونی دایك ڕوون بکەنەوە، هەروەك چۆن لە ڕوونکردنەوەی ئەزەلیەتی گەردوونەکەمان بێ توانا بوون.

زانای گەردووناسی دیار پیبلز P.J.E.peebles جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەم خستنەڕووانە (یەکەم و دووەم و سێیەم) تەنیا گریمانەن و، بیردۆزی زانستی نین کە حەقیقەت یان زانیاری یان تەنانەت تێبینی بەجێی لە پشت بێت. لە خەیاڵی زانستی نزیکترن نەك لە زانست[2].

---

پێچەوانە بکەینەوە، دەبینین کە هەر خولێکی ڕابردوو کورتترە لەوەی دوای خۆی، تا دەگەینە خولێك کە کاتەکەی سفرە، کە ئەمەش سەرەتای خولە ناجێگیرەکانە، واتە ناگونجێ ناجێگیریەکە ئەزەلی بێت.

(١) دوو زاناکە Isaac Kbalatnikov & Evgenii Lifshitz ن.

٢ زانای دیاری گەردووناسی P.J.E.peebles لە (گۆڤاری زانستەکانی ئەمریکا Scientific American دا لە ژمارەی فێبریوەری، ٢٠٠٥)دا بیردۆزەکانی درووستبوونی گەردوونی بە پێی ئەندازەی بابەتیانەی بیردۆزەکان ڕێکخستووە. پیبلز پلەی A+ داوەتە ئەو بیردۆزانەی دەڵێن گەردوون لە بارودۆخی چڕ و زۆر گەرمدا درووستبووە، لە گرنگترینیان (بیردۆزی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون)ە. هەرچی بیردۆزەکانی ترە پلەی B+،B ،-A-، وەرنەگیراوی پێبەخشیون.

ڕێکخستنی پیبلز بە پێی بەڵگەی زانستی بۆ چوار ئاستی جیاواز ڕێکخراون:

**چوارەم: پێویست ناکات هەموو بوونێك کە سەرەتای هەبێت! پێویستی بە بەدیهێنەر یان سەرچاوەی پێشخۆی هەبێت.**

دوای ئەوەی بێباوەڕان بێتوانابوون لە گەیشتن بە سەرچاوەیەکی ماددی ئەزەلی بۆ گەردوونەکەمان، هیچیان لە بەردەمدا نەما جگە لەوەی بڵێن، دەکرێ گەردوون لە هیچەوە و بەبێ هیچ هۆکارێك درووست ببێت!! تەنانەت گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە ئەو قسە سەیرە بۆتە گەورەترین بەربەرچ کە ماددییەکانی ئەم سەردەمە دەیخەنەڕوو.

بەڵام، ئایا هەر بە ڕاستی ناکرێ شتێك لە هیچەوە و بەبێ هۆکار پەیدا ببێت؟

**ئەوانەی باوەڕیان بە بوونی بەدیهێنەرێکی زیرەك هەیە ئەوە بە مەحاڵ دەبینن، لەبەر سێ هۆکار:**

١- مرۆڤەکان (بە درێژایی مێژوو و جوگرافیا) بە سرووشتی دەرك بەوە دەکەن کە (هەموو ئەنجامێك هۆکارێکی هەیە)، ئەمەش پێی دەگوترێ (پەیوەندی نێوان هۆ و ئەنجام Law of Cause and effect).

گوتنی ئەوەی کە گەردوونی درووستکراو (سەرەتایەکی هەیە) و بەدیهێنەر و سەرچاوەیەکی پێشووی نییە، ئەمە ئەزموونێکی نوێی مرۆڤایەتییە لەو بوارەدا!!

٢- نەبوونی ڕەها (هیچ شتێك) توانای داهات و پاڵنەری نییە بۆ ئەوەی شتێك بەرهەم بێنێت، خۆ ئەگەر گریمانەی ڕوودانی ئەوەش بکەین ئەوا هەر ناکرێ نەبوونێکی ڕەها بێت.

٣- کێشەی گەورەی بێباوەڕان ئەوەیە، کە وا بیردەکەنەوە ئەگەر بڵێن (خودا بەدیهێنەرە) لەگەڵ (ڕێبازی زانستی) تێکدەگیرێت. ئەگەر وایە ئایا درووستبوونی

---

یەکەم: ڕاستییەکان (facts) کە هیچ گومانیان تێدا نییە.
دووەم: گریمانە لۆژیکیەکان Reasonable Hypothese کە بەڵگەی باشیان لە پشتە.
سێیەم: گریمانەی قابیلکەر Plausible Speculations کە بەڵگەی پاڵپشتی نییە.
چوارەم: گریمانەی ڕەتکراوە Inplausible Speculations کە بەڵگەی پاڵپشتی نییە و، لەگەڵ ڕاستییەکاندا تێکدەگیرێن.

شتێك لە هیچەوە و بەبێ هۆكار لەگەڵ ڕێبازی زانستی تێكناگیرێت؟ ئەمە زانست وێران دەكات، كە بەدوای پەیوەندی نێوان هۆ و ئەنجامدا دەگەڕێت. بە تەنیا گوتنی ئەوەی كە ئەم شتە تەنیا ڕوویداوە، كۆتایی بە بیركردنەوە و شیكردنەوەی لۆژیكیانە دێنێت.

بیردۆزی لەرینەوەی بۆشایی چەندیی Quantum Vacuum Fluctuations، بە یەكێك لە بەناوبانگترین ئەو گریمانانە دادەنرێت كە فیزیاییە بێباوەڕەكان خستویانەتەڕوو، بۆ شیكردنەوەی بوونێك كە سەرەتایەكی هەیە بەبێ ئەوەی سەرچاوەیەكی هەبێت، بەڵام هەڵە و نا زانستیی ئەم بیردۆزە سەلمێندرا[1].

بە هەمان شێوە ستیڤن هۆكینگ لە بەناوبانگترین كتێبەكەیدا (مێژوویەكی كورتی كات)دا نموونەیەكی هێناوەتەوە بۆ چۆنیەتی دروستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە بەبێ ئەوەی پێویستی بە بەدیهێنەر هەبێت[2].

---

(١) ئەم خەمڵاندنانە وای دەبینن، كە تەنۆلكەكانی خوار گەردیلەیی دەكرێ لە بۆشاییدا خۆ كردانە دروست ببن و لەناو بچن (كە ناویان ناوە بۆشایی چەندیی، دراوەتە پاڵ بیردۆزی چەندیی). بە پشت بەستن بەوەش دەكرێ گەردوونەكەمان خۆكردانە لە بۆشاییدا دروست بووبێت.

گەورە زانای فیزیا ((پۆل دێڤیز)) پێمان دەڵێت كە دروستبوونی تەنۆلكەكان ئەوە ناگەیەنێت كە ماددە لە هیچەوە دروست بووبێت، بەڵكو ئەوە دەگەیەنێت كە ئەو وزەیەی لەو بۆشاییەدا هەبووە گۆڕاوە بۆ ماددە، واتە لێردا بۆشاییەكە نەبوونێكی ڕەها نییە. چونكە ئەو وزەیە لە كوێ هات؟ بۆیە لە كۆتاییدا ئەو گریمانانە بە تەواوی ڕەتكراوەن.

(٢) بە نموونەی هارتل - هۆكینگ، یان نموونەی چەندیی گەردوون ناسراوە، ئەم نموونەیە پشت بە چەمكێك دەبەستێت كە هۆكینگ یەكەمجارە دەیخاتەڕوو، ئەویش چەمكی (كاتی خەیاڵی) بوو، كە پراكتیكی ژمارەی خەیاڵییە.

ئەگەر بەدوای ڕەگی چوارجای ژمارەی (- ٤)دا بگەڕێین. ئەوا ژمارەیەكی ڕاستەقینە نابینین (چونكە - ٢×-٢ = +٤) بۆیە هۆكینگ هەستا بە دانانی هێمای (×) وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو ژمارەیەی بوونی نییە و، دانانی هێمای × لە هاوكێشە تایبەتەكانی دەربارەی كات، لە ئەنجامدا كاتێكی خەیاڵی دەستكەوت، بۆیە كاتێك هۆكینگ ئەو هێمایانەی لە هاوكێشەكانیدا بەكارهێنا، پێویستی بوونی بەدیهێنەری یەكەمی لە حیسابەكانی خۆی سڕیەوە.

سێر هێربێرت دینگڵ Sir Herbert Dingle سەرۆكی كۆمەڵەی فەلەكناسی شاهانە لە ئینگلتەرا پێمان دەڵێت كە، ئەگەر چەمكی ژمارە خەیاڵییەكان ڕاستبێت لە ڕووی بیركارییەوە، ئەوا لە ڕووی پراكتیكیەوە هیچ پایەیەكی نییە، بۆ ئەوەش پشت بە نموونەیەك دەبەستێت كە هەموو قوتابیانی بیركاری دەیزانن.

ئەگەر ژمارەی پیاوانی پێویست بۆ ئەنجامدانی كارێك بریتی بێت لە (×) و × لە هەندێ هاوكێشەدا موجەب، سالب، ژمارەی تەواو، كەرت، ژمارەی خەیاڵی، ژمارەی ئاوێتە، سفر، بێ كۆتایی یان هەر

گومان لەوەدا نییە کە ستیڤن هۆکینگ پیاوی سەردەمە، بەهۆی بلیمەتییەکەی و چەند هۆکارێکی تر، بەڵام ئەوە ڕێگر نییە لەبەردەم سەرکەوتنی فیزیاییەکانی تر لە بە هەوادابردنی نموونەکەی، بەرپەرچدانەوەی ئەوان لەسەر بۆچوونە بیرکارییەکەی نەبوو، بەڵکو لەسەر بەریەککەوتنی لۆژیکی ناو نمونەکە بوو.

**پێنجەم: ئەگەر هەموو بوونێك سەرەتایەکی هەبێت، بەدیهێنەرێکی هەبێت، کەواتە پێویستە بەدیهێنەری سەرەتاش (خودا)بەدیهێنەری هەبێت.**

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو قسەیەی بێباوەڕان سەرنج ڕادەکێشین و دەڵێین: هەموو بوونێك سەرەتایەکی هەیە، بەڵام خودا سەرەتای نییە.

لەبەر ئەوە هەندێك بێباوەڕان لەگەڵ باوەڕداراندا هاوڕان، لەوەی کە - دانیان ناوە - بە بوونی بەدیهێنەری یەکەم، کە سرووشتییە سەرمەدی بێت (نە سەرەتای هەبێت، نە کۆتا)و، بەدیهێنەری نەبێت.

لە باسی هەشتەم لە ژێر ناونیشانی (بێباوەڕی لە خراپترین دۆخیدا) بە تێر و تەسەلی وەڵامی ئەو گومانە دەدەینەوە.

**شەشەم: ئەگەر هەر پێویست بێت بەدیهێنەری یەکەم هەبێت، ئایا پێویستە خودا بێت؟**

وەڵامی ئەو پرسە نکۆڵیکارییە دەدەینەوە، بەوەی سیفاتەکانی بەدیهێنەری یەکەم دەخەینەڕوو، بە لایەنی کەمەوە پێویستە بۆ بەدیهێنەری یەکەم:

١- بوونی پێویست بێت The Necessary being: بەو پێیەی وێناکردنی نەبوونی ئەو خودایە لە کاتێکدا بەدیهێنەری یەکەمە، ئەوەی بە دوادا دێت، کە ئێمە و گەردوون بوونمان نەبێت.

---

شێوەیەکی تر بێت کە بە بیری زانایانی بیرکاریدا هاتووە، ئەوا بە دڵنیاییەوە × (ژمارەی فەرمانبەرە پێویستەکان) بە ژمارەیەکی تەواو موجەب دادەنێین و ئەگەرەکانی تر وەلا دەنێین.
لە ڕاستیدا بیرکاری بە تەنیا ناتوانێت لە نێوان ئەگەرەکاندا لە نموونەی ڕابردوودا یەکێکیان هەڵبژێرێت، بۆیە پشت بە لۆژیك و ئەزموون دەبەستین.
پاشان ئەو کاتە خەیاڵییەی لە دانانی ژمارە خەیاڵییەکان لە هاوکێشەکانی هۆکینگدا پەیدا بووە، هیچ قیمەتێکی نییە و، پێچەوانە دەبێتەوە بۆ کاتی ڕاستەقینە، ئەگەر ژمارە خەیاڵیەکە بگۆڕدرێت بۆ ژمارەی ڕاستەقینە، ئەو کات پێویستی بۆ (بەدیهێنەری یەکەم) دەردەکەوێت.

٢- بوونەکەی پێویستی بە هۆکار نییە Uncaused: ئەمەش شتێکی سرووشتییە، چونکە ناکرێ لە سەرچاوەی بوونەوەر بۆ ناکۆتایی بڕۆین[1]، لەبەر ئەوە ناکرێ بەدیهێنەری یاسای هۆکار بچێتە ژێر باری یاساکەی.

٣- ئەزەلی Eternal: ئەگەر کات لەگەڵ تەقینەوە گەورەکەدا دروستبووە، ئەوا پێویست دەکات کە بەدیهێنەری یەکەم، کە کاتی دروستکردووە لە دەرەوەی کات بێت (ئەزەلی - بێ سەرەتا).

٤- نامادی، شوێن سنوورداری ناکات: مادده و شوێن (لەگەڵ دروستبوونی کاتدا) لەگەڵ تەقینەوە گەورەکەدا دروستبوون، پاشان ناکرێ هۆکاری یەکەم لەناو مادده و شوێندا بێت، لە کاتێکدا ئەو بەدیهێناون.

٥- ڕەهایی توانا Omnipotent: ئەگەر بەدیهێنەری یەکەم توانای بەدیهێنانی هەبێت لە نەبوونەوە، ئەوا گومان لەوەدا نییە کە توانای ئەنجامدانی هەر شتێکی هەیە.

٦- رەهایی زانیاری Omniscint: پێویستە بەدیهێنەری بوون زانیاری تەواوی دەربارەی بوونەوەرەکانی هەبێت و، دەربارەی هەموو ئەو شتانەی لە گەردووندا ڕوودەدەن.

٧- توانای بڕیاردانی هەبێت Decision maker: ئەگەر هەر لە ئەزەلەوە بەدیهێنەر بوونی هەبووبێت، گەردوون لە پێش ١٣,٧ بلیۆن ساڵ دروستکراوە، باشە بۆچی بەدیهێنەر لەو ساتە بڕیاری دروستکردنی دا؟ بێگومان بڕیارێکی دەربارەی ئەم کارە داوە.

ئەگەر بێباوەڕان بڵێن کە سەرەتای دروستبوونی گەردوون کردارێکی خۆکردی بووبێت بۆ بارودۆخێك و گەشەی سەندبێت، ئەوا لەسەریان پێویستە بۆمان ڕوون بکەنەوە کە چۆن بارودۆخەکان لە نەبوونی رەهادا پەیدا دەبن و، بۆچی بارودۆخەکە بەر لە ١٣,٧ بلیۆن ساڵ پەیدا بووە، دوای ئەوەی نەبوون ئەزەلی بووە (بەڵگەی

---

(١) زانایانی لۆژیك چەمکی (ڕیزبەستن ڕێگرە) بەکاردێنن.

ماوەی وازلێهێنان)؟ هەروەها ئەوەی هەڵەی ڕای بێباوەڕان زیاتر دەردەخات ئەوەیە کە دەرکەوتنی هەر بارودۆخێك لەسەر شتێکی ئەزەلی گۆڕانکاری لە ئەزەلەوە ئەنجامدەدات (کەواتە ئەزەل - ١٣,٧ ملیار ساڵ = ئەزەل)، ئەمەش واتا بە لۆژیکی ئەوان پێویستە گەردوون ئەزەلی بێت. ئەمەش ئەوە نییە کە زانست سەلماندوویەتی.

لە ڕاستیدا بوونی گەردوونێك کە سەرەتایەکی هەیە، لە ساتێکی دیاریکراودا درووستبووە، دوای ئەوەی نەبوونێکی ئەزەلی بووە، ناکرێ خۆکردانە درووستبووبێت، هەروەها پێویستی بە بوونی (هۆکاری یەکلاکەرەوە) هەیە کە ماوەی واز لێهێنان کۆتایی پێبهێنێت و، لەو کات و ساتەدا گەردوون بێنێتە بوون.

ئەمانە کەمترین ئەو خەسڵەتانەن کە پێویستە لە بەدیهێنەری گەردووندا هەبن، ئایا تۆش وای نابینی کە ئەو خەسڵەتانە لە خودای بەدیهێنەر، دانا، توانا، قەدیمی ئەزەلی نەبێت بوونیان نییە؟!

باشە، بۆچی یەك خودا و چەند خودا نا، بەم شێوەیە هەندێك بێباوەڕان قسە دەکەن، کە وەك لەناو بردنی بێباوەڕییەکەیان وایە، چونکە جیاوازی چییە کە بەدیهێنەر یەك بێت یان هەزار خودا، بەڵام یاسای لۆژیکی دەڵێت کە ئەگەر بکرێ شتێك بە شێوەیەکی سادەتر لێکبدرێتەوە، ئەوا پێویست ناکات پەنا ببەینە بەر لێکدانەوەی ئاڵۆز، باشە بۆچی یەك خودایی ڕەتبکەینەوە و پەنا ببەینە بەر چەند خودایی، کە ناڕوونی و بەریەککەوتنی لێبکەوێتەوە باوەڕداران بە خوای تاك و تەنها لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن؟!

**حەوتەم: خودای پڕکردنەوەی بۆشاییەکان God of the Gaps**

بێباوەڕان وای دەبینن کە داننان بە خودای بەدیهێنەری گەردوون، وەك دەرەنجامی کۆتایی بۆ هەردوو پێشەکی بەڵگەی گەردوونی، قۆستنەوەیەکی هەڵەیە بۆ بێتوانایی زانایان (تا ئێستا) لە وەڵامدانەوەی هەموو پرسیارەکان و، بێباوەڕان جەخت لەسەر بۆچوونی خۆیان دەکەنەوە، بەوەی کە زانست ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لێکدانەوە بۆ ئەو پرسانە پێشکەش دەکات کە پێشتر خەڵك بە

کاری خوداییان دادەنان، هەروەك چۆن بەکتریاکانی وەك هۆکاری نەخۆشیەکان دۆزییەوە، پاشان ناکرێت هەر بۆشاییەك دەرکەوت کە زانست نەیتوانی پڕی بکاتەوە پەنا ببەینە بەر پڕکردنەوەی بەهۆی توانای خودایی.

با ئەو بیانووە ببڕین، با چاوێك بە بەڵگە سەرەکیەکاندا بخشێنینەوە کە بەڵگەی گەردوونی لەسەر بنیاتنراوە، بۆ ئەوەی بزانین ئاخۆ زانست لە ئاییندەدا دەتوانێت دەروازەیەك بدۆزێتەوە، یان ئەوە ڕاستییە ڕەهاکەیە. ئایا زانست لە ئاییندەدا دەتوانێت ئەوە بدۆزێتەوە کە:

١- گەردوون هیچ سەرەتایەکی نییە و لە ئەزەلەوە بوونی هەیە؟

٢- ئەو گەردوونەی کە سەرەتایەکی هەیە دەکرێ لە نەبوونی ڕەهاوە خۆکردانە درووست ببێت؟

٣- هۆکاری یەکەمی بوونی گەردوون دەکرێ هۆکارێکی ماددی بێت؟

گومان لەوەدا نییە کە لە کاتی گفتوگۆکردن دەربارەی حەوت بەربەرچدانەوەکەی پێشوو دەرکەوت، کە ئەم سێ خاڵەش شتی سەلمێنراون بە ڕێگەی زانستی و فەلسەفی و جێگای نکۆڵی کردن و گۆڕان نین. واتا داننان بە بوونی بەدیهێنەرێکی زیرەك تەنیا پڕکردنەوەی بۆشایی نییە، چارەسەرێکی کاتی نییە بۆ هەندێك لەو پرسانەی ناتوانین لێکدانەوەیان بۆ بکەین.

بۆیە لە کۆتاییدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کە ڕەتکردنەوەمان بۆ لێکدانەوە ماددیەکان لەسەر بوونی کەموکورتی لە زانیاری زانستی (نەزانی) بنیات نەنراوە بەڵکو ڕەتکردنەوەیەکی بە زانیارییەوەیە[1].

---

(١) با واتای ڕەتکردنەوەی بە زانیارییەوە ڕوون بکەینەوە، با نموونەیەك بێنینەوە، دەڵێین: ئەگەر دوای لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیر بۆ پێکهاتەی لەشی مرۆڤ و فەرمانەکانی بگەینە ئەو دەرەنجامەی کە مرۆڤ ناتوانێت بفڕێت، مەگەر ئامرازێك بەکاربێنێت کە یارمەتی فڕینی بدات، ئایا دەکرێت کەسێك ڕەخنە بگرێت و بڵێت: نا . لەوانەیە زانست دوای ماوەیەك ئەوە بدۆزێتەوە کە مرۆڤ دەتوانێت بەبێ ئامرازی یاریدەدەر بفڕێت. ئایا ڕەتکردنەوەمان بۆ بوونی ئەو قسەیەمان دەگەڕێتەوە بۆ بوونی کەموکورتی لە زانیارییەکانماندا (نەزانی) یان ڕەتکردنەوەیەکی بە زانیارییە؟.

**خوێنەری بەڕێز..**

هەندێ کەس ئەو بەرپەرچدانەوانەی ڕووبەڕووی بەڵگەی گەردوونی کراونەتەوە وەك بەڵگەیەك دەبینین لەسەر ئەوەی کە ئەم بەڵگەیە پڕە لە خاڵی لاواز، تا کار گەیشتۆتە ئەوەی کە دەڵێن: هەر لێکدانەوەیەکی ماددی بۆ درووستبوونی گەردوون قایلکەرترە لە داننان بە بوونی خودایەکی بەدیهێنەر!

بەڵام لە ڕاستیدا پێچەوانەکەی ڕاستە، چونکە هەموو ئەو بەرپەرچدانەوانەی خراونەتەڕوو بە بەڵگەی زانستی و فەلسەفی بە درۆ خراونەتەوە، بەڵکو ئەو هێرشانەیان چەند لایەنێکی خاڵی بەهێزی لە بەڵگەکەدا دەرخست کە پێشتر ئاشکرا نەبوو.

دوای ئەم خستنەڕووە پێویستە لە بەڵگەی گەردوونی وردببینەوە، بۆ ئەوەی بزانی ئایا راست و سەلمێنەری ناچارکەرە یان ناڕاست و نا سەلمێنەرە، لەگەڵ ئەوەی دەبێ رەچاوی ئەوە بکەین کە ڕەتکردنەوەی داننان بە بوونی خودای بەدیهێنەر پێویستە لە ڕووی زانستیەوە ئەمانە قەبوڵ بکرێ:

- گەردوون بەبێ بەدیهێنەر لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون.
- دەکرێ ئەنجام لە هۆکار گەورەتربێت.
- ڕێکخراوی لە خۆیەوە لە نارێکخراوی و بێ سەروبەری پەیدا دەبێت.
- یاساکانی سرووشت خۆیان خۆیان داڕشتووە.
- ژیان لە خۆیەوە لە ماددەی نازیندوو درووست دەبێت.

خوێنەری ئازیز، ئێستا لە دووڕیانێکدای، یان دەبێ عەقڵت داخەی بۆ ئەوەی بەم گریمانە مەحاڵانە ڕازی ببی، هەروەك چۆن ماددیگەراکان دەیکەن، یان سەیری بوون بکەی بەوەی کە گەردوونێکی کراوەیە لە جیهانی غەیبەوە ئاراستە وەردەگرێت. هیچ ڕێگە چارەت نییە پێویستە هەڵوێستێکی جددی وەربگری دەربارەی مەترسیدارترین پرسی ژیانی مرۆڤ، پرسی بوونی خودایی.

## باسی دووەم : بنچینەی مرۆیی لە تەرازوودا 

**((گەردوون بە جۆرێك درووستكراوە كە بە تەواوی گونجاوە بۆ ژیانی مرۆڤ))**

زانا و فەیلەسووفە ماددیگەراییەكان وای دەبینن كە گەردوون لە خۆوە درووستبووە و، گواستنەوەی لە قۆناغێكەوە بۆ قۆناغێكی تر بە شێوەیەكی هەڕەمەكی بووە، یان بە پێی یاساكانی سرووشت بووە. بۆیە ئەوان باوەڕبوون بەوەی كە مەبەستێك لە پشت درووستبوونی گەردوونەوە هەیە (كە بە ئامانجداری Teleology) ناسراوە بە دەرچوون لە زانست دەزانن.

لە كاتێكدا ئەوانەی باوەڕیان بە دیزاینی زیرەك هەیە وایدەبینن كە بنچینەی گەردوون زۆر لەگەڵ پێداویستییەكانی مرۆڤدا گونجاوە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئامانجدارێتی Teleology، بەو واتایەی كە خودا گەردوونی بەم شێوەیە درووستكردووە تا بۆ ژیان بە گشتی و ژیانی مرۆڤ بە تایبەتی گونجاو بێت. ئەم چەمكەش بە چەمكی بنچینەی مرۆیی Anthropic principle ناسراوە.

هەریەكە لە جۆن گریبن John Gribbin و مارتن ریز[1] Martin Rees بەشێوەیەكی ورد باسیان لەم دەستەواژەیە كردووە، كە دەڵێت: (وا دەردەكەوێت كە گەردوون بە پێی ئەندازەی مرۆڤ داڕێژراوە[2] Tailor - made for man)). هەروەك چۆن فریمان دیسۆن Freeman dyson باسی لە هەمان واتا كردووە دەڵێت:

---

(١) زانا فیزیاییەكانی ئەم بەشەمان لە پەراوێزی باسی حەوتەم لە بەشی یەكەم ناساندوون.

(٢) ئەمەیان لە كتێبەكەیان (ماددەی گەردوون The stuff of the universe) باسكردووە.

((وا دیارە گەردوون دەیزانی کە ئێمە دێین)). هەرچەندە زانیاریمان دەربارەی درووستبوونی گەردوون و بنچینەکەی زیاد بکات، ئەوا زیاتر گونجاوی ئەو درووستبوون و بنچینەیە و یاسا فیزیاییەکانی گەردوونمان بۆ درووستبوونی ژیان بۆ دەردەکەوێت.

هەرچی نەیارانی چەمکی دیزاینی زیرەکن، وای دەبینین کە بوونمان لە گەردووندا بەڵگەیەکی سرووشتییە لەسەر ئەوەی کە بنچینەکەی گونجاوە بۆ درووستبوونی ژیان و ئێمەش، ئەگەرنا ئێمەش نەدەهاتینە ژیانەوە. پاشان گونجاوی گەردوون بۆ درووستبوونمان بەڵگەیە لەسەر پرسێکی غەیبی. لەبەر ئەوە جۆن بارۆ John Barro ئەو بیرۆکەیە ڕەتدەکاتەوە کە دەڵێت گەردوون بە ئەندازەی مرۆڤ درووستکراوە، لەبری ئەوە وای دەبێنێت کە یاساکانی سرووشت مرۆڤیان وا لێکردووە کە لەگەڵ بنچینەی گەردووندا بگونجێت[١].

من واینابینم کە چەمکی جۆن بارۆ لەگەڵ چەمکی دیزاینی زیرەك و بنچینەی مرۆیی تێکبگیرێت. چونکە دەکرێ خودای بەدیهێنەر یاساکانی سرووشتی لە درووستکردنی بوونەوەردا لەسەر ئەو شێوەیەی دەیەوێت بەکارهێنابێت.

## ئامادەکردنی گەردوون بۆ ژیانی مرۆڤ :

لە کتێبی تەنیا شەش ژمارە Just Six Numbers)دا، سێر مارتن ریز Sir Martin Rees (گەورە زانای گەردووناسی ئینگلیزی) شەش بەهای ژمارەیی دیاریدەکات، کە بەرپرسن لە خاسیەتەکانی گەردوون کە بە تەواوی گونجاوە بۆ درووستبوونی ژیان و بەردەوامبوونی و، ریز ئەوە ڕووندەکاتەوە کە بچوکترین گۆڕانکاری لەو بەهایانەدا بوونی گەردوون بەو شێوەیەی ئێستا دەکاتە شتێکی مەحاڵ.

یەکەم: کشانی گەردوون لە دوای تەقینەوە گەورەکە (تا ئێستا) بە بزوێنەری سەرەکی قۆناغەکانی درووستبوونی دادەندرێت، کە بووە هۆی ساردبوونەوەی گەردوون و ئەو ڕووداوانەی بە دوایدا هاتن.

---

(١) جۆن بارۆ ئەو چەمکەی لە کتێبەکەیدا (گەردوونی ساختە The Artful universe)دا خستۆتەڕوو کە لەساڵی ١٩٥٥ چاپکراوە.

کەواتە ئەگەر ئەو هێزەی گەردوون دەکشێنێت بێهێزتر بوویێت لە ئەندازەی ئێستای، ئەوا گەردوون بەسەر خۆیدا دەڕوخا، ئەگەر بەهێزتریش بوویێت، ئەوا گەلەستێرەکان پەیدا نەدەبوون.

**دووەم:** گەلەستێرەکان لە دەرەنجامی زۆربوونی چڕی ماددەی گەردوون لە هەندێك ناوچەدا جیاواز لە شوێنەکانی تری گەردوونی نوێدا زیاتر بوو، بە ئەندازەی (١:١٠٠،٠٠٠) کە بووە هۆی دابینکردنی ماددەی پێویست بۆ درووستبوونی گەلەستێرەکان لەو ناوچانەدا.

ئەگەر ئەو ڕێژەیە لەو ئەندازەیە کەمتر بوایە، ئەوا گەردوون هەر لە دۆخە گازیەکەیدا دەمایەوە و، ئەگەر ماددەی گەردوون چڕتر دەبوو، دەبوو بە کونە ڕەشەکان و هەموو ماددەی گەردوونی قوت دەدا.

**سێیەم:** ئەگەر ئەندازەی هێزی کێشکردن کە خولگەکان بە یەکەوە گرێدەدات لە ئەندازەی ئێستا زیاتر بوایە، ئەوا گەردوون بەرلەوەی ژیانی تێدا درووست ببێت بەسەرخۆیدا دەڕووخا، ئەگەر لەو ئەندازەی ئێستاش بێهێزتر بوایە، ئەوا گەلەستێرە و ئەستێرەکان درووست نەدەبوون. هێزی کێشکردن بە وردی ڕێکخراوە کە (١:١٠٠،٠٠٠) تێدەپەڕێنێت.

**چوارەم:** ئەندازەی وزەی بەردەست بۆ بەیەکەوە بەستنەوەی ناوکی گەردیلەی هیلیۆم لەناو ئەستێرەکاندا (وزەی ناوەکی بەهێز):

سەرچاوەی وزە کە ئەستێرەکان (وەك خۆر) دەریدەکەن، یەکگرتنی ناوکی نێوان گەردیلەکانی هایدرۆجینە و (٠,٧٪) لەو وزەیە بۆ بەیەکەوە بەستنەوەی پێکهاتەی ناوکی گەردیلەی هیلیۆم، کە لە ئەنجامی ئەو بەیەکەوە گرێدانە درووستبووە. ئەگەر چینی گەردیلەیی هایدرۆجینی بۆ بەرهەمهێنانی ئەو وزەیە (٠,٦٪) یان کەمتر بوایە، ئەوا خۆر نەیدەتوانی گەرمی و ڕووناکی خۆی بڵاوبکاتەوە. هەروەها ئەگەر ڕێژەکەی (٠,٨٪) یان زیاتر بویە، ئەوا ئەو هایدرۆجینەی لە گەردووندا هەیە کۆتایی دەهات، کە سەرچاوەی وزەکەیەتی.

بە کورتی، ئەگەر ڕێژەکە (٠,٠٠٦) بێت لە جیاتی (٠,٠٠٧) ئەوا جگە لە هایدرۆجین هیچ لە گەردووندا بوونی نابێت، ئەگەر ببێتە (٠,٠٠٨) ئەوا بە هیچ جۆرێك هایدرۆجین بوونی نابێت.

**پێنجەم:** بەندە کارەباییەکان Electrical Bonds (بەندی ئایۆنی و بەندی هاوبەش) کە گەردیلەکان بەیەکەوە دەبەستنەوە بۆ پێکهێنانی پرۆتۆن بەئەندازەیەکی زۆر زیاترە لە هێزی کێشکردنی نێوانیان Gravitational force.

هەر کەموکورتیەك لە نێوان هەردوو هێزەکەدا، زۆر لە تەمەنی گەردوون کەمدەکاتەوە و، قەبارەی گەورەترین گیانلەبەر بۆ قەبارەی مێرووەکان بچوکدەکاتەوە، یان وای لێدەکات گەورە ببێت و بناوسێت تا دەتەقێت.

**شەشەم:** بنچینەی بۆشایی گەردوونی بە شێوەی سێ دوورییە، کە گونجاوە بۆ ژیان، بەو پێیەی ئەگەر گەردوونەکەمان دوو دووری یان چوار دووری بوایە، ئەوا بۆ ژیان گونجاو نەدەبوو.

(مارتن ریز) جەختی لەسەر شتێکی زۆر گرنگ کردۆتەوە، ئەویش ئەوەیە کە بەهای ئەو شەش بنچینەیە لە دیاریکردنیدا هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نییە.

کەواتە ناکرێ بانگەشەی ئەوە بکرێت کە پەیدابوونی یەکێك لەو بنچینانە بە ڕێکەوت بۆتە هۆی پەیدابوونی بنچینەکانی تر بە بەها گونجاوەکانیان.

سەرەڕای ئەو بنچینانەی ریز خستونیەتەڕوو، توێژەرانی تر دەیان بنچینەی تریان خستۆتەڕوو، کە ئەگەر ئەو بنچینانە نەبوونایە ئەوا درووستبوونی ژیان نەدەبوو، لەوانە:

**یەکەم:** لە ساتەکانی سەرەتای دوای تەقینەوە گەورەکەی گەردوون، بەشێك لە وزەی گەردوونە نوێکە گۆڕاوە بۆ تەنۆلکەکانی ماددە (کوارك و ئەلیکترۆن) و دژە تەنۆلکەی ماددە (دژە کوارك و دژە ئەلیکترۆن)، کە بە یەکگەیشتنی تەنۆلکەکانی ماددە و دژەکانی بۆتە هۆی لەناوچوونی هەردووکیان.

تەنۆلکەکانی مادده لە دژەکانی زیاتر بوون بە ئەندازەی تەنۆلکەیەك بۆ سێ ملیۆن تەنۆلکە، لەو زیادمیەش لە کوارك و ئەلیکترۆنەکان ئەندازەی پێویستی بۆ درووستبوونی گەردوون فەراهەم کردووە.

**دووەم:** ئەگەر ئەندازەی بارگەی ئەلیکترۆنەکان (کە لە دەوری ناوکی گەردیلەدا دەخوولێنەوە) لەو دۆخەی ئێستای جیاواز بوایە، ئەوا ئەو یەکگرتنە ناوەکییە لە نێوان گەردیلەکانی هایدرۆجین لە ئەستێرەکاندا (لەناویشیاندا خۆر) ڕووینەدەدا و، هیچ وزەیەك لەو ئەستێرانە پەیدا نەدەبوو.

**سێیەم:** بارستایی پرۆتۆن ١٨٣٦ ئەوەندەی بارستایی ئەلیکترۆنە، ئەگەر ئەو ڕێژەیە گۆڕانکاری بەسەردا هاتبا، ئەوا گەردیلە و تەنۆلکەی مادده بوونیان نەدەبوو.

**چوارەم:** پێکهاتنی ڕەگەزی کاربۆن ڕەگەزێکی بنچینەیی و بێ جێگرەوەیە بۆ درووستبوونی ژیان. چونکە کاربۆن بە نەرمی پەیوەندی نێوان گەردیلەکانی ناسراوە، کە ڕێگە دەدات لەگەڵ گەردیلەکانی ئۆکسجین و هایدرۆجین و نایترۆجین و گۆگرد یەکبگرێت، بۆ پێکهێنانی ئاوێتەی ماددەی زیندووی ئەندامی وەك پرۆتین و ترشە ناوکییەکان.

ئەگەر بە نزیکترین ڕەگەزەکان لێیەوە بەراورد بکەین، کە سلیکۆنە، دەبینین ئەوەی دوایی ناتوانێت هیچ ئاوێتەیەکی ئەندامی پێکبێنێت، ئەمەش بە هۆی توندی پەیوەندی نێوان گەردیلەکانی.

**پێنجەم:** جۆن بارۆ John Barrow بیست و پێنج نەگۆڕی بنچینەیی دیاریکردووە، کە بنچینەی گەردوون لەسەری وەستاوە (وەك خێرایی ڕووناکی - نەگۆڕی بلانك - سفری گەرمی ڕەها..)، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە هەر کەموکەرپییەك لە بەهای یەکێك لەم نەگۆڕانەدا ڕوویبدایە، ڕێگای بەوە نەدەدا کە گەردوون جێگیر ببێت و ژیان درووست ببێت.

ئایا هێشتا گومانێك بوونی هەیە لەسەر ئەوەی کە گەردوون بەپێی ئەندازەی مرۆڤ درووستکراوە ؟! کەواتە با سەرنجی ماڵەکەمان بدەین.

**هاوسەنگی سەرسوڕهێنەری گونجاو بۆ ژیان لەسەر هەسارەی زەوی**

تیرەی هەسارەی زەوی نزیکەی (٦٤٠٠کم) ە و، چێوەی نزیکەی (٤٠٠٠کم) ە و ناوەڕۆکی زەوی لە پارچەیەك ئاسن پێکهاتووە، بەهۆی بوونی گەرمیەکی زۆر گۆڕاوە بۆ تۆپێکی ڕەق، بەهۆی ئەوەی پاڵەپەستۆیەکی زۆری خراوەتە سەر و، چینێکی ئاسنی تواوە دەوری ئەو تۆپەی داوە.

ئەستووری توێکڵی زەوی نزیکەی ٢٠کم و، لە چەند چینێك پێکهاتووە کە بەسەر یەکەوەن و تێکهەڵکێشن، لەسەر ئەو چینانەش چینێکی تری نەرمتر هەیە پێی دەوترێت بەرگ Mantle.

**قەبارە و هێزی کێش کردنی زەوی...**

ئەگەر قەبارەی هەسارەی زەوی بچوکتر یان گەورەتر لە قەبارەی ئێستای بوایە، ئەوا ژیان لەسەری شتێکی مەحاڵ دەبوو.

بۆ نموونە ئەگەر زەوی ئەوەندەی مانگ بوایە، ئەوا هێزی کێش کردنەکەی یەك لەسەر شەشی هێزی کێش کردنەکەی ئێستای دەبوو و، نەیدەتوانی هەڵمی ئاو و هەوای دەوری دەستپێوە بگرێت، واتە بەرگە هەوا هەڵدەوەشا، ئەمەش لەسەری پێویست دەکات کە بەشەو ساردی زیاتر ببێت بۆ ئەوەی هەرچی لەسەر زەوی هەیە بیبەستێت و، بەڕۆژ گەرمییەکەی زیاتر ببێت و هەرچی لەسەریەتی بسووتێت (وەك ئەوەی لەسەر مانگدا ڕوودەدات، کە هیچ بەرگە هەوایەکی لە دەوردا نییە)[1].

بەهەمان شێوە ئەگەر بەرگە هەوای زەوی چڕتر بوایە لەو ئەندازەیەی ئێستای، ئەوا ڕۆژانە نەیزەکەکان دەکەوتنە سەر زەوی، بەخێرایی هەشتا کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا و هەرچی لەسەریەتی دەیسووتاند و، زەوی لە ماوەیەکی کەمدا وەك بێژینگی لێدەهات.

---

(١) بەرگە هەوای زەوی ڕێگا دەدات کە ئەندازەیەکی دیاریکراو لە تیشکی خوار سوور تێپەڕبێت، کە لە ڕۆژدا کەش و هەوای زەوی گەرم دەکات، هەروەها بەرگە هەوا هەندێك لەو گەرمیە بۆ شەوان گل دەداتەوە Green House Effect.

بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر تیرەی زەوی دوو ئەوەندەی تیرەی ئێستا بوایە، ئەوا هێزی کێش کردنیش دوو ئەوەندە دەبوو و، بەرگە هەوای دەکشا (بە ئەندازەی نزیکەی ١٢٠کم)، بەمەش هەر ئینجێکی چوارگۆشە فشاری لەسەر زیاد دەبوو و، لە حەوت کیلۆگرامەوە دەبوو بە چواردە، ئەمەش خراپترین کاریگەری لەسەر گیانەوەران درووستدەکرد.

هەرچی گەورە بوونی قەبارەی زەوییە بۆ قەبارەی خۆر بۆ نموونە، ئەوا هێزی کێش کردنی سەد و پەنجا جار زیاد دەبوو و، بەرگە هەوای دەکشا بۆ ئەستوری تەنیا حەوت کیلۆمەتر و، فشاری هەوایی لەسەر هەر ئینجێکی چوارگۆشە دەبوو بە (تەن)ێکی تەواو، بەمەش ئەو ئاژەڵەی کێشەکەی یەك کیلۆگرامە - لە ژێر چڕی هەوای ئێستادا - دەبوو بە پەنجا کیلۆگرام،هەروەها قەبارەی لاشەی مرۆڤ (ئەگەر لەو بارودۆخەدا توانای پەیدابوونی هەبوایە) ئەوەندەی قەبارەی مشکێکی گەورەی لێدەهات و، بەمەش مەحاڵ بوو عەقڵی مرۆڤ بەم شێوەیەی ئێستا بوایە، چونکە ئەو شێوەیەی ئێستای مۆخ نابێت لە کێشێکی دیاریکراو کەمتر بێت.

**خولانەوەی زەوی...**

زەوی بە خێرایی (١١٠٠٠٠) کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا (٣٠کم لە چرکەیەکدا) بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە، بگرە خەریکە فڕێمان بداتە بۆشایی ئاسمان، باشە ئێمە چۆن لەسەر زەوی جێگیرین لە کاتێکدا بەو خێراییە دەخولێتەوە؟! لێرەدا چاکە بۆ هێزی کێش کردنی زەوی و پەستانی هەوای دەوروبەرمان دەگەڕێتەوە.

زەوی هەموو ڕۆژێك خولێك بە دەوری خۆیدا لێدەدات بە خێرایی (١٧٦٠) کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا. ئەگەر ئەم خێراییە بۆ پێنج سەد کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا کەم ببێتەوە، ئەوا شەو و ڕۆژمان دە ئەوەندی ئێستا درێژتر دەبوو. هەروەها وا پێویستی دەکرد کە گەرمی خۆر هەموو شتێکی سەر زەوی بسووتێنێت و، دوای ئەوە هەرچی دەمایەوە ساردی سەختی شەوی درێژ لەناوی دەبرد.

**لاری تەوەرەی زەوی.**

زەوی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە بە گۆشەی لار بە دەوری تەوەرە ئاسۆییەکەی بە ئەندازەی ٢٣،٤٥ پلە، کە وەرزەکانی ساڵی لێوە پەیدا دەبێت، بەمەش زۆربەی ناوچەکانی سەر زەوی بە درێژایی ساڵ شیاون بۆ کشتوکاڵ و نیشتەجێ بوون.

ئەگەر زەوی ئەو لارییەی نەبوایە، ئەوا تاریکی هەردوو قوتبەکەی بەدرێژایی ساڵ دادەپۆشی و، هەڵمی ئاوی دەریاکان بە باکور و باشوردا دەڕۆیشت و، جگە لە شاخی بەستەڵەك و بیابانی وشك و دووروودرێژ لەنێوان هەردوو قوتبەکەدا هیچی تر لە زەوی نەدەبوو؛ ئەمەش ژیانی لەسەر زەوی دەکردە شتێکی مەحاڵ.

**پلەی گەرمی زەوی...**

پلەی گەرمی سەر ڕووی خۆر حەوت هەزار پلەی سەدییە و، مەودای نێوان خۆر و زەویش نزیکەی (١٦٥) ملیۆن کیلۆمەترە. ئەگەر زەوی نیوەی ئەو مەودایە لە خۆر نزیك بوایەتەوە ئەوا ئەو لاپەڕەیەی ئێستا لەبەر دەستە ڕاستەوخۆ گڕی دەگرت. ئەگەر مەوداکەش دوو ئەوەندەی مەودای ئێستای دوور بوایە، ئەوا ساردی زۆر ژیانی لەسەر زەوی نەدەهێشت.

ئەگەر لە جیاتی خۆر ئەستێرەیەکی تر، کە پلەی گەرمییەکەی چەند جارێك لە خۆر زیاتر بێت (ئەو جۆرە ئەستێرانە زۆر زۆرن)، ئەوا زەوی دەبوو بەکوورەیەکی زۆر گەرم.

**توێکڵی زەوی و دەریاکان...**

ئەگەر ئەستووری توێکڵی زەوی بە ئەندازەی سێ مەتر لە ئەستووری ئێستا زیاتر بوایە، ئەوا ئۆکسجینی لە هەوادا هەڵدەمژی و، بەبێ ئۆکسجینیش ژیانی گیانلەبەران مەحاڵە.

بە هەمان شێوە ئەگەر قوڵی دەریاکان چەند مەترێك لە قووڵی ئێستادا قوڵتر بوایەن، ئەوا دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و ئۆکسجینیان هەڵدەمژی، بەمەش ژیانی ڕووەك مەحاڵ دەبوو، سەرەڕای مەحاڵی ژیانی گیانلەبەران.

**بەرگی پارێزەری زەوی...**

هەسارەی زەوی بە سێ بەرگی پارێزەر دەورەدراوە. بەرگی دەرەکی بریتییە لە (بواری موگناتیسی) کە زریانە خۆرییەکان دەداتەوە، کە بەسەر هەموو هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆردا هەڵدەکەن[1] کە توانای لەناوبردنی هەموو ژیانێکی سەر ڕووی زەوییان هەیە.

بەرگی دووەم چینی ئۆزۆنە[2] کە زەوی لە تیشکە زیانبەخشەکانی گەردوون دەپارێزێت.

هەروەها بەرگە هەوا (کە پێشتر باسمان کرد) بەرگی سێیەمە. ئۆکسجینیش ٢١٪ لە گازەکانی پێکهاتەی بەرگە هەوای نزیکی زەوی پێکدێنێت، ئەگەر ئەو ڕێژەیە بە ئەندازەی دوو ئەوەندە زیاد بکات ئەوا ئەگەری سووتانی زیاتر دەبوو و ئاگرەکانی بۆ خۆی ڕادەکێشا. هەروەها (تیشکە کیمیاییەکانی خۆر Actinic Rays) ناتوانن ئەم بەرگە هەوایە ببڕن، تەنیا بە ئەندازەی پێویست نەبێت بۆ ژیانی ڕووەك و دروستکردنی ڤیتامین (D) لە لاشەی مرۆڤدا و لەناو بردنی بەکتریا زیانبەخشەکانی و هەندێك لە سوودەکانی تری!!

**موعجیزەی ئاو...**

زەوی تاکە هەسارەی کۆمەڵەی خۆری ئێمەیە کە ئاوی بە هەرسێ دۆخەکە تێدایە (گاز - شل - ڕەق).

هەروەها ئاو تاکە شلەیە کە بە بەستن چڕیەکەی کەمدەکات! لەبەر ئەوە سەهۆڵ لە سەر زەویدا دەتوێتەوە. لە هەردوو بازنەی بەستەڵەکی باکور و باشوردا سەهۆڵ ئاوی ژێرەوەی گل دەداتەوە، بۆیە پلەی گەرمییەکە لە خوار پلەی بەستن دایە و ماسی و گیانلەبەرە ئاوییەکان هەر لە ژیاندا دەمێننەوە.

---

(١) ئەو زریانە لە پرۆتۆنی بارگە موجەب و ئەلیکترۆنی بارگە سالب پێکهاتووە.

(٢) گەردی ئۆزۆن لە سێ گەردی ئۆکسجین پێکهاتووە $O_3$.

ئاو بە شێوەیەکی نموونەیی کاردانەوەی لەگەڵ دیاردەی تایبەتەمووین Cappillarity دا هەیە، کە موعجیزەیەکە لە شێوەی یاسای سرووشتیدا، چونکە ڕێگا بە ئاو دەدات بەرەو بەرزترین چینی خاکدا بەرزببێتەوە، هەروەك چۆن ڕێگەی پێدەدات لە قەدی دارەکاندا لە ڕەگەوە بەرەو گەڵاکان بە پێچەونەی هێزی کێش کردنی زەوی بەرزببێتەوە[1].

**خوێنەری بەڕێز...**

هەر بازێك کە زانست هەڵیدەدات دەچێتە سەر بەڵگەی (دیزاینی زیرەك) و ڕاستی (بەڵگەی گەردوونیی) دووپات دەکاتەوە، هەروەك چۆن بە شێوەیەکی زیاتر ئاماژە بۆ درووستی (بنچینەی مرۆیی) دەکات. تەنانەت هەنگاوە زانستییەکان، لە یاسای جوڵەی (نیوتن)ەوە تا دەگاتە پەیوەندی نێوان بارستە و وزەی (ئەنیشتاین) و تا دەگاتە خاسیەتەکانی گەردیلە و تەنۆلکەکانی خوار گەردیلەیی (فیزیای چەندی) تا دەگاتە بنچینەی DNA و تا دەگاتە مۆخ و نهێنییەکانی.. دووری و قووڵی گەورەتر و گەورەتری ئەو سێ چەمکەمان بۆ ئاشکرا دەکەن.

ئەگەر نەیارانی (بنچینەی مرۆیی) بە تەنیا بوونمان لە گەردووندا بە بەڵگەیەکی سرووشتی بۆ شیاوی بنچینەی گەردوون بۆ دروستبوونی ژیان بزانن و، پاشان بڵێین شیاوی گەردوون بەڵگە نییە لەسەر بوونی شتێکی غەیبی، ئەوا دوو شت بخە بەردەم ئەو نەیارانە:

یەکەم، جیهان بە تەنیا بۆ دروستبوونی ژیان ئامادە نەکراوە، بەڵکو بۆ دروستبوونی بوونەوەری زیندووی زیرەکی لۆژیکی ئامادەکراوە، کە لەو گونجاوییە تێدەگات.

پرسی دووەم، ئەوەیە کە ئەو گونجاوییە زۆرەی لە گەردووندا هەیە زۆر زیاترە لە پێداویستی گیانلەبەران و خۆشگوزەرانی و چێژێکی تایبەتی بۆ ڕەخساندووە،

---

(١) بایۆلۆژییەکان ڕێژەی ئەو ئاوەی کە بە درەختێکی سی مەتریدا سەردەکەوێت بە ٤٠٠ لیتر لە کاتژمێرێکدا مەزندە دەکەن. دەتوانی بۆ پێشبینی کردنی ئەندازەی وزەی پێویست و ئەو ژاوەژاوەی لە ترومپاکان پەیدا دەبێت بۆ ئاودانی دارستانێك بکەی، ئەگەر سرووشتی نەبوایە چ هەرایەکی دەنایەوە.

به تایبەتی مرۆڤی خاوەن چەندان پێداویستی دەروونیی جیاواز، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە گونجاوییەکی کەمتریش بەس بوو بۆ درووستبوونی ژیانی ئەو گیانلەبەرانە.

دوای تێگەیشتن لەو دوو لایەنەی گونجان، لایەنگرانی (بنچینەی مرۆیی) ناوی (بنچینەی بەهێزی مرۆیی Strong Anthropic principle)ی لێدەنێن، ئەوە لە بەرامبەر زاراوەی (بنچینەی مرۆیی لاواز)ە کە بە تەنیا ئاماژەیە بۆ چەمکی (ئێمە هەین، کەواتە گەردوون گونجاوە).

سەرەڕای ئەوەش، ماددیگەراکان (هەروەك چۆن لە سەرەتای تەوەرەکەدا باسمانکرد) چەمکی بنچینەی مرۆیی ڕەتدەکەنەوە و، تەنانەت باوەڕبوون بەئامانجدارێتی Teleology بەدەرچوونێکی ئاشکرا لە زانست دەزانن، کە توانیویەتی لێکدانەوەیەکی فیزیایی بۆ هەموو دیاردە سرووشتییەکان بکات، کە بەلای ئەوانەوە هیچ بوارێك بۆ لێکدانەوەی ئامانجداریی بوون ناهێڵێتەوە و، ئەوەش وەك بە هانەیەك بۆ نکۆڵیکردن لە بوونی خودایی دەزانن.

به خستنەڕووی دوو چەمك وەڵامی ئەو گومانانەی لە مێشکی بێباوەڕاندایە دەدەینەوە، دەربارەی بەڵگەی گەردوونی و بنچینەی مرۆیی، کە لەو دوو چەمکەدا دەرچوون لە زەلکاوی گومان و بێباوەڕی بەدی دەکەین.

**چەمکی یەکەم:** نابێ وا بیربکەینەوە کە بە تەنیا لێکدانەوەی خۆکار (فیزیایی) لێکدانەوەی زانستییە. چونکە ئەگەر لێکدانەوەی خۆکار ڕووبەڕووی (چۆن) How? ببێتەوە، کە زانست لێی دەکۆڵێتەوە، ئەوا لە ڕووی عەقڵییەوە لەگەڵ لێکدانەوەی ئامانجی بۆچی Why? تێکنا گیرێت کە بەدیهێنەری گەردوون و مرۆڤ مەبەستیانە.

با نموونەیەك لەسەر ئەوە بێنینەوە: پیاوێك بەسەر چیایێکدا سەردەکەوێت و، خەڵك دەربارەی پرسیار دەکەن. لێرەدا دوو وەڵامی جیاواز هەن. یەکەمیان، بۆ ئەوە سەردەکەوێت کە دیمەنە سرووشتییەکان لەسەر چیاوەکەوە سەیر بکات، کە ئەمە لێکدانەوەیەکی ئامانجییە بۆ دیاردەکە؛ چونکە ئەو ئامانجەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە پیاوەکە بۆی بەسەر چیاکە دەکەوێت.

هەرچی وەڵامی دووەمە، ئەوە زنجیرەیەك هۆكار و ئەنجامەمان بۆ دەخاتەڕوو كە هەنگاوەكانی پیاوەكەی بۆ دەنرێت: چونكە ئەو خواردنەی خواردوویەتی سەرچاوەی وزەكەیە كە كۆئەندامی جوڵە سوودی لێوەرگرتووە، پاشان لایەنێكی دەرەكی ئەو وزەیەی بەكارهێناوە، ئیتر ماسوولكەكانی پیاوەكە گرژبوون پاشان خاوبوونەتەوە پاشان گرژبوون و پاشان خاوبوونەتەوە، تا لە كۆتاییدا لاشەكەیان گەیاندۆتە سەر چیاكە، ئەمەش لێكدانەوەی خۆكار یان میكانیكییە، لێكدانەوەیەكە ڕووداوەكە لە دواوە پاڵدەنێت، لە كاتێكدا لێكدانەوەی ئامانجیی لە پێشەوە ڕووداوەكە ڕادەكێشێت.

لەبەر ئەوە هیچ هەڤدژییەك لە نێوان دوو لێكدانەوەكەدا بەدی ناكەین و، بەهیچ جۆرێك بوونی یەكێكیان نیشانەی نەبوونی ئەوی دیكەیان نییە (هەروەك بێباوەڕان وای دەبینن). چونكە زۆربەی كاروبارەكانی ژیانمان دوو هۆكار هەڵیاندەسوڕێنن: خواردنی خۆراك، كە ئامانجداری و خۆكاری تێدایە. خواردنی دەرمان دیسان ئامانجداری و خۆكاری تێدایە، لێخوڕینی ئۆتۆمبێل...

گرنگترین هەڤدژی، كە لە نێوان عەقڵی سەردەمەكانی ناوەڕاست و سەردەمی ئێستادا هەیە، ئەوەیە، كە یەكەمیان ئایینی مەسیحی دەستی بەسەردا گرتبوو، كە بەئامانجداری بەسترابووەوە، هەرچی دووەمیانە ئەوا خۆكاریی دەستی بەسەردا گرتبوو.

لە ڕاستیدا جیاكردنەوە، پاشان كۆكردنەوەی لێكدانەوەی ئامانجی و لێكدانەوەی خۆكاریی گرنگییەكی زۆری هەیە بۆ تێگەیشتن لە مێژووی هزری مرۆڤایەتی و تێگەیشتن لە هەموو ژیان و، لە كۆتاییدا زانینی ئامانجی بوونمان.

**چەمكی دووەم:** هەندێك كەس دەڵێن، ئەگەر دان بە بوونی خودا بنێین كە گەردوونی بە دیهێناوە و، هێز و یاساكانی بۆ لە سرووشتدا داناوین، ئەوا چ پێویست بەوە دەكات بڵێین - كە خودا هەڵساوە بەڕێكخستنی گەردوون و ڕاییكردنی یەك بە یەكی كاروبارەكانی؟

فەیلەسووفەكانی یۆنان (لە سەرووی هەموویانەوە ئەرستۆ) بەر لە هەمووان ئەو چەمكەیان خستۆتەڕوو. دەڵێن كە خودا دوای ئەوەی گەردوونی درووستكردووە و،

ڕێکی خستووە و بە شتێکەوە خەریك بووە کە لە گەورەیی بوەشێتەوە، بە خۆیەوە خەریك بوو. فەیلەسووفەکان بەو پاکڕاگرتنەی خودا لە سەرقاڵ بوون بە جگە لە زاتی خۆی، لە بەدیهێنراوەکانی دابڕیوە و، کردوویانە بە خودایەك کە هیچ گرنگی لە ژیانی ئێمەدا نەبێت.

بەڵام ئایینە ئاسمانیەکان ئەم دەرگایەیان بە ڕووی گومانکاراندا داخستووە، هەروەها بە ڕووی ئەوانەشدا کە دارەکە لە ناوەڕاستەوە دەگرن، ئەو ئایینانە بۆیان ڕوونکردووینەتەوە کە خودا بە درێژایی کات کاری بوونەوەر بەڕێوە دەبات، لە ڕێی یاساکانەوە بۆ نموونە هێزی کێشکردن بەخۆی کارناکات، بەڵکو خودا هەموو ساتێك وزەی پێدەبەخشێت، هەموو یاسا سرووشتییەکانی دی بە هەمان شێوە.

ئەگەر خودا بەردەوام (بوون) بەڕێوە نەبات، ئەوا هێزی کێشکردن و هێز و یاساکانی تر لە کار دەکەون، بەڵکو سرووشت خۆشی تووشی داڕمان دەبێت. واتا هێشتا خودا بەردەوامە لە درووستکردنی سرووشت و یاساکانی و، هەر ساتێك سەر لەنوێ بە شێوەیەکی بەردەوام درووستی دەکاتەوە.

گومان لەوەدا نییە کە ئەو دوو چەمکە بەیەکەوە هەردوو لێکدانەوەی ئامانجیی و خۆکار بەیەکەوە کۆدەکەنەوە و، زۆربەی ئەو هەڤدژییە ڕووکەشەی لە نێوان دیدی ئایین و دیدی زانست هەیە بۆ بوون چارەسەری دەکەن.



## باسی سێیەم: هزری ئایینی لە تەرازوودا

پسپۆڕانی بواری سەرهەڵدانی دینداریی و مێژووی دەرکەوتنی دینداریی وای دەبینن کە چەمکە ئایینی و ئەخلاقییەکان بە شێوەیەکی سەرەتایی لەگەڵ مرۆڤدا سەریان هەڵداوە، پاشان وردە وردە گەشەیان کردووە و بەرەو تەواوبوون ڕۆیشتوون، لە کاتێکدا کە لە ڕووکەشی دەقە ئایینیە ئاسمانیەکان بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو چەمکانە هەر لە سەرەتادا بە تەواوی پەیدابوون و مرۆڤ هەر لە کاتی درووستبوونیەوە پەیوەندییەکی ئاشکرای لەگەڵ خودا هەبووە (گفتوگۆی نێوان خودا و ئادەم)، لەبەر ئەوە پێویستە هەوڵ بۆ ئەوە بدرێت کە گونجان لە نێوان ئەو چەمکە و زانستی ئایینەکاندا بدۆزرێتەوە.

### ئەفسانەکان (فەلسەفەی پێش فەلسەفە) :

**لە مەوسوعەی ئایینەکانی جیهاندا هاتووە:**

((هیچ کۆمەڵێکی مرۆڤ نییە - هەرچەندی سەرەتایی بێت - کە هیچ بیرۆکەیەکی دەربارەی بوونەوەر یان ئەو کیانانە نەبێت کە لە سەرەوەی سرووشتن)).

لە ڕاستیدا دەرکەوتنی هزری ئایینی لەلای مرۆڤ بەستراوە بە درووستبوونی عەقڵی و دەرککردنی بەوەی کە خوودێکی جیاوازی هەیە. بۆیە دەستی کرد بەپرسیارکردن و پێداگری کردن لەسەر ئەو پرسیارانە: ئایا ئەو بوونە بەدیهێنەرێکی هەیە؟ ئایا دوای مردن زیندوبوونەوە هەیە؟ چاکە و خراپە چین؟...

لەوکاتەی مرۆڤ دەستیکرد بە گەڕان بە دوای وەڵام بۆ ئەو پرسیارانە، بۆ ئەوەی ویستی پرسیارکردنی تێربکات و بتوانێت بە ئاشتی لەگەڵ خۆی و

ئەو بوونە نارِوونەدا بژی، بۆ ئەوەش هیچی لە بەردەمدا نەبوو جگە لە خەیاڵی بەرجەستەبوو لە ئەفسانەکاندا، کە پێشتر بۆ لێکدانەوەی دیاردە سرووشتییەکانی دەوروبەری پەنای بۆ بردبوو، بۆ نموونە بۆچی خۆر هەڵدێت و ئاوا دەبێت؟ هۆکاری لافاو چییە؟ بۆچی باران دەبارێت؟...

بەم شێوەیە ئەفسانە بووە هەوڵی سەرەتایی مرۆڤ بۆ لێکدانەوەی دیاردە سرووشتییەکان (لە بری زانست)، پاشان بۆ کردنە بیانوو بۆ بوونی و ڕەوشتیی و تێگەیشتن لە سرووشت و بەدیهێنەر (لە بری ئایین).

مرۆڤیش لە ئەزموونەکەیدا تەنیا وێنەی مرۆڤایەتی دەدی، بەتەواوی کاردانەوە و ڕەفتارەکانی (بە چاکە و خراپەکانی) تا ئەو ڕەفتارانە لە خودا بەرزەکانی (وەك: ئیزیس و ئۆزۆریس و زیۆس) داماڵێت، ئا بەم شێوەیە مرۆڤ خۆی پەرستووە بێ ئەوەی بیزانێت.

خەیاڵی مرۆڤ تێڕوانینی خستۆتەڕوو بۆ خودای نزمتریش لەسەر شێوەی ئاژەڵەکان، وەك گوێرەکەی ئەبیس لەلای فیرعەونەکان. هەروەها هەردوو شێوەکەشی تێکەڵ کردن لە(مرۆڤ و ئاژەڵ) جا خوایەکی وەك (ئەبولهەول)ی وێنا کرد، کە سەرەکەی سەری مرۆڤە و لاشەکەی لاشەی شێرە.

## فەلسەفە :

کاتێك عەقڵی مرۆڤ زیاتر پێگەیشت، دەرکی بەوە کرد کە تێڕوانینە ئەفسانەییەکانی جێگای گاڵتەجارِین، ئیتر زانیاری هەنگاوێك بەرەو فەلسەفە چووە پێشەوە.

فەلسەفەش (وەك ئەفسانەکان) بە گرنگیدان بە بنچینەی ماددی بوون (دروستبوون لە خاك، ئاو، هەوا، ئاگر) دەستیپێکرد. پاشان بە چارەسەرکردنی پرسیارە زانیارییە گشتگیرەکان، ئیتر سێ چەمکە سەرەکییەکەی فەلسەفە دەرکەوتن: بوون، زانیاری، ڕەوشت[1].

---

(١) بۆ زانینی پێناسەی فەلسەفە و بوارەکانی، سەرنجی بابەتی (بەرلەوەی ئەم کتێبە بخوێنیتەوە) بدە.

ئەگەر فەلسەفە دەستی هەندێك كەسی گرتبێت بۆ بۆچوونی بێ خەوش، وەك سوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ و ئەنتۆنی فلو، ئەوا لە بەرامبەردا فەلسەفە زۆر كەسی تری لە دەریای گومان و دوودڵیدا خنكاندووە[1].

تەنانەت بۆ ئەوانەش كە لە گەیشتن بە قسەی یەكلاكەرەوە دەربارەی دیاریكردنی ناسنامەی مرۆڤ و، واتای ژیان و، ئامانجەكانی بوونەوەر و، ناسینی بەدیهێنەر و پرسە فەلسەفیەكانی تر زۆر بە خراپی شكستیان هێنا.

## مرۆڤ لەگەڵ خودا و ئایین[2] :

پەیوەندی مرۆڤ بە خودا. پەیوەندییەكی سۆزدارییە
پەیوەندی مرۆڤ بە ئـــایین. پەیوەندییەكی عەقڵییە

### مرۆڤ و بوونی خودایی...

مرۆڤ پێویستی بە ئایین نییە تا هەست بە خودا بكات! چونكە هەستكردن بە بوونی خودا هەستێكی سرووشتییە و، خودا لە لایەنی سۆزداریی مرۆڤی داناوە. مرۆڤ هەڵدەستێت بە وەرگرتن (یان درووستكردن)ی لایەنی ئایینی وەك بنچینەیەكی بەرزتر لەو هەستەوە، ئەو هەست و سۆزە ئەوە ناكاتە مەرج

---

(١) گومان و دوودڵی، لە هەڵوێستی لە هەڵوێستی جان پۆل سارتەر، دامەزرێنەری فەلسەفەی بوونگەرایی بێباوەڕی دەردەكەوێت. چونكە كاتێك سارتەر لە مردن نزیك بووەوە، داوای لە هاوڕێكەی ژیانی سیمۆن دی بۆڤوار كرد كە قەشەیەكی بۆ بێنێت!، ئافرەتەكەش زۆری لەلا سەیربوو، نكۆڵی لەو داواكارییەی فەیلەسووف كرد و پێی وت لە جیاتی قەشە كاردینالێكت بۆ دێنم، گوتی نانا كاردینال مەهێنە، ئەوان فروفێڵ دەكەن، بڕۆ قەشەیەكی سادەی گوندێكم بۆ بێنە، قەشەكەی بۆ هێنا، سارتەر لە بەردەمیدا دانی بە هەموو هەڵە و شكستەكانیدانا، بەڵكو ڕزگاری بێت.

هەڵوێستی سارتەر لە هەڵوێستی فەیلەسووفی فەرەنسی بێباوەڕ ڤۆڵتێر نزیكە، كە لە كاتی سەرەمەرگدا داوای لە قەشەیەك كرد كە گوێ لە داننان بە هەڵەكانی بگرێت بەر لەوەی بمرێت، بەڵام قەشەكە ڕەتی كردەوە داوای لێخۆشبوون بۆ كەسێك بكات كە لە كڵێسای كاسۆلیكی دانی بە باوەڕەكەیدا نەنابێت! بۆیە ڤۆڵتێر توڕەبوو قەشەكەی كردە دەرەوە، پاشان بەیاننامەیەكی نووسی كە تێیدا هاتبوو: ((من لەسەر باوەڕبوون بە خودا و، خۆشەویستی هاوڕێكانم و ڕق لە دوژمنەكانم و ڕق لە ئەفسانە خزێنراوەكانی ناو ئایین دەمرم)).

(٢) ئەو چەمكانەی لەژێر ئەو ناونیشانەدان، لە كتێبی ئەندازیار دكتۆر محمد حوسەینی ئیسماعیل: (ئایین و زانست و كەموكوری عەقڵی مرۆڤ) دەرمهێناون. كە لەساڵی ١٩٩٩ چاپكراوە.

کە لایەنی ئایینی خاسیەتی دیاریکراوی بۆ خودا هەبێت، هەروەك چۆن ئەوەش پێویست ناکات کە ئامانج لە بوونەوەر ڕوون بکرێتەوە و، هیچ دۆخێك بە پەرستنی خودا بە مەرج ناگرێت، بەڵکو تەنیا وەك بنچینە داوای ئەوە دەکات کە بوونی خودا دووپات بکرێتەوە و تەواو.

لەبەر ئەوە، هەروەك چۆن ئەو هۆشیاریە سرووشتییە بە بوونی خودا بەهۆی بیروباوەڕی درووست و پەرستشی ڕاست پڕدەکرێت، بە هەمان شێوە بە بیروباوەڕ و پەرستشی بتپەرستی و سەرەتاییش پڕدەکرێتەوە، کە عەقڵ بە تەواوی لە تێڕامانی دوور دەخرێتەوە.

ئیسلام ئەوەمان پێدەڵێت کە خودا ئەو سرووشتەی بە خوودی خۆی لە دەروونی مرۆڤایەتیدا چاندووە، بەبێ بوونی هیچ نێوەندگیرییەك لە فریشتە یان پێغەمبەر، هەروەك قورئانی پیرۆز پێمان دەفەرموێت:

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾﴾

الأعراف: ١٧٢

هەروەها پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە بوونی پەیوەندی نێوان خودا و مرۆڤ بە پەیوەندییەکی سۆزداری و عاتیفی، واتای مەحاڵ بوون یان پێویست نەبوونی بەڵگەی عەقڵی لەسەر خودا ناگەیەنێت، ئەوەتا ئەو کتێبەی لەبەر دەستتدایە گەشتێکی عەقڵییە بۆ سەلماندنی ئەو بەڵگەیە.

**مرۆڤ و ئایین :**

خودا پەیوەندی مرۆڤ بە ئایینەوەی کردۆتە پەیوەندییەکی عەقڵی، کە دەکرێ عەقڵی مرۆڤ بەڵگەی لەسەر بێنێتەوە و، بیخاتەبەر شیکردنەوە و بەڵگەهێنانەوە و هەڵێنجان، هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴿١٧٤﴾﴾

النساء: ١٧٤

توێژینەوەکان وێکچوونێکی زۆر ئاشکرایان کردووە لە نێوان شێوازی ئایینی گەلە سەرەتاییەکان و گەلە لەوان پێشکەوتووترەکان، ئەوەش تەحەدداى ئەو بیردۆزە دەکات کە دەڵێت ئایین ڕەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و کلتوری و ماددییە، وەك ئەدەب و شیعر و هونەر و فەلسەفە.

کە دەڵێین: پەیوەندی مرۆڤ بە ئایین پەیوەندییەکی عەقڵییە، ئەوە ڕەتناکاتەوە مرۆڤ ئارەزووی بۆ فیترەتی ئایینێك هەبێت، ڕۆڵی عەقڵ لە ڕاستی و درووستی ناوەڕۆکە ئایینیەکان دەردەکەوێت لەبەر ئەوە پێویستە بە وردی و بەتوندی جیاوازی بکرێت لە نێوان هەستی سرووشتی (کە لە هۆشیاری بوونی خودا خۆی دەنوێنێت) لەگەڵ بیری عەقڵانی (کە لە دەرککردن بە ڕاستی و درووستی ناوەڕۆکە ئایینیەکان خۆی دەنوێنێت)، بۆ ئەوەی مرۆڤ ڕێگا ڕاستەکەی بەرەو خودا لە دەست نەدات، کە لە هەموو ئایینەکاندا ئامانجی ئامانجەکانە لە درووستکردنی مرۆڤدا.

## یەك ئایین، لە وێنەگەلی جیادا..

قورئانی پیرۆز پێمان دەڵێت کە ئایین (عەقیدە) بیروباوەڕ[1] و شەریعەت[2]ەوە، بیروباوەڕ لە هەموو ئایینە ئاسمانیەکاندا یەکە، بەڵام شەریعەت لە ئایینێکەوە بۆ ئایینێکی تر جیاوازی هەیە:

﴿ ۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ كَبُرَ عَلَى ٱلۡمُشۡرِكِينَ مَا تَدۡعُوهُمۡ إِلَيۡهِۚ ٱللَّهُ يَجۡتَبِيٓ إِلَيۡهِ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَن يُنِيبُ ١٣ ﴾ الشورى: ١٣

---

(١) بیروباوەڕ: هەموو پێغەمبەران لەسەری ڕێککەوتوون، هیچ پێغەمبەرێك نییە بانگەوازی قەومەکەی نەکردبێت (خودا بپەرستن، جگە لە خوودی ئەو هیچ خودایەکی ترتان نییە).

(٢) شەریعەت، ئەو یاسایانەی ژیانی مرۆڤ ڕێکدەخەن، ئەوەی خودا حەڵاڵی کردووە بۆیان حەڵاڵ دەکات و ئەوەی حەرامیشی کردووە لێیان حەرام دەکات و ئەوەی خودا پێی خۆشە فرمانیان پێدەکات و ئەوەشی کە ڕقی لێیە لێیان قەدەغە دەکات.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾ البقرة: ٦٢

﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى قَالُواْ نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٣﴾﴾ البقرة: ١٣٣

واتە: ئایین لە ئادەمەوە هەر یەکێکە، هەرچەندە شەریعەتەکانیش لەیەك جیابن (ئیسلام - مەسیحیەت - یەهودیەت).

زۆرێك لە فەیلەسووفە ڕۆژئاواییەکان ئەو ڕاستییەیان زانیوە، جۆرج بێرنارد شۆ باسی لێوە کردووە دەڵێت: یەك ئایین هەیە، کە لە زیاتر لە سەد وێنەوە پێمان گەیشتووە.

**لەبەر ئەوە ئایینەکان لە زۆر خاسیەت و چەمکدا هاوبەشن، گرنگترینیان:**

١- باوەڕبوون بە خودای ئەزەلی ئەبەدی، بەدیهێنەری بوون.

٢- خودا پێغەمبەرانی ناردووە تا خودا بە مرۆڤ بناسێنن و ئامانجی بوونیان بزانن.

٣- مرۆڤ کە پەیامی بۆ ڕەوانەکراوە، بوونەوەری هەڵبژێردراوی خودایە.

٤- چیرۆکی بوونی گەردوون و مرۆڤ هەیە.

٥- ئایین چیرۆکی غەیبی و ڕووداوی پیرۆز لەخۆ دەگرێت.

٦- ئایین سرووت و پەرستش لەخۆ دەگرێت، وەك نوێژ و ڕۆژوو.

٧- کاتێکی گونجاو بۆ بیرکردنەوە دیاریدەکات.

٨- شوێنی پیرۆزی هەیە کە سەردانی دەکرێت.

٩- ئایین باسی ژیانێکی تری نەمر دەکات، کە لەوێدا ڕۆحەکان لە خودا نزیك دەبنەوە.

١٠- ئایین سیستەمێکی ڕەوشت دیاریدەکات، کە بەدیهێنەر داوا لە بەندەکانی دەکات کە پێیەوە پەیوەست بن (ئامانجدارێتی) و لەسەر ئەوە لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات.

## ئایین چەمکێکی ڕێژەییە، یان ڕاستییەکی ڕەها؟

باسی ئەوەمان کرد کە یەك بیروباوەڕ و چەندان دیانەتی جیاواز هەن، هەروەها باسی ئەوەشمان کرد کە پەیوەندی مرۆڤ بە ئایینەوە پەیوەندییەکی عەقڵییە، کەواتە ئایا دەکرێ هەر ئایینێك بە تەنیا بخرێتە بەر لێکۆڵینەوە تا بە بەڵگە و ڕاستی بڕیار لەسەر ڕاستی و هەڵەیی بدرێت (واتە ڕاستییەکی ڕەهایە)، یان پێویستە ئەوە لە ڕێی بەراوردکرنی بێت بە ئایینەکانی تر (ئەمەش مانای وایە چەمکی ئایین بە ڕەهایی ڕاست نییە)؟

ڕاستی ئەوەیە کە ئایین حەقیقەتی ڕەهایە؛ بەو پێیەی دەکرێ بە شێوەیەکی بابەتیانە هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت، لە ڕێگەی هەڵسەنگاندنی سێ پێکهاتە سەرەکییەکەی (پەیام - پەیامبەر - خودا).

**پێکهاتەی یەکەم:** تایبەتە بە ناوەڕۆکی دەقی ئایینی و سرووشتەکەی، پێویستە دەقی ئایینی ڕاست بەم پێوەرانەی خوارەوە جیابکرێتەوە:

١- خودای بەدیهێنەر بە مرۆڤ بناسێنێت.

٢- ئامانجی بوونی مرۆڤ ڕوون بکاتەوە.

٣- چەمکە ئایینیەکان لە چوارچێوەی تێگەیشتنی عەقڵی مرۆڤدا بێت.

٤- ئایین بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەو چەمك و بیروڕایانە بێنێتەوە، کە دەیانخاتەڕوو.

٥- هیچ هەڤدژییەك لە نێوان چەمکە ئایینیەکاندا نەبێت، کە پەیامەکە دەیخاتەڕوو.

٦- دەقی ئایینی لەگەڵ یاسای سرووشتی ڕەوشتی مرۆڤ تێکنەگیرێن.

٧- چەمکە ئایینیەکان لەگەڵ چەمکە زانستییەکاندا تێکنەگیرێن.

٨- لە واقیعی ژیانی مرۆڤ جیانەبێت.

٩- واتای دەقی ئایینی لەگەڵ پێشکەوتنی ژیارستانی مرۆڤ بڕوات، چونکە هێشتنەوەی چەمکەکان لە کاتی هاتنەخوارەوەیاندا، واتا خودا پێشکەوتنی زانستی و ژیارستانی لەبەر چاو نەگرتووە.

**پێکهاتەی دووەم:** تایبەتە بە چەمکی پەیامبەر و سیفەتەکانی، پێویستە کە:

١- پەیامەکە چۆنیەتی بەدیهێنەر بە پەیامبەر و بوونەوەرەکانی دیاری بکات.

٢- پەیامەکە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە پەیامبەران بەرپرسن لە گەیاندنی پەیامی خودا، پەیامبەران بۆ ئەوە نەهاتوون کە خۆیان بناسێنن.

٣- پەیامەکە ئەوە دووپات بکاتەوە کە پەیامبەران ترۆپکی تەواوەتی سنووورداری مرۆڤن، بەو پێیەی ئەوان پێشەوای مرۆڤایەتین بۆ مرۆڤ. ئەمەش بەهۆی چەمکێکی زۆر بەرزتر لە چەمکی پاڵەوانانی گەلان لە داستان و ئەفسانەکاندا.

**پێکهاتەی سێیەم:** تایبەتە بە چەمکی خودا و سرووشتەکەی و، پێویستە ئایینی ڕاست ئەمانە لەخۆ بگرێت:

١- بەڵگەی حاشا هەڵنەگری خودای بەدیهێنەر لەسەر بوونی و، لەسەر سرووشتی بوونی لە دەروونی مرۆڤدا.

٢- وەسف کردنی خودا بە تەواویی و کەمالاتی ڕەها، بەوەی کە حیکمەت و توانای خودایی لە سەرووی حیکمەت و توانای مرۆڤایەتییە.

٣- لە کاتی خستنەڕووی سیفاتەکانی خودا هیچ چارمان نییە لە کاتی قسەکردنماندا هەر دەبێ ئەو وشانە بەکار بێنین کە بۆ مرۆڤ بەکاریان دێنین، وەك بوون و تووڕەیی و بەزەیی و بیستن و بینین. چونکە ئێمە هیچ کەرەستەیەکی ترمان لەبەردەستدا نییە تا تێڕوانینەکانمان دەربارەی خودا لێ دابڕێژین، ئەمەش لەلای زانایانی بیروباوەڕ بە (ویستی لێکچوون)ناسراوە، ئەوە بە هیچ جۆرێك ئەوە ناگەیەنێت کە خودا لە ئێمە دەچێت.

قورئانی پیرۆز بە شێوازێکی وا لەگەڵ ئەو هەڵوێستە مامەڵەی کردووە کە هەرچی هەڵە تێگەیشتنە نەیهێشتووە:

﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١ ﴾ الشورى: ١١

پەروەردگار شێوازی وێکچوون (بیسەری بینەر)ی بەکارهێناوە، بەڵام بەرلەوە ئاگاداری کردووینەتەوە کە ئەو وێکچوونە لە چوارچێوەی بە پاك و بێگەرد دانانی ڕەهایە (هیچ شتێك وەك ئەو نییە).

ئەو سێ بەندە هێڵە پانەکانن، کە دەکرێ لە ڕێیانەوە بەشێوەیەکی بابەتیانە حوکم لەسەر ڕاست و هەڵەی ئەو ئایینە بدەین کە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین. سرووشتییە، کە شوێنێك بۆ ئەو ئایینە نەبێت کە خودا بە سیفەتی مرۆیی نزم، یان سیفاتی بتپەرستی ئەفسانەیی وەسف بکات. یان کە لە شێوەی ئاژەڵێك یان شێوەیەکی ناحەز کە مرۆڤ لەو بە حیکمەتتر و زیرەکتر و بە تواناتر بێت. یان بە خواوەندێکی گەمژە و سەرەڕۆی دابنێت کە نەزانێت چی دەکات.

هەروەها شوێنێك بۆ ئایینێك نییە کە دەقە پیرۆزەکانی پێمان بڵێن کە پەیامبەرەکانی بکوژ و خوێنڕێژ و خیانەتکارن.

هەروەها شوێنێك بۆ ئایینێك نییە کە دەقەکانی پڕبن لە فاحیشە وخراپە لە نزمترین و قێزەونترین پلەی واتا دابێت.

بەر لە هەموو شتێك، شوێنێك بۆ ئایینێك نییە کە بەڵگەی عەقڵی ڕوون و تەواومان نەخاتە بەردەست بۆ بڕیاردان لەسەر ئەو پەیامەی هێناویەتی. ئیسلام ڕوونترین نموونەی بۆ ئەوە هێناوەتەوە، ئەوەتا قورئانی پیرۆز بە تەنیا بە بەڵگە هێنانەوە وازی نەهێناوە، بەڵکو تەحەددای کەسانی دی کردووە کە بەڵگەی عەقڵی لەسەر قسەکانیان بێننەوە:

﴿ وَمَن يَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرۡهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ١١٧ ﴾ المؤمنون: ١١٧

## ئایینە سەرەکییەکانی مرۆڤ :

دوای ئەوەی ئەو سێ پێکهاتانەمان خستەڕوو کە پێویستە ئایینی ڕاست لەسەری بێت (پەیام - پەیامبەر - خودا)، لێرەدا بە کورتی سێ ئایینە سەرەکییەکە دەناسێنین کە مرۆڤایەتی دینداری پێوەدەکەن. خوێنەر دەتوانێت خاسیەتە هاوبەشەکان ببینێت و، هەروەها خوێنەر دەتوانێت هەڵوێستی ئەو سێ ئایینە دەربارەی سێ پێکهاتە سەرەکییە هەڵسەنگێنێت.

### یەکەم: ئایینە ئاسمانییە یەکخواپەرستەکان

کە بریتین لە: ئیسلام، کە نزیکەی ملیار و نیوێك خەڵك موسڵمانن[1].

**مەسیحییەت:** کە نزیکە ٢ ملیار خەڵك دیانن.

**یەهودییەت:** نزیکەی ١٤ ملیۆن خەڵك جولەکەن.

سەرەڕای خاسیەتە گشتییەکان، ئایینە یەکخوا پەرستەکان لەم چەمکانەدا هاوبەشن:

- خودا گەردوون و هەموو بوونەوەرەکانی لە نەبوونەوە بە هێواشی (لە ماوەی شەش ڕۆژدا) هێناوەتە بوون.

- مرۆڤ بوونەوەرێکە بە دوانەیی جیادەکرێتەوە: لاشەیەکی ماددی و ڕۆحێکی نامادی لەناونەچوو.

- مرۆڤ لە بەهەشتدا درووستکراوە، بەهۆی بێفەرمانی کردنی خودا لە بەهەشت دەرکراوە.

- شەیتان خوتخوتەی بێ فەرمانی خودا بۆ مرۆڤ درووستدەکات.

- مرۆڤ زیندوو دەکرێتەوە، تا لەسەر کارەکانی حسابی لەگەڵدا بکرێت و، پاداشت یان سزا لە ژیانەکەی تردا وەربگرێت.

- لە سەردەمێکدا، لافاوێك هەبووە کە زەوی داپۆشیوە و خراپەکارانی لەناو بردووە.

---

(١) ئەو ژمارانە بە پێی ئاماری ساڵی ٢٠٠٧ن.

**لێرەدا بیرۆکەیەکی گشتی لەسەر هەریەك لەسێ ئایینە یەکخوا پەرستەکە دەخەینەڕوو:**

**١- ئیســـــلام :**

ئیسلام کۆتا ئایینی ئاسمانییە و کتێبە پیرۆزەکەی (قورئانی پیرۆز) لەسەر بەڵگەی عەقڵی و گفتوگۆکردن لەگەڵ سرووشتی ئایینی مرۆڤ دامەزراوە، لەبەر ئەوە بۆ هەموو جیهان لە هەموو کات و شوێنێك تا ڕۆژی قیامەت نێردراوە.

ئیسلام لەسەر سێ چەمکی سەرەکی: ئیسلام، ئیمان، ئیحسان[1] دامەزراوە.

**ئیسلام:** (بنى الإسلام على خمس: شهادة أن لا إله إلا الله و أن محمداً رسول الله، وإقام الصلاة، وإيتاء الزكاة، وصوم رمضان، وحج البيت لمن استطاع إليه سبيلاً)).

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شایەتیدان بەوەی کە هیچ خودایەك جگە لە (الله) نییە و (محمد) پێغەمبەری خوایە، پاشان نوێژکردن و زەکات دان و حەجیماڵی خوا ئەگەر توانا هەبوو.

لەبەر ئەوە مرۆڤ بە شایەتیدانی بۆ خوایەتی خودا و پێغەمبەرایەتی محمد دێتە ناو بازنەی ئیسلام. مرۆڤی موسڵمان هەموو سیفەتێکی تەواوەتی و پاکی دەداتە پاڵ خودا و، هەموو سیفاتێکی کەماڵ و تەواوەتی مرۆڤ دەداتە پاڵ پێغەمبەری خودا.

**ئیمــان:** (أن تؤمن بالله، وملائكته، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، والقَدَر خيره وشره).

واتە: باوەڕت بە خودا و فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی و قەدەری چاك و خراپ هەبێت.

ئەو شەش پایەیە بابەتە غەیبییەکانن کە پێویستە لە دڵی مرۆڤی موسڵماندا جێگیر ببن بۆ ئەوەی ژیانی بەجۆرێك بێت کە ئەو ئیمانەی دووپات بکاتەوە، چونکە ئیمان بریتییە لەو هەستەی لە دڵدا چەسپیوە و بە کردار بسەلمێنرێت.

---

(١) ئەو سێ چەمکە لە فەرموودەی پێغەمبەری خودادا هاتوون کە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە.

**ئیحسان:** (أن تعبد الله كأنك تراه، فإن لكم تراه فإنه يراك).

واتە: خوا بپەرستی وەك ئەوەی بیبینی، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینیت ئەو تۆ دەبینێت.

ئەو سێ چەمکە سەرەکیانەی ئیسلامی لەسەر بنیاتنراوە وەك ڕێبازێکی گشتگیری ژیان، لە ڕێگەی قورئانی پیرۆز و فەرموودە پیرۆزەکانەوە هێڵەکانی پانی دیاری دەکرێن.

**٢- یەهـودییـەت :**

ئایینی یەهودیەتی کتابی[١] باوەڕی بەوە هەیە کە خودا گەلی جولەکەی هەڵبژاردووە تا زاتی خۆی بناسێنێت بۆ ئەوەی بە ڕێگەی خوادا بڕوات، جا گەلی جولەکە ببێتە ڕووناکی بۆ گەلان و خەڵك لە ڕێی ئەوانەوە خودا بناسن[٢]. ئایینی جوولەکە دامەزراوە لەسەر:

١- ئەو پەیمانەی خودا لە باوکەکانی وەرگرتووە لە (ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب) و موسا و گەلەکەی لە کاتی چوونەدەرەوەیان لە زەوی میسر[٣]، و ئەسپاردەی کردن کە بیپارێزن. بەڵام گەلی جوولەکە زۆربەی کات بە یاخیبوون و لە فەرمان دەرچوون وەڵامیان داوەتەوە.

٢- بەهۆی پیرۆزی ڕەهای خودا و لەبەر ئەوەی خودا ڕقی لە خراپەیە، بۆیە هەر کەسێك کە خراپە بکات دەکەوێتە ژێر توڕەیی خودا و تاوانباری دەکات و نەفرەت و مەینەتی بۆ زەوی دێنێت، ئەوەش دادگەری خودایە.

٣- بۆ ئەوەی لە تاوانەکە ڕزگار ببین (تاوانی بە ئەنقەست و هەڵە و تەنانەت تاوانی دەروونیش[٤])ئەوا ئێمە هەردەم پێویستیمان بە سەرەتایەکی نوێ هەیە،

---

(١) یەهوودیەتی کیتابی باوەڕی بە هەموو پەیمانە نووسراوە کۆنەکان هەیە، کە تەورات و (پێنج کتێبەکەی موسا)ن سەرەڕای ئەوەی بە کتێبی پێغەمبەرانی تر ناسراوە.

(٢) أسعيا ٤٢.

(٣) تثنية ٣:٥.

(٤) مزمور ١٢:١٩.

لەسەر[١] بنچینەی سیفاتەکانی خۆشەویستی و بەزەیی و لێخۆش بوون، بە تەنیا بۆ گەلی (جولەکە) نا، بەڵکو بۆ هەموو گەلان[٢]، چونکە ئەو (خودا) زۆر بەبەزەییە و تووڕەیی هێواشە.

ڕزگاربوون لە تاوانەکە لەسەر چاکبوونی مرۆڤ بنیات نەنراوە[٣]، بەڵکو دەکرێ قوربانی وەك نیشانەی کەفارەت و پاك بوونەوە لە تاوانەکان پێشکەش بکرێت. بەناوبانگترین دۆخی قوربانی پێشکەشکردنیش قوربانی پێشکەشکردنەکە لە ڕۆژی (الكفّارة)[٤]، لەو ڕۆژەدا دوو قوربانیەکەی کاهین پێشکەش دەکرێت وەکو ڕەمزێك بۆ کەفارەتی خۆیی و خێزانی و گەلەکەی.

٤- شەریعەت (فەرز و حوکمەکان) ئەو بنچینەیەن کە لادان لێیان هەڵە و تاوانە و، خودا بۆ ئەوە بە گەلی جولەکەی بەخشیوە تا کار بە هەموو بڕگەکانی بکات[٥]، پاراستنی وەسیەتەکان ڕێگای خێر و بەرەکەتە.

٥- ئامانجی باوەڕی جولەکە بەدیهێنانی بەڵێنەکانی خودایە. لەبەر ئەوە پەیمانی کۆن پڕە لە بەڵێن و پێشبینیی و نبووات دەربارەی مەسیا (ڕزگارکەر) و، هەروا چەند نبوواتێك هەن دەربارەی ئەو پەیمانە نوێیەی خودا لەگەڵ جولەکەی دەبڕێتەوە جا شەریعەتی لەسەر دڵیان نووسیوەتەوە نەك لەسەر بەرد و، هەڵەکەیان دەسڕێتەوە بەوەی دڵێکی نوێ و گیانێکی نوێیان پێدەدات[٦][٧].

٣- مەسیحییەت :

ئایینی مەسیحی لە دەوری مەسیح دەخولێتەوە. لەو شوێنەوە دەستپێدەکات کە پەیمانی کۆنی لێ کۆتایی هات بەهۆی لەدایك بوونە موعجیزەکەی و

---

(١) يونان ٣:٤.
(٢) يوئيل ١٣:٢.
(٣) هو ١٤، مز ٥٣.
(٤) لاوين.
(٥) تثنية ٢٨ - تثنية ١٢.
(٦) حزقيال ٢٦:٣٦.
(٧) إرميا ٣١.

ژیانی تەواوەتیی (چونکە ئەو تاکە تاوانێکیشی نەکردووە)، پاشان لە خاچدانی و مردنی و هەستانەوە و قیامەتی. هەموو ئەو نبوواتانەش ڕوویانداوە. ئایینی مەسیحییەت دامەزراوە لەسەر:

١- پەیمانی نوێ کە مەسیح بە خوێنی خۆی دایمەزراندووە و پێغەمبەرانی پێشووتری بەنی ئیسرائیل پێشبینییان کردووە و هەواڵیان پێداوە، بەو پەیمانە خوا مامەڵە لەگەڵ مرۆڤە تاوانبارەکاندا دەکات، لەسەر ئەو بنچینەیەی کە مەسیح لە خوێنی ڕژاوی بە خاچەوە، بۆتە کەفارەتی هەڵەی ئەوان.

٢- خاچ چارەسەری تاوانەکانی مرۆڤ و ڕزگاربوونیەتی لێی، چونکە مەسیح خۆیی و خوێنی خۆی کردۆتە قوربانی و کەفارەتی مرۆڤەکان، ((چونکە بەبێ ڕشتنی خوێن لێخۆشبوون ڕوونادات))[1]. لەبەر ئەوە هەموو قوربانی و دۆخە ئایینییەکانی پەیمانی کۆن ئاماژەن بۆ خاچ.

٣- لەبەر ئەوەی مەسیح مرۆڤی کامڵ و خودای کامڵە - ئەوەی پێی دەوترێت باوەڕی بەرجەستە بوون - بۆیە ئەو توانای ئەوەی هەیە لە تاوانەکانی مرۆڤ خۆشبێت. هەروەها لەبەر ئەوەی وەك خودایەك سنووردار نییە، بۆیە دەتوانێت لە سزای بێسنووری مرۆڤ (دۆزەخی هەتایی) خۆش ببێت.هەروەها لەبەر ئەوەی شێوەی مرۆڤی وەرگرتووە، بۆیە دەکرێ ببێتە پێشەوایان.

ئەو بەرجەستەبوونە بۆ ئەو ڕاستییە دەگەڕێتەوە کە خودا یەکە و سێ ئوقنومە[2] (سیانە پیرۆزەکە: باوك و کوڕ و ڕووحولقودس) وەك ئەوەی مرۆڤ لە یەك کاتدا باوك و کوڕ و هاوسەر بێت.

کوڕەکە ئارەزوومەندانە بەرجەستە بووە و لاشەیەکی مرۆڤی وەرگرتووە[3]، وەك چارەسەرێك کە خودا پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە[4]. ئیتر خاچ بۆتە خاڵی

---

(١) عبرانیین ٩:٢٢.

(٢) الأقنوم: شێوە - ڕووکەش.

(٣) فیلبی ١١:٥٢.

(٤) کورنثوس ١٩:٥.

بەیەك گەیشتنی دادگەری خودایی و بەزەیی خودایی، چونکە دادگەریی لە تۆڵە دایە و بەزەییش لەوە دایە کە تۆڵەی لە کوڕە خۆشەویستەکەی وەرگرتۆتەوە، ئەو کوڕەی قەرزی گوناهەکانی داوەتەوە[1][2].

٤- شەریعەت و سرووتەکانی مەسیح بە تەواوکەری شەریعەتی موسا دادەنرێت[3]. پەیامەکەی مەسیح کە مەسیحییەکان پەیڕەوی دەکەن بە یارمەتی ڕۆحی پیرۆزی خودا وەرگرتووە، هەروەها خودا لە دەروونی باوەڕداراندا سرووشتێکی نوێی داناوە، بەوەی کە دەتوانن وەك مامۆستاکە (مەسیح) وابن.

٥- ئامانجی ئیمانیی مەسیحی ڕزگار بوونە. ڕزگار بوونیش لە باوەڕبوون بە کەفارەت (خوێنی مەسیح کە ڕەزامەندانە و بێبەرامبەر بەخشیویەتی)[4] دەستپێدەکات و، بە ئازادبوونی کۆتایی لەم لاشە و هەڵە و جیهانە کۆتایی دێت، تا خودا لەگەڵ خەڵکدا نیشتەجێ ببێت لە ئاسمانی نوێ و زەوی نوێ[5].

## دووەم: ئایینی هیندۆسی :

نزیکەی ٩٠٠ ملیۆن کەس لەسەر ئایینی هیندۆسین، کە زۆربەیان لە نیوە کیشوەری هیندیدا دەژین. ئایینی هیندۆسی چەند کۆمەڵێکی جیاوازن، کە لە چوار بیروباوەڕی سەرەکیدا هاوبەشن:

**١- کارما karma: کە بریتییە لە یاسای پاداشت و سزا**

گەردوون سیستەمێکی خوداییە و، لەسەر دادگەری یەکلاکەرەوە وەستاوە و تێیدا هەموو کردارەکانی مرۆڤ تۆمار دەکرێن تا پاداشت و سزای لەسەر وەربگرێت، یان لەو ژیانەدا، یان لە دوای مردن لە ڕێگەی تەناسوخ و چوونە بەر لاشەی ترەوە.

---

(١) مزمور ٨٥:١٠.

(٢) یوحنا ١:١٧.

(٣) متی ٥:١٧.

(٤) رومية ٣:٢٤ - ٢٥.

(٥) الرؤيا ٢١:٣ - ٤.

**٢- بیروباوەڕی تەناسوخ (گواستنەوەی ڕۆح لە لاشەیەکەوە بۆ لاشەیەکی تر) The Doctrine og Re-Ineaernation:**

مردن لاشەی ماددی لەناو دەبات، هەرچی ڕۆحە ئەوا بە خولی (تناسخ) کۆپی بوونەوە بەستراوە. بۆیە ڕۆحی مرۆڤێکی باش دوای مردن دەچێتە لاشەی مرۆڤێك لە چینێکی بەرزتر (وەك جۆرێك لە پاداشت)، بەڵام ڕۆحی مرۆڤێکی خراپ دەچێتە لاشەی چینێکی خوارتر یان لاشەی ئاژەڵێك (وەك جۆرێك لە سزا). لە هەموو بارودۆخێکدا مرۆڤ هیچ دەربارەی ژیانی ڕابردووی نازانێت (واتە نازانێت پاداشت کراوە یان سزا).

**٣- ڕزگاربوون:**

بە دووبارەبوونەوەی خولەکانی (تناسخ) کۆپی بوون، ڕۆح لە ئارەزوو و ژەنگ و ژاری تاوانەکان پاکدەبێتەوە. ئەو کات ڕۆح لە دووبارەبوونەوەی لەدایك بوون ڕزگاری دەبێت و لەگەڵ خواوەند (براهما) تێکەڵ دەبێت، هەروەك چۆن دڵۆپە ئاوێك لەگەڵ زەریادا تێکەڵ دەبێتەوە، ئەمەش ئامانجی بەرزی ژیانە.

باشترین ڕێگاش بۆ ڕزگاربوون زوهد و خۆ دوورگرتنە، چونکە کارە چاکەکان و خراپەکان ڕۆح دەخەنە خوولی نوێی کۆپی بوون.

**٤- یەکێتی بوون:**

گەردوون لە ڕۆحی خوداوە هەڵقووڵاوە و ڕۆحی مرۆڤیش بە هەمان شێوە، کەواتە ڕۆح ئەزەلی و ئەبەدییە و درووستکراو نییە و لە خودا درووستبووە هەروەك چۆن کڵپەی ئاگر لە ئاگرە. دوای ئەوەی ڕۆح لە لاشە ماددیەکەی دادەماڵرێت دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆحی گەورە (ڕزگابوون).

بیروباوەڕی سیانی (سێ خوایی) دیاردەیەکی هیندۆسییە. چونکە خودای ئەوان سێ سیفاتی هەیە، خودا براهمایە (بەو پێیەی بەدیهێنەرە)، فشنۆیە (بەو پێیەی پارێزەرە)، سیفایە (بەو پێیەی لەناو بەرە). ئەو سێ سیفاتەش لە مرۆڤدا بوونیان هەیە.

هیندۆسەکان ئاژەڵەکان بە پیرۆز دەزانن، بە تایبەت مانگا، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە چونکە مانگا هێمای گەورەیی و قوربانیدانە، بەهۆی ئەو خزمەتەی پێشکەشی مرۆڤی دەکات (شیر، پێست، گۆشت، پەینی ئاژەڵی)، هەروەك چۆن مانگا هێمای برایەتی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵە، تەنانەت دەکرێ مانگا ڕۆحی مرۆڤەکانی لە ڕێگای کۆپیبوونەوە هەڵگرتبێت. لەبەر هەموو ئەو هۆکارانە هیندۆسەکان وەك دایکی ڕاستەقینەی مرۆڤ سەیری مانگا دەکەن.

گومان لەوەدا نییە کە هەمان بیروباوەڕی هیندۆسی لەلای هەندێ ئاینزای ئایینە ئاسمانییەکان هەیە. بۆ نموونە دەبینین چەمکی یەکێتی بوون (وحدە الوجود) لە سۆفیگەری فەلسەفەی ئیسلامیدا بوونی هەیە، هەروەك چۆن بیروباوەڕی سیانی لە ئایینی مەسیحیدا بوونی هەیە.

## سێیەم: ئایینەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور :

نزیکە ٨٠٠ ملیۆن کەس لەسەر ئەو ئایینانەن، کە سێ ئایینەکەی چین، بودایی و کۆنفۆشیۆسی و تاوی لەخۆ دەگرێت، هەروەها لەگەڵ ئایینی شەنتەوی یابان.

ئەو کۆمەڵەیە (جگە لە تاوی) بەوە لە دوو کۆمەڵەکەی پێشوو جیاوازن کە گرنگی بە بابەتە غەیبییەکان نادەن، وەك خودای بەدیهێنەر و، نەمریی ڕۆح و، ژیانی دوای مردن و، ئەو بابەتانە بەرزتر لە توانای عەقڵی مرۆڤ دەزانێت. هەروەها ئەو ئایینانە ڕێگا بە تاکەکانیان دەدەن کە هەر بیروباوەڕێکی تر پەیڕەو بکەن، لەبەر ئەوە زۆر کەس وەك ئایین سەیریان ناکەن.

ئەو ئایینانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە چۆن خەڵك فێری ژیان لەسەر زەوی بکەن؛ بەو پێیەی کە دەروون و ئارەزوو سەرچاوەی خراپەکانن. بۆیە کاری چاکە بەختەوەری بە مرۆڤ و کەسانی دی دەبەخشێت، بوداش باسی لەو واتایە کردووە، دەڵێت: چاکە چاکە بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بەڵام پێویست ناکات ئەوە ڕەنگدانەوەی لەسەر ژیانی دوای مردن هەبێت.

هەروەها ئەگەر سەرنجی جیاوازییەکانی نێوان ئایینەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور بدەین، دەبینین کە ئایینی بودایی Budhism بانگەواز بۆ زوهد و سواڵکەری و وەلانانی خۆشیەکان دەکات وەك پارە و ئارەزوی سێکسی، هەروەها باوەڕی بە شێوەیەك لە شێوەکانی کۆپی بوون هەیە کە ئایینی هیندۆسی باوەڕی پێی هەیە. هەروەها باوەڕی بە خۆشیە گەورەکە (نیرڤانا) هەیە کە دەکرێ مرۆڤ لەو ژیانەدا دەستی بکەوێت، یان لە ژیانی دواتردا (وەك لەلای هەندێ کۆمەڵی بودایی هەیە).

**ئایینی بودایی بە دەوری چوار ڕاستییە پیرۆزەکەدا دەخولێتەوە:**

ئازار بوونی هەیە، هۆکارێکی هەیە، دەکرێ لەناو ببرێت، ئامرازی لەناوبردنی ئازاریش بوونی هەیە.

ئەو ئامرازەش بریتییە لەوەی بە هەشت ڕێگاکە ناسراوە، کە بریتین لە درووستی: بیروباوەڕ - هیممەت - گوفتار - کردار - ژیان - کۆشش - فیکر - بیرکردنەوە.

لەبەر ئەوەی بودا جێگای خودا بەبۆشایی لە دەروونی شوێنکەوتوانی جێهێشتووە، بۆیە باوەڕبوون بە خودا لە سرووشتی پاکی زۆر لە بوداییەکان بوونی هەیە، بۆیە ئەوان بودا بە کەسایەتییەکی دوو سەرە دەبینن: ناسۆتی (خاوەن سرووشتی مرۆڤی)، لاهوتی (کە گیانی خودای بەبەردا کراوە)، ئەمەش هاوشێوەی بیروباوەڕی مەسیحییەتە دەربارەی مەسیح. لەبەر ئەوە پەیکەر بۆ بودا تاشراوە و بودا دەپەرسترێت و قوربانی پێشکەشی بودا دەکرێت، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو خۆی نکۆڵی لەوەی دەکات کە پێغەمبەر بێت و بە هیچ جۆرێك باسی خودا ناکات!

هەرچی کۆنفۆشیۆسییە Confuciantism ڕێگا بەهەمموو خۆشییە جیاوازییەکان دەدات و هانی چێژ وەرگرتن لە جوانی و هونەر و مۆسیقا دەدات. گرنگترین شت کە ئەو ئایینە بانگەوازی بۆ دەکات بریتییە لەوەی دەڵێت: بەو جۆرە ڕەفتار لەگەڵ خەڵکیدا بکە کە خۆت پێتخۆشە ڕەفتارت لەگەڵدا بکەن. کۆنفۆشیۆسی خۆشویستن بۆ خێزان و باپیران لە نیشتیمان بە پیرۆزتر دەزانێت.

کۆنفۆشیۆسی و بودایی لە چیرۆکی بەدیهاتن هاوبەشن کە بە شەقبوونی هێلکەی گەردوونی Cosmic Egg[1] دەستپێدەکات.

هەرچی شینتۆییە Shinto - ئایینی یابان - ئەوا هێزی سرووشت و نیشتیمان و ئیمپڕاتۆر و پاڵەوانە قەومییەکان بە پیرۆز دەزانێت و، ئیمپڕاتۆر بە وەچەی خودای خۆر دەزانێت کە زەوی یابانی درووستکردووە، هەر لەبەر ئەوەشە درووشمی خۆر لەسەر ئاڵای یابان داندراوە.

ئایینی تاوی بەوە لە ئایینەکانی تری ڕۆژهەڵاتی دوور جیادەکرێتەوە، کە جەخت لەسەر دواڕۆژ دەکاتەوە. لەبەر ئەوە هەوڵ دەدات لە خودی مرۆڤ تێبگات و پەروەردەی بکات و بیگەیەنێتە بەرزترین پلەی بەرزیی، ئەویش لە ڕێگای بیرکردنەوە و هەوڵدان (یۆگا). هەروەها ئایینی تاوی بە ئایینی سۆفیگەریی ڕۆژهەڵاتی دوور دادەنرێت.

**خوێنەری بەڕێز...**

لەو باسەدا باسمان لە سەرهەڵدانی هزری ئایینی کرد، کە لە ئەفسانە و فەلسەفەدا بەرجەستە بوو.

پاشان چووینە سەر ئایینەکان و باسی ئەوەمان کرد کە پەیوەندی مرۆڤ بەخوداوە پەیوەندییەکی سرووشتی سۆزدارییە، لە کاتێکدا پەیوەندی مرۆڤ بەئایین پەیوەندییەکی عەقڵییە، لەبەر ئەوە یەك بیروباوەڕمان هەیە، بەڵام بە وێنەی جیاواز پێمان ڕاگەیەنراوە.

پاشان چووینە سەر خاسیەتە هاوبەشەکانی ئایینەکان و باسی ئەوەمان کرد کە ئایینی ڕاستەقینە چەمکێکی ڕەهایە و دەکرێ سێ پێکهاتەکانی (پەیام - پەیامبەر - خودا) بە شێوەیەکی بابەتیانە هەڵبسەنگێنرێت، بەمەش زۆر

---

(١) لە کلتوری بەناوبانگی چین (هێلکە)ی ڕەنگاوڕەنگ و نەخشێنراو هەیە. کە لەفرۆشگاکانی کەلەپور و دیاریدا دەبینرێت.

لەو گومڕاییانەی لە ئایینەکاندا هەیە نامێنێت. پاشان خاسیەتەکانی هەرسێ کۆمەڵە سەرەکییەکانی ئایینەکانمان خستەڕوو.

ئێستاش کاتی خستنەڕووی چەمکێکی بەرباڵوی جیهانی هاتووە، کە پێویستە شیبکەینەوە و ڕەگ و ڕیشەی پێکهاتەکانی بزانین، ئەو چەمکەش بە ئایینی سرووشتی ناسراوە.

## باسی چوارەم: ئایینی سرووشتی و عەلمانیەت لە تەرازوودا



ئایینی سرووشتی Natural Religion ڕێبازێکی فیکرییە، بانگەواز دەکات بۆ ئایینێکی بنیاتنراو لەسەر عەقڵ، نەك وەحی، هەروەها بە ڕێبازی پەروەردگاریتی Deism ناسراوە.

ئەو ڕێبازە لەسەر ئەوە دامەزراوە کە خودا گەردوونی درووستکردووە و ئەو یاسایانەی داناوە کە ئێستا بەڕێوەی دەبەن بەڵام ئێستا هیچ دەستکارییەکی ناکات. بە تەواوی وەك ئەوەی دەڵێن کە درووستکەری کاتژمێر کاتژمێرەکەی درووستکردووە، بەڵام ئێستا بەبێ پێویستی بەو کاردەکات. پسپۆڕان ئەو واتایە لەوەدا کۆدەکەنەوە کە دەڵێن ((گەردوونی داخراو Closed Universe))، واتە تەنیا پێویستی بە خۆی هەیە؛ پەو پێیەی لەناویدا هەموو ئەو شتانەی هەیە کە بەڕێوەی دەبەن.

ئەم تێڕوانینە خودا و ئەوەی پەیوەست بێت پێیەوە وەکو غەیب لە گەردوون و بوون دووریان دەخاتەوە، هەروەها پیرۆزی لە هەموو شتەکان دادەماڵێت بە مرۆڤیشەوە. بەمەش ئایینی سرووشتی پەیوەندییەکی بەهێزی بە چەمکی عەلمانیەتەوە هەیە، کە چەمکێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئایینییە.

وشەی عەلمانیەت Secularism لە وشەی لاتینی Seaculum داتاشراوە، کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە واتای جیهان (یان دنیا) دەهات لە بەرامبەر کڵێسادا. پاشان بووە هاو واتای وشەی (دنیایی).

**دیدی عەلمانی سێ جۆرە خەڵك لەخۆ دەگرێت:**

**١- بێباوەڕان، ئەوانەی باوەڕیان بە بوونی خودا نییە.**
**٢- لایەنگرانی ئایینی سرووشتی.**
**٣- دینداره‌کان، ئەوانەی وای دەبینن کە پێویستە ئایین لە ژیانی گشتی جیابکرێتەوە، چونکە ئایین پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودایە.**

لەبەر ئەوە لێرەدا کورتەیەك دەربارەی فیکری عەلمانی دەخەینەڕوو (شیدەکەینەوە) پاشان ئاماژە بەو شتانە دەکەین کە لایەنگرانی ئایینی سرووشتی باوەڕیان پێی هەیە[١].

**یەکەم:** کەسی عەلمانی لە (نەفس و ڕۆح) بێئاگایە وەك بەشێکی بنچینەیی پێکهاتەی مرۆڤ و، تەنیا دان بە لاشە ماددیەکەی و ئەو یاسا سرووشتیانە دادەنێت کە بەڕێوەی دەبەن.

هەروەها کەسی عەلمانی وایدەبینێت کە مادده و یاسا سرووشتییەکان خۆیان خۆیان دروستکردووە، بەوەش سیفاتی خوای بەدیهێنەری پێدەبەخشێت، واتە دانی بەبوونی خودانا (کە گەردوونە) بەڵام خودایەك کە نازانێت چی دروستکردووە و چی دەکات.

بەهەمان شێوە چەمکی (مرۆڤی مادده) هیچ لێکدانەوەیەکی بۆ لایەنە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ نییە، کە بەڵگەن لەسەر بوونی خودا، وەك فیترەتی ئەخلاقی و هۆشیاری بۆ بوونی خودا، هەروەها فیترەتی ئایینی و، عەقڵی بە هەموو لایەنە جۆراوجۆر و سەرسوڕهێنەرەکانی.

**دووەم:** کەسی عەلمانی وای دەبینێت کە پێویستە مرۆڤ تواناکانی تەنیا لە پرسەکانی جیهان و سرووشتدا بخاتەڕوو، هەرچی لە پشت سرووشتە پشتگوێی بخات:

---

(١) لە کتێبی ئەندازیار د. محمد حوسەینی ئیسماعیل: الدين والعلم وقصور الفكر البشرى. کە لەساڵی ١٩٩٩ - چاپکراوە.

لێرەدا کەسی عەلمانی نازانێت کە ئایین بۆتە زانست، بەڵگەی زانستی و فەلسەفی لەسەر دەهێنرێتەوە. بە هەمان شێوە باوەڕبوون بە ئایین بژاردەی نێوان ڕازی بوون و ڕەتکردنەوە نییە، بەڵکو باوەڕبوون بە ئایین پێویستە بۆ ئەوەی مرۆڤ ڕاستی خۆی و ڕاستی بوونی دەوروبەری خۆی بزانێت، ئەگەرنا لە بۆشاییەکی دەروونی و غوربەتدا دەژی.

هەروەها کەسی عەلمانی لەوە بێئاگایە کە ئایینی ڕاست هانی دەدات کە گرنگی بە پرسەکانی زانست و سرووشت بدات، تەنانەت تا ئەو ئاستەی کە عەقڵ و زانست و لۆژیك وەك ڕێگا بزانێت بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر جیهانی دواوەی سرووشت.

**سێیەم:** کەسی عەلمانی بانگەواز بۆ ئازادکردنی عەقڵ دەکات، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی عەقڵ ڕەها بێت:

ئەو بانگەوازە لە دەرەنجامی کێشمەکێشمی مرۆڤی خێرلەخۆنەدیو لەگەڵ چەمکەکانی کڵێسا پەیدابوو، هەروەهای دەرەنجامی هەر هزرێکی ئایینی توندڕەوە کە بانگەواز بۆ ڕەتکردنەوەی عەقڵ و داخستنی دەرگای کۆشش (اجتهاد) دەکەن. هەر لەبەرئەوە فەیلەسووفی ئەڵمانی نیچە دەڵێت: لە ڕاستیدا باوەڕی مەسیحی واتە کوشتنی بەردەوامی عەقڵی مرۆڤ. جا ئەگەر نیچە هەڵمەتی خۆی لە دژی چەمکە گۆڕاوەکانی مەسیحیەت و جولەکە ئەنجامدابێت، ئەوا کەسی عەلمانی هەڵمەتەکەی گشتگیر دەکات دژی هەموو چەمکەکان و لە هەموو ئایینەکاندا.

**چوارەم:** کەسی عەلمانی مرۆڤ لە جیاتی خودا ڕەها دەکات.

نیچە هەڵوێستی بێباوەڕان بەرجەستە دەکات دوای ئەوەی کە توانای زانست و یاسا سرووشتییەکان بۆ لێکدانەوەی دیاردە سرووشتییەکان توشی سەرسامی کردن، کاتێك دەڵێت: (خودا مرد، هەر بە مردوویش دەمێنێتەوە و ئێمە بووین کوشتمان).

سرووشتییە، کە نیچە دوای مردنی خودا، جگە لە مرۆڤ هیچی دیکەی شك نەبرد لە جێگەی خودای دابنێت، ئیتر مژدەی هاتنی مرۆڤێکی بەرزتر یان سوپەرمانی دا، کە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و سەرچاوەی هەموو شتێکە. هەر لەبەر ئەوە دەبینی کە عەلمانییەکان دەڵێن ئێمە لە جیهانێکی گاڵتەجاڕداین، هیچ ئامانجێك لە بەدیهاتن و بووندا نییە.

پێنجەم: کەسی عەلمانی تاقیکردنەوەی بەرجەستە(تەجرەبەی حسی) لە شوێنی هەموو زانستە نەقڵی و ویژدانیەکاندا دادەنێت و بە هۆی زانستی سرووشتی جێگای ئایین و فەلسەفە پڕدەکاتەوە.

زانستە نەقڵییە گوازراوە و ویژدانییەکان سەرچاوەیەکی سەرەکی ئایینن، هەروەك چۆن جیهانەکانی پشت سرووشت دەکاتە وێستگەی کۆتایی ئامانجەکانی و لەو لایەنەدا فەلسەفەش هاوبەشی دەکات، بەمە هەردووکیان بەرپەرچی لێکدانەوەی دەرەوەی سنووری زانستی سرووشتی دەدەنەوە. ئەگەر زانا فیزیاییەکان زانستەکەیان لە تەقینەوە گەورەکە دەستپێدەکەن کە گەردوونی لێ درووستبووە و گرنگی بە پێش ڕوودانی تەقینەوە گەورەکە نادەن، ئەوا ئایین و فەلسەفە ئەو کەموکورتییە پڕدەکەنەوە و لەوە دەکۆڵنەوە کە چۆن گەردوون لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون.

هەروەها زانایانی بایۆلۆجی لە دیاردە ماددیەکان و بنچینەی ماددی ژیان دەکۆڵنەوە، بەڵام ڕاستی ژیان و چۆن بەبەر ماددەی نازیندوودا کراوە، ئەوا ئەوەش بۆ ئایین و فەلەسەفە لێدەگەڕێن.

کەواتە، زانستی سرووشتی پێشەکی زانستی دواوەی سرووشتە، واتە هەردووکیان وەك دوو بازنەی یەك زنجیر وان و ناکرێ یەکێکیان جێگای ئەوی تر بگرێتەوە.

شەشەم: کەسی عەلمانی پێی وایە کە فیکر زادەی مێشکە، واتە ماددە سەرچاوەی فیکرە و هیچ سەرچاوەیەکی لە پشتەوە نییە.

فەیلەسووفەکان لە لێکۆڵینەوەیان دەربارەی سەرچاوەی زانیاری دابەش بوونەتە سەر سێ ڕێبازی سەرەکی، ئەوانیش: ڕێبازی ئەزموونی یان واقیعی: کە تیایدا

هەموو زانیارییەك بۆ ئەزموون یان واقیع دەگێڕدرێتەوە و، مێشك وەك لاپەڕەیەكی سپی وایە كە زانستە وەرگیراوەكانی لەسەر چاپ دەكرێت، بەبێ ئەوەی هیچ ڕۆڵ یان كاریگەرییەكی لەسەر وەرگرتن یان درووستبوونیاندا هەبێت.

**ڕێبازی عەقلّی:** كە عەقڵ (بە چەمكی ناماددی) بە خاوەنی ڕۆڵی سەرەكی زانیاری دەزانێت، بە پێچەوانەی ڕێبازی پێشوو.

**ڕێبازی ڕەخنەیی:** كە هەڵدەستێت بە بەیەكگەیاندنی هەردوو ڕێبازەكەی پێشوو، وای دەبینێت كە زانیاری هەردوو ڕەگەزەكەی پێشوو لەخۆ دەگرێت.

لێرەوە دەبینین كە بیردۆزی مەعریفی Epistemology ئەو پرسەی یەكلایی نەكردۆتەوە، ئەدی كەسی عەلمانی چۆن یەكلایی كردۆتەوە و، ڕێبازی ئەزموونی واقیعی وەرگرتووە و نكۆڵی لە دوو ڕێبازەكەی تر دەكات؟

**حەوتەم:** كەسی عەلمانی ڕەوشت لە سرووشتی مرۆڤ وەردەگرێت نەك لە ئایین.

مرۆڤ لە ژیانیدا بە پلەبەندی بەرەو بەدەستهێنانی (پێنج پێویستیەكە) هەنگاو دەنێت كە بە ناوی ئاستەكانی پێداویستی Hierarchy of Needs ناسراون، ئەوانیش:

پێداویستییە سەرەكییەكان Basic needs: كە تێركردنی غەریزە سەرەكییەكانی مرۆڤ لەخۆ دەگرێت، لە خواردن و خواردنەوە و جێگای حەوانەوە و سێكس....

هێمنی و ئاسایش Security needs: دابینكردنی ئاسایشی ئێستا و ئاینده.

مرۆڤ لە دوو جۆری ڕابردووی پێداویستیی لەگەڵ ئاژەڵ و كۆمەڵی مێرووەكاندا هاوبەشە.

پێداویستی كۆمەڵایەتی Social needs: مرۆڤ هەوڵ دەدات ئارەزووەكەی لەو بوارەدا پڕ بكات بەوەی كە ئەندامێكی گرنگ و پایەدار بێت لەناو كۆمەڵدا.

ڕێزی خودی Self Esteem: مرۆڤ هەوڵ دەدات ڕێزی خۆی بەدەست بێنێت و، كاتێك ئەوە ڕوودەدات كە مرۆڤ هەست دەكات ئەو كارەی ئەنجامی دەدات

کەسانی دی ناتوانن ئەنجامی بدەن.

بەدیهێنانی خوود Self Actualization: گەڕان بە دوای بەدیهێنانی خوددا، لە ڕێی بەجێهێشتنی کاریگەری لە فراوانترین بازنەدا یان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.

هەموو پێداویستییەکانی پێشتر باسمان کردن لە ئاسمانی تاکەکەسی و خۆپەرستیدا دەسوڕێنەوە، لەوانەیە پەنا ببرێتە بەر ڕێگەکانی نایاساییش بۆ بەدەستهێنانیان، تەنانەت لەوانەیە مرۆڤ لەو پێناوەدا ببێتە دڕندەیەکی زۆر مەترسیدار و ڕوخێنەری کەسانی دی، هەروەك چۆن لە سیستەمی حوکمی دیکتاتۆریدا ڕوودەدات. واتە گرنگ گەیشتنە بە ئامانجەکە جا بە هەر هۆکارێك بێت (الغاية تبرر الوسيلة).

لەبەر ئەوە پێویستە دەست بە سەرچاوەیەکی ڕەوشت بگیرێت بۆ ئەوەی دوور لە خۆپەرستیی بەدەستهێنانی ئەو پێداویستیانە ڕێکبخات و، بەدیهێنانی بەختەوەری و خۆشی نەکاتە ئامانجی بەرز، بەڵکو ئەو سنوورە ببڕێت و بپەڕێتەوە بۆ تێرکردنی لایەنی ڕۆحی مرۆڤ، ئەو سەرچاوەیەش جگە لە ئایین شتێکی تر نییە.

هەشتەم: گێڕانەوەی یاساکان بۆ بەرژەوەندی ماددی و ئەزموونی مێژوویی نەك بۆ شەریعەتە ئایینییەکان.

لە پێناو بەدەستهێنانی پێنج پێداویستییەکانی پێشوو، دانەرانی یاسا شەرعیەکان یاسا بۆ جڵەوگیرکردنی ڕۆڵی تاکەکان دادەنێت، بۆ ئەوەی سنوور بەرامبەر مافی کەسانی دی و مافی کۆمەڵگا نەبەزێنێت.

هەروەها سرووشتییە، لەکاتێکدا کە دانەرانی یاسا شەرعییەکان بە ئەزموونی خۆیان ئەوەیان دووپاتکردۆتەوە کە ئایین بەرژەوەندییەکان بەدی دێنێت.

نۆیەم: عەلمانیەکان هەستی ئایینی بۆ ترس دەگێڕنەوە نەك فیترەت:

لەوانەیە کەسی عەلمانی هاوچەرخ نەزانێت کە وەلانانی ئایینی ئاسمانی و هەژمارکردنی بە (ئەفسانەیەکی تۆقێنەر)، دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونی تاڵی

ململانێی نێوان زانست و چەمکە گۆڕدراوەکانی کڵێسا لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپادا.

بەهەمان شێوە کەسی عەلمانی نازانێت کە بەرنامەی چاکسازی ئایینی Religious Reform کە فەیلەسوفەکانی ڕۆشنگەریی لە ئەوروپادا ئەنجامیاندا لە دوای مملمانێ بوو لە پێناو بنیاتنانی ئایینی سرووشتی، لە راستیدا ئەوە بە دەنگەوە چوونی هەستی فیتڕەتی مرۆڤایەتییە بە بوونی خودا و پێویستی بۆ ئایین.

دەیەم: عەلمانیەکان چەمکی (فیتڕەت) ڕەتدەکەنەوە، کە بە واتای هەستی خودایی و هەستی ئایینی و هەستی ڕەوشتی دێت و، وایدەبینن کە مرۆڤ ئەو هەستانەشی بە هەمان ڕێگای بە دەستهێنانی خاسیەتەکانی تر بەدەستیهێناون، ئەویش بەدیهێنانی بەرژەوەندییە، واتە (پێویستی دایکی داهێنانە). و لەوەشدا مەبەستیان ئەوەیە کە مرۆڤ لە ڕووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی سرووشت و خراپەکان و ئازارەکان بەدوای هێزێکی گەورە دەگەڕا لە بوونی ئەو هێزەدا هەست بە پشتگیریی و ئارامیی بکات، لەو کاتەدا لەسەر ئاستی عەقڵی و نەفسی چەمکی خوایەتی و چەمکی ئایینی خستۆتەڕوو. مەبەستی نیچە ئا ئەوەیە کاتێك دەڵێت (مرۆڤ خودای درووستکردووە!).

بە هەمان شێوە مرۆڤ دامەزراوەی ڕەوشتی دامەزراند، کاتێك کە بینی دەستگرتن بە ڕەوشت پێگەیەکی باش و نەمری لە ژیاندا پێدەبەخشێت، هەروەها مرۆڤ لە بەرەنگاربوونەوەی خراپەشدا هەست بە ڕەزامەندی دەکات. هەندێکی تر ئەوەش زیاد دەکەن کە مرۆڤ لەبەر خودی چاکە چاکە دەکات. لە کۆتاییشدا و بەر لە هەموو شتێك ئەگەر دەست بە ڕەوشتەوە نەگرین ئەوا هەموومان نقوم دەبین.

جا بۆ سەلماندنی هەڵەیی ئەو دید و بۆچوونانە لە باسی دواتردا بەڵگەکان لەسەر فیتڕەتی چەمکی خوایەتی و دینداری و ڕەوشت[1] دەخەینەڕوو. بۆ

---

(١) لەلایەن زۆر لایەن فیتڕەتی ئایینی بەکاردەهێنرێت. تەوەتا دیکتاتۆرەکانیش گەلەکانیان هاندەدەن بۆ

دووپاتكردنەوەی ئەو واتایە، كارین ئارمسترۆنگ[1] لە كتێبەكەی (مێژووی خودا A History of God) مرۆڤ بەوە وەسف دەكات كە بوونەوەرێكی ڕۆحییە. ئەو ناوێكی تر بۆ ڕەگەزی مرۆڤایەتی پێشنیار دەكات كە بریتییە لە Home Religious (مرۆڤی دیندار) لە جیاتی Home Sapiens (مرۆڤی عاقڵ). كارین جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە مەحاڵە ڕەگی ئایین لە دەروونی مرۆڤایەتیدا دەربهێنرێت وەك بێباوەڕان هەوڵی بۆ دەدەن، واتە پرسەكە لێرەدا پرسی (خەیاڵی خودا God Delusion نییە وەك ریچارد دۆكنز بانگەشەی بۆ دەكات.

## ئایینی سرووشتی و فیكری عەلمانی :

### ئێستا پاشان نەبوون...

باسمان كرد كە سێ جۆر خەڵك لەسەر فیكری عەلمانین، كە ئەوانیش بێباوەڕان و لایەنگرانی ئایینی سرووشتی و هەندێك لە باوەڕدارانن. ئەگەر شوێنكەوتووانی ئەو كۆمەڵانە لە لێكدانەوەیان بۆ بنچینەی بوون جیاوازبن ئەوا جیاوازی كرداری لە نێوان بێباوەڕان و لایەنگرانی ئایینی سرووشتیدا زۆر كەمە.

---

ئەوەی بەو واقیعە تاڵەی تێیدان ڕازی ببن، بۆ ئەوەی فیردەوسی ژیانەكەی تریان دەستكەوێت (بیرۆكەی ئایین تلیاكی گەلانە).

هەروەها هەندێك بانگخوازیش دەست بەسەر بەخشیندا دەگرن و سامانێكی گەورە كۆدەكەنەوە. هەروەك چۆن تەڵەكەبازان ئەو فیترەتە لە بابەتی جۆراوجۆردا بەكاردێنن و وەك چارەسەركردنی نەخۆشی و لێكدانەوەی خەون و كردنەوەی جادوو.

هەروەها هەندێك جار و لە زۆربەی ئایینەكاندا بانگەواز بۆ توندڕەوی دەكرێت، لەوانەیە قوربانیدان بە گیانی خۆشیان لەلا شیرین بكرێت، ئەمەش تەنیا بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات و تێركردنی ئارەزووی هەندێك كەسە. هەروەك چۆن توندڕەوە مەسیحییەكان لە ویلایەتە یەكگرتووەكاندا ڕاپەڕین، لە ساڵی ١٩٧٨ Jim Jones فەرمانی بە شوێنكەوتوانی كرد كە ژەهر بخۆنەوە، ئەوەبوو ٩٠٠ كەسیان مردن. هەروەها لە ساڵی ١٩٩٣ David Koresh فەرمانی بە ٧٥ لە شوێنكەوتوانی كرد لە تێكساس كە بە سوتان خۆیان بكوژن. هەروەها ساڵی ١٩٩٤ ٧٤ لە شوێنكەوتوانی پەرستگەی خۆر خۆیان كوشت. هەروەها Timothy Mcvegh باڵەخانەیەكی حكومی لە ئۆكلاهۆما تەقاندەوە سەدان ئەمریكی كوشت.

(١) كارین ئارمسترۆنگ Karen Armstrong: بیرمەندێكی ئینگلیزییە، گرنگی بە ئایینەكان دەدات، لە ساڵی ١٩٤٤ لەدایك بووە.

ئەگەر بۆچونی لێکۆڵینەوە لە مرۆڤ پێویست بێت لە سێ لایەنەوە ئەو کارە بکات: سەرچاوە - ڕێگا - کۆتایی، ئەوا بێباوەڕان و لایەنگرانی ئایینی سرووشتی لە لێکدانەوەی (سەرچاوە)ی مرۆڤ جیاوازییان هەیە (بەدیهێنەر خودایە یان سرووشت)؛ بەڵام هەرووکیان بەوە کۆتاییان دێت کە ئێمە لە گەردوونێکی داخراودا دەژین، کە خودا هیچ ڕۆڵێکی نییە تێیدا، چ لە ژیانماندا یان لەدوای مردن. ئەمەش بۆتە هۆی ڕێککەوتنیان لە (ڕێگا)دا و، ئامانجی گەورەیان بریتییە لە بەدەستهێنانی بەختەوەری لە ژیاندا، هەروەها لەوەشدا کۆکن کە دوای مردن فەنابوونە!

گومان لەوەدا نییە کە هەر کەسێك شوێنی ئەو ڕێگایە (بەختەوەری) و ئەو کۆتاییە (فەنابوون) بکەوێت، ئەوا خۆی خستۆتە ناو هەڤدژییەکی ئاشکراوە. چونکە ئەوە چ بەختەوەرییەکە مرۆڤ بزانێت مردنی فەنابوونە و، لە ژیانیدا دەژی و کفنەکەی لە دەستی دایە و چاوەڕێی حوکمی سێدارەیە پاشان فەنابوون.

پێکهاتەی دەروونی مرۆڤ ڕەتیدەکاتەوە کە هەموو شتێك بە مردن بدۆڕێنێت و مرۆڤ بە هیچ جۆرێك لە ترس لە مردن و فەنابوون ڕزگاری نابێت، مەگەر بە دڵنیاییەوە بزانێت کە دەچێتە ژیانێکی نەمری ترەوە.

## گەشتی ئەنتۆنی فلو لە تەرازوودا :

ئەگەر لە گەشتی عەقڵی ئەنتۆنی فلو ڕامێنین، دەبینین بەمانە کۆتایی هاتووە: (خودایەك هەیە)، ئەبەدی ئەزەلییە، زانست و توانای ڕەهای هەیە، ئامادەییە و بە کات و شوێن سنووردار ناکرێت و، بوونی لە نەبوونەوە درووستکردووە. بە هەمان شێوە لەگەڵ ئایینە ئاسمانییەکاندا هاوڕایە بە بوونی ئامانجێکی گشتی (ئامانجدارێتی) لە پشت درووستبوونی گەردوون، بەوەی کە بۆ ژیان و پێشوازی کردن لە مرۆڤ ئامادەکراوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەنتۆنی فلو گەشتەکەی تەواو نەکرد تا لە کۆتایی گەشتەکەیدا بە دیداری دیندارەکان بگات، دەتوانین جیاوازی نێوان ئەنتۆنی فلو و دیندارەکان لە سێ خاڵدا کۆبکەینەوە:

یەکەم: ئەنتۆنی فلو وایدەبینێت کە یاسا سرووشتییەکان بەسن بۆ بەڕێوەبردنی کاری گەردوون بەبێ پێویستی بۆ چاودێری خودایی، بەمەش دەوترێت (گەردوونی داخراو) کە پێویستی بەوە نییە لە دەرەوە دەستکاری بکرێت. ئەمەش هەمان ئەو دەرئەنجامەیە کە ئەرستۆ پێی گەیشتووە کاتێك ویستی پاکانە بۆ خودا بکات و گوتی: پێویست ناکات خودا خۆی بە بوونەوەرەوە خەریك بکات، بەڵکو پێویستە بەوەوە خەریك بێت کە لێی دەوەشێتەوە، بە زاتی خۆیەوە خەریك بێت.

هەرچی ئایینە ئاسمانییەکانن، وایدەبینن کە خودا پێشتر و ئێستا و لە ئاییندەشدا چاودێر و بەڕێوەبەری گەردوون و مرۆڤ بووە و لە خۆمان نزیکترە و، پەیوەندییەکی بەردەوام لە نێوان خودا و مرۆڤ هەیە، کە دەگاتە سنووری گفتوگۆ و داواکاری و وەڵامدانەوەی پاڕانەوە. لەبەر ئەوە ئەگەر خودا بۆ چرکەساتێك واز لە گەردوون بێنێت، ئەوا یاسا سرووشتییەکان کە گەردوون بەڕێوەدەبەن هەرەس دێنن و بوون بە تەواوی لەناودەچێت.

دووەم: ئەنتۆنی فلو دان بە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا نانێت. هەر لێرەشەوە، دان بە ئایینە ئاسمانیەکانیشدا نانێت کە ئەو پەیوەندییەیان لە ڕێی وەحی بەدیهێناوە.

ئەو ئیسلام ڕەتدەکاتەوە، چونکە تێڕوانینەکەی بۆ خودا وەك تێڕوانینی ئایینی جولەکە وایە بەوەی خودایەکی تۆڵەسێن و بەهێزە و باکی بە درووستکراوەکانی نییە. فلو ئەو هەڵوێستەی بەوە وەسف دەکات کە ناتونێت باوەڕ بە سەددام حوسێن بێنێت، لە ئاستێکی گەردوونیدا Cosmic Saddam Hussein! کە مرۆڤ دەچەوسێنێتەوە و پاڵپشتی تیرۆر دەکات!!

بە هەمان شێوە ئەنتۆنی فلو مەسیحیەتیش ڕەتدەکاتەوە؛ چونکە ناتوانێت ئەوە قەبوڵ بکات کە خودا لە شێوەیەکی مرۆڤیدا بەرجەستە بووە، کە مەسیحە. چونکە ئەو ناتوانێت وێنای ئەوە بکات کە خودای پاك و بێگەرد لە شێوەیەکی مرۆڤیدا بەرجەستە ببێت، لە کاتێکدا نە کات نە شوێن خودا سنووردار ناکەن،

خودا بەدیهێنەری سرووشت و یاساکانیەتی، چۆن دەکرێت لە وێنەی مرۆڤێکی سنووردااردا بەرجەستە ببێت، کە بەدەست زوڵم و ستەمی مرۆڤەوە دەناڵێنێت (جولەکە) و یاساکانی سرووشتی بە مردنەوە بەسەردا جێبەجێ دەبێت، جا لێکدانەوە و بیانووی پیاوانی ئایینی مەسیحی هەرچۆنێك بێت.

سێیەم: ئەنتۆنی فلو بیرۆکەی زیندووبوونەوەی دوای مردن ڕەتدەکاتەوە و باوەڕی بە لێپرسینەوە و پاداشت و سزا نییە لە بەرامبەر کارە چاك و خراپەکانماندا، کە لە کۆتاییدا ژیانێکی هەمیشەییە لە بەهەشت یان دۆزەخ.

هەروەها ئەنتۆنی فلو دەڵێت: هەرچەندە بەڵگەی لەسەر بوونی خودا دەستکەوتووە کە گەردوونی لە نەبوونەوە بەدیهێناوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی ماددی یان عەقڵی لەسەر ئەوە نییە کە هیچ شتێك لە دوای مردندا ڕوودەدەن.

لەو خاڵانەی پێشو بۆمان دەردەکەوێت کە ئەنتۆنی فلو لە لایەنگرانی چەمکی ئایینی سرووشتییە Deism، کە باوەڕی بە خودا هەیە بەبێ باوەڕبوون بە ئایینەکان، بۆیە دەکرێ ئەنتۆنی فلو بە عەلمانییەکی میانڕەو هەژمار بکەین.

بەڵام من وایدەبینم کە لەگەڵ هەمووواندا لە بابەتێکی زۆر گرنگ جیاوازە، ئەویش ئەوەیە کە هێشتا بە ڕاستی بەدوای ڕاستیدا وێڵە و ئامادەیی تەواوی تێدا هەیە کە باوەڕ بە ئایینێك لە ئایینەکان بێنێت، ئەگەر بەڵگەی دەستبکەوێت.



## باسی پێنجەم : باوەڕ و بایۆلۆجیا - ١
## لە جینەوە تا مێشك

ئێمە لە سەردەمی دۆزینەوە زانستییە گەورەکاندا دەژین و، دوای تێپەڕبوونی دە ساڵ لە سەدەی بیست و یەك، (گەشتی عەقڵ) تەواو نابێت ئەگەر لە مرۆڤ وردنەبینەوە، بۆ ئەوەی ببینین ئاخۆ باوەڕبوون بە خودا و بە ئایین و، چەمکە ڕۆحیەکان ڕەگ و ڕیشەیەکی بایۆلۆجییان هەیە؟ بە تایبەت کە بینیمان کارین ئارمسترۆنگ پێشنیاری ئەوەی بۆ زانایانی بایۆلۆجی کرد کە ناوی مرۆڤی دیندار لە جیاتی مرۆڤی عاقڵ لە مرۆڤ بنێن.

هەمان پرسیش بە دەوری ڕیشە بایۆلۆجییەکانی دامەزراوەی ڕەوشتیدا دەخوولێتەوە، بەو پێیەی زۆربەی دیندارەکان باوەڕیان وایە کە تاکە سەرچاوەی ڕەوشت ئایینەکانن، کە بۆ ئەوە هاتوون ڕاست و هەڵە نیشانی مرۆڤ بدەن و، دیندارەکان وایدەبینن کە بێباوەڕان لە بۆشایی ڕەوشتیدا دەژین و ئەوان مرۆڤی بەدخو و شەڕانگێزن.

بەو دوو پرسیارە دەستدەکەین بە لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان باوەڕ و بایۆلۆجیا.

لەم باسەدا، ئەو زانیاریانە دەخەینەڕوو کە زانست لەسەر ئەو پرسە خستونیەتەڕوو، لە بواری جینات و پێکهاتە و فەرمانەکانی مێشك. لە باسی دواتریشدا، پەیوەندی نێوان دڵ و باوەڕ دەتوێژینەوە.

**بوونەوەرێکی سۆزدار، بە ڕەوشت و دیندار:**

ئێدوارد ویڵسن[1] Edward O.wilson (مامۆستای بایۆلۆجیای کۆمەڵایەتی لە زانکۆی هارڤارد) پێمان دەڵێت کە مرۆڤ هەر بە سرووشتی سۆزدارە و، ئەو هەستە لە جیناتمان تۆمارکراوە.

بەهەمان شێوە جێمس واتسۆن[2] James Watson لە کتێبەکەی DNA پێمان دەڵێت، کە چەمکە ڕەوشتییەکان Moral Codes هەر لە دروستبوونی مرۆڤدا لەناو جیناتیدا چەسپاوە، بەرلەوەی ئایینەکان پەیدابن.

بەهەمان شێوە رۆبێرت وینستۆن[3] Robert Winston لە کتێبەکەیدا (فیترەتی مرۆڤایەتی) پێمان دەڵێت، کە هەستی ئایینی بەشێکە لە پێکهاتەی دەروونیمان و لە جیناتماندا تۆمارکراوە و لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر لە ڕووی بەهێزی و بێهێزییەوە دەگۆڕێت.

هەروەها گومان لەوەدا نییە کە پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان سێ ڕەگەزەکەی ئەو سێکوچکەیەدا هەیە: مرۆڤ بە سرووشتی خۆی سۆزدارە و، چەمکە ڕەوشتییەکان وەردەگرێت و، بەپیر هەستە ئایینییەکانییەوە دەچێت. زانایانی دەروونزانی و پەروەردەیی سەلماندوویانە کە ئەو سێ لایەنە دەگەڕێنەوە بۆ هەستێکی فیتری زۆر گرنگ، ئەویش چەمکی سۆزدارییە.

---

(١) ئێدوارد ویڵسن: لە ساڵی ١٩٢٩ لە ئەمریکا لەدایك بووە، یەکێکە لە گرنگیدەران بە فەلسەفە و ئایینەکان و مافەکانی مرۆڤ. دوو جار خەڵاتی پۆلێتزەری جیهانیی وەرگرتووە، کتێبەکەی یەکێتی زانستەکان Consilience یەکێکە لە باشترین ئەو کتێبانەی دەربارەی پەیوەندی بایۆلۆجیا و سرووشتی مرۆڤ نووسراوە.

(٢) جێمس واتسۆن، لە ساڵی ١٩٢٨ لە ئەمریکا لەدایك بووە و لە تەمەنی ١٥ ساڵی چۆتە زانکۆی شیکاگۆ. لە زانستی بۆماوەیی دکتۆرای وەرگرت لە ساڵی ١٩٥٠. لە ساڵی ١٩٦٢ خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت (بە هاوبەشی لەگەڵ فرانسیس کریك و مۆریس و ویلکنز) بەهۆی دۆزینەوەی پێکهاتەی DNA، تا ئێستاش لە بوارە جیاوازەکانی توێژینەوە بایۆلۆژیەکان کاردەکات.

(٣) رۆبێرت وینستۆن: ئینگلیزە لە ساڵی ١٩٤٠ لەدایك بووە, مامۆستا و ڕاگری پەیمانگای نەخۆشی و نەشتەرگەری و لەدایکبوونە لە لەندەن، توێژینەوەی بەناوبانگی هەیە لەسەر منداڵی بلووری و سپێرم و خانە قەدیەکان. هەروەها سەرۆکی یەکێتی بەریتانییە بۆ پێشخستنی زانستەکان. هەروەها نووسەر و ڕاگەیاندکارێکی بەناوبانگە.

**سۆزداری چییە...**

**چۆن لە دەروونماندا درووستدەبێت؟[1]**

چاوەکانی سۆزی بچکۆلانە پڕبوون لە فرمێسك، کە تەمەنی تەنیا نۆ مانگ بوو، کاتێك بینی کە منداڵێك دەکەوێتە سەر زەوی، (سۆزی) بە خشان چوو بۆ لای دایکی تا داوای لێبکات بچێت بە هانای منداڵەکەوە.

بەڵام موراد (کە تەمەنی ١٠ مانگ بوو) چوو بووکەڵەکەی (دەبدوب) بێنێت تا بیداتە هاوڕێکەی کە دەگریا تا چیدی نەگری.

ئەو دوو ڕووداوە گوزارشت لە سۆزداری و گرنگیدان دەکەن و ئەوە دەردەخەن کە ڕەگی هەست و سۆزەکان دەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی ساوایەتی. چونکە منداڵ هەر لە ڕۆژی یەکەمی لە دایکبوونییەوە لە کاتی بیستنی دەنگی گریانی منداڵێکی تر دەشڵەژێت، دوای چەند مانگێکی کەم بێزاری لە منداڵدا بەدیدەکرێت وەك کاردانەوەیەك بۆ بێزاری منداڵانی تر، ئیتر بە بیستنی دەنگی منداڵێکی تر یان بینینی فرمێسکی منداڵێکی تر ئەوانیش دەستدەکەن بەگریان.

کاتێك منداڵ ساڵی یەکەمی تێدەپەڕێنێت ئەو هەستانەی ئارامدەبنەوە، کە دڵتەنگی دەوروبەریان پەیوەندی بەوانەوە نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لە بەرامبەر کۆژانەکانی کەسانی تردا نائاسودەن.

لە توێژینەوەیەکدا کە ((مارتن هۆفمان)) Martin I. Hoffman (زانای دەروونزانی لە زانکۆی نیویۆرك) ئەنجامیداوە، بۆی دەرکەوتووە کە منداڵ لە دوای ساڵی یەکەمیان لاسایی خەم و خەفەتی کەسانی دی دەکەنەوە، وەك هەوڵێك بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی کرداری هەستی کەسانی دی بزانن.

بۆیە دەبینی منداڵ پەنجەی دەخاتە زاریەوە کاتێك پەنجەی هاوڕێکەی بریندار بووە، یان دەبینی منداڵێك چاوەکانی دەکوشێت کاتێك دەبینێت دایکی دەگری، ئەو

---

(١) لە کتێبی (المخ ذکر أم أنثی؟!)، کە لە نووسینی د. عمرو شریف و نەبیل کامیلە، لە ساڵی ٢٠٠٩ چاپکراوە.

(کاردنەوە خۆکردە) لەلای بچوکەکاندا[1] واتای (سۆزداری یان بەشداریکردنی ویژدانی) Empathy[2] دەگەیەنێت.

هەروەها کاتێك منداڵ دەگاتە تەمەنی دوو ساڵ و نیو، وردە وردە لاساییکردنەوەی کۆژانەکانی تر لەلای کەمدەبێتەوە و، جیاوازییەکانی نێوان منداڵەکان دەردەکەون لە هەستیارییان لە بەرامبەر کۆژانەکانی کەسانی دی، بە جۆرێك هەندێك منداڵ لە بەرامبەر ئەو کۆژانانەدا هاوسۆزدەبن و هەندێکی تر پشتگوێیان دەخەن.

**چۆن سۆزداری فیترِی پێدەگات؟...**

**رِێککەوتن...**

زانای فەرەنسی (دانییێل شتیرن) جەخت لەسەر گرنگی ئاڵوگۆڕی نیگا و دەستلێدان و دووبارەکردنەوی گاڵتە دەکاتەوە لە نێوان دایك و باوك و منداڵدا و، باوەڕی وایە کە چەسپاندنی بنەمای ڕەوشتی لە ڕێی ئەو ساتە سۆزدارانەوە دەبێت، کەوا لە منداڵ دەکەن هەست بەوە بکات کە هەست و سۆزەکانی جێگای ڕەزامەندین و ئاڵوگۆڕ دەکرێن، ناویشی لەو ئاڵوگۆڕە ناوە (ڕێککەوتن).

هەروەها (شتیرن) پێی وایە کە هەڵوێستە چەندبارەبووەکانی ڕێککەوتن یان ڕێکنەکەوتن، لە نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیان، ڕەفتارەکانیان لەگەڵ کەسانی دی بە درێژایی تەمەن بنیات دەنێن، لە ڕاستیدا ئەو ساتانە دەکرێ زۆر لە گەورەترین ڕووداوەکان کە لە منداڵیدا پێیاندا تێپەڕیوە کاریگەری لەسەر دابنێت.

---

(١) هاوڕێیەکم پێی ڕاگەیاندم کە لە کاتی دوورینەوەی قۆڵی براکەی ئامادە بووبوو، وتی کە هەستم دەکرد دەرزی بە قۆڵی مندا دەکرێت، ئەو هەستەش پێی دەگوترێت (پۆشینی ویژدانی). بە هەمان شێوە ئێمە بە شێوەیەکی خۆنەویستانە دەست دەخەینە سەر چاومان کاتێك لە چاوی کەسێکی تر دەدرێت. گومان لەوەدا نییە کە ئەو کاردانەوە خۆکردانە تا تەمەنی دوای منداڵیش لە گەڵمان بەردەوام دەبن.

(٢) (ئەی. بی. تیچنەر) A. B. Tichener زانای دەروونزانی ئەمریکی، چەمکی Empathy بۆ یەکەمجار لە بیستەکانی سەدەی بیستەم بەکارهێناوە. تیچنەر دەڵێت: سۆزداری لە کاردنەوەی بەرامبەر کۆژانەکانی کەسانی تر هەڵدەقوڵێت لە ڕێگەی وەرگرتنی هەست و سۆزی کەسانی دی بۆ ناو دەروون.

بەهەمان شێوە توێژینەوەکان[1] دەریانخستووە کە منداڵە سۆزدارەکان ئەوانەن کە دایك و باوکیان سەرنجیان بۆ ئەوە ڕاکێشاون کە ڕەفتارەکانیان چ بێزارییەك بۆ کەسانی دی دروستدەکەن. وەك ئەوەی بە منداڵ بوترێت کاتێك ڕەفتارێکی خراپ بەرامبەر خوشکەکەی دەنوێنێت (سەیرکە، بزانە چۆن خەمبارت کرد)، لە جیاتی ئەوەی پێی بوترێت (ئەو ڕەفتارەت شەڕانگێزانەبوو).

هەروەك چۆن سۆزداری منداڵەکان ئەو کاتە گەشە دەکات کاتێك کاردانەوەیەکی باش لە دەوروبەری خۆیان دەبینن لە کاتی یارمەتیدانی کەسێك کە لە تەنگانەدایە، ئیتر ئەوانیش ئارەزووی یارمەتیدانی کەسانی تریان بۆ دروست دەبێت.

لە ڕاستیدا ئەو شێوازە بۆ گەشەکردنی منداڵەکانمان دەبێتە هۆی گەشەکردنی هەست و سۆزی سۆزداری لەلایان، لە ڕێگەی پێگەیاندنی بازنەی دەماری دیاریکراو لە مێشکدا. بۆنموونە، کاتێك دایك گریانی منداڵەکەی دەبیستێت و دەیخاتە باوەشی و رایدەژێنێت تا ئارام ببێتەوە، ئەوا ئەو کردارە هانی دروستبوونی بەستەرە دەماری نێوان بەشی پێشەوەی مێشك (کە بەرپرسە لە زاڵبوون بەسەر کاردانەوە و ڕەفتارەکانمان) و لە نێوان لەوزەی مێشك Amygdala (کە بەرپرسە لە کاردانەوەکان)دەدات، ئیتر ئەو جومگەیە وەك کۆنترۆڵی لێدێت، بۆ جڵەوگیرکردنی کاردانەوە و ڕەفتارەکان. لە پاشان، ئەو منداڵە بە درێژایی ژیانی - بە بەراورد لەگەڵ منداڵەکانی تر - بەوە جیادەکرێتەوە کە دەتوانێت کاردانەوەکانی کۆنترۆڵ بکات و ڕەفتاری ڕەوشتی ئەنجام بدات، لە کاتی توشبوونی بە دڵەڕاوکێ.

### نموونەیەکی بایۆلۆجی لەسەر فیترییەتی ڕەوشت

یەکێك لە دیاردە چەسپاوەکان و بەڵگە بەهێزەکان لەسەر فیترییەتی چەمکە ڕەوشتییەکان، ئەوەی بە دیاردەی دوورکەوتنەوە لە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسە نزیکەکاندا ناسراوە Incest Avoidance.

---

(١) لە پەیمانگای نەتەوەیی بۆ تەندروستی دەروونی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا توێژینەوەیەك ئەنجامدرا و هەریەکە لە (ماریان رادیك یارۆ) و (کارۆلین شان واکسلەر) پسپۆڕانی تەندروستی منداڵان ئەو توێژینەوەیان ئەنجامدا.

خۆ دوورگرتن لەو پەیوەندییە بە تەنیا لەلای مرۆڤ ناوەستێت، بەڵکو ئاژەڵەکان تەنانەت ڕووەکەکانیش دەگرێتەوە[١]! ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەو چەمکە ڕەوشتییە بایۆلۆجییە.

بۆ لێکدانەوە بۆ ئەو دوورکەوتنەوەیە، زانایانی کۆمەڵزانی دەستەواژەیەك دەخەنەڕوو کە بە کاریگەری ویستەر مارك[٢] Westermarck effect ناسراوە، کە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە (ئەو منداڵانەی پێکەوە گەورەبوون هەستی سێکسیان بەرامبەر یەك بۆ دروست نابێت، هەتا ئەگەر خوشك و براش نەبن). ئەمەش لە خێزانەکانماندا بەدی دەکەین، کاتێك پرسی هاوسەرگیری کوڕێك لەگەڵ کچێکدا کە پێکەوە گەورەبوون دێتە بەرباس، زۆربەی کات یەکێکیان دەڵێت: من وەك خوشکی خۆم / برای خۆم سەیری دەکەم[٣].

لە ناوەندە زانستییەکاندا کۆدەنگییەك هەیە لەسەر گێڕانەوەی کاریگەری ویستەر مارك بە پلەی یەکەم بۆ هۆکارە بایۆلۆژییەکان[٤]، چونکە سەلمێنراوە کە لە ئارەقی هەر یەکێکمان ماددەیەکی کیمیایی دەردەدرێت، فیرۆمۆنات Pheromones، کە کەسانی دەوروبەر بۆنەکەی دەکەن و کاریگەری دەخاتە سەر ناوەندەکانی مێشکیان کە بەرپرسن لە مەیل بۆ ڕەگەزی بەرامبەر. کە لەوانەیە ئەوە ببێتە هۆی زیادبوونی مەیل لە نێوان ئەو کەسانەی لە یەکترەوە نزیك نین و ببێتە هۆی دروستبوونی خۆشەویستی.

---

(١) زانایان جۆرێك مشکیان دۆزیوەتەوە کە لە نێوان خۆیاندا نێر و مێی لەدایکبووی هەمان دایك جوتبوون ڕوونادات و لە ڕێگای بۆنێکی تایبەت بچووکەکانی هەمان دایك یەکتر دەناسنەوە، هەروەها مەیموونی شامپانزی و بابۆن بوونی پەیوەندی سێکسی لە نێوان بەچکەکانی یەك دایکدا ڕەتدەکەنەوە، تەنانەت لەگەڵ خزمی لەوە دوورتریش، هەروەها زۆرێك لە ڕووەکەکان میکانیزمی زیرەکانە بۆ ڕێگرتن لە پیتاندنی دەنکی تۆو و هێلکەی هەمان گوڵدا دەگرنەبەر.

(٢) دراوەتە پاڵ فەیلەسووف و زانای کۆمەڵزانی فینلەندی ئێدوارد ویستەر مارك (١٨٦٢ - ١٩٣٩) و ئەو کارگێڕیەی لە ساڵی ١٨٩١ لە کتێبەکەیدا The History of Human Marrage باسکردووە.

(٣) لە وڵاتی تایوان خێزانە دەوڵەمەندەکان کچی بچوك دەگرنەخۆ و بەخێویان دەکەن بۆ ئەوەی لەگەڵ کوڕەکانیاندا بەیەکەوە گەورە ببن و دواتر هاوسەرگیری بکەن. توێژەران بۆیان دەرکەوتووە کە ڕێژەی منداڵبوونی ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە کەمترە و ڕێژەی جیابوونەوەی لە ڕێژەی جیابوونەوەی هاوسەرگیری کلاسیکی زیاترە.

(٤) پابەندبوونی کۆمەڵایەتی (کە فرۆید بۆی خوێنگەرمە) لە پلەی دواتر دێت.

هەروەها سەلمێنراوە کە هەستیاری بازنەکانی مێشك بۆ جۆرێکی تایبەت لە فیرۆمۆنات لە جیناتماندا چەسپاوە و، هەرچەندە پلەی نزیکی خزمایەتی زیادبکات دوورکەوتنەوەی فیترپیش زیاتر دەبێت.

## جینی خوایەتی The God Gene :

گۆڤاری تایم Time لە ژمارەی ٢٥ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٤ بابەتێکی گرنگی خستۆتەڕوو بە ناونیشانی ((جینی خوایەتی))[(١)] و ئەو بابەتە دەربارەی ئەوەیە کە هەستکردن بە خودا و ئارەزووی نزیکبوونەوە لە ڕێی پەرستنەوە و هەستکردن بەبوونی خۆشی و سزای ژیانی دوای مردن بابەتی فیترین لەلای مرۆڤ و بەدرێژایی مێژوو و جوگرافیا هەروابووە.

لە ڕوونترین نموونەش لەسەر ئەوە، گرنگیدانی زۆری فیرعەونەکانە بە مردن و مۆمیاکردن و دوای مردن.

هەروەها ئەوە لە پەرستگا گەورەکان و نەخشی گۆڕستانە فیرعەونییەکان دەردەکەوێت، بە هەمان شێوە لە بەبەردبووەکان وەك لە کتێبی مردووەکان دەردەکەوێت.

زانستی شوێنەوارناسی گرنگیدانی هاوشێوەی لە کۆندا لەلای خەڵکی کۆنی هیندستان و چین و ئەمریکای باشور و ئیسپانیا و فەرەنسا و بەریتانیا و سوید دەرخستووە.

هەروەها مایکل شێرمەر[(٢)] (سەرنووسەری گۆڤاری گوماندار Skeptic) ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە هەستکردن بە دووانەیی لاشە و ڕۆح بابەتێکی فیترییە و هەر لە ساتی لەدایکبوونمانەوە لە دەروونماندا چەسپێنراوە.

---

(١) گۆڤارەکە ئەو بابەتەی لە کتێبێك وەرگرتووە کە بە هەمان ناوە، دوای کەمێکی تر باسی دەکەین.

(٢) مایکل شێرمەر: مامۆستای ئابووری لە زانکۆی کلاریمۆنت - ئەمریکی - لە ساڵی ١٩٥٤ لەدایك بووە، گرنگی دەدات بە فەلسەفە و زانستەکان و سەرنووسەری گۆڤاری Skeptic، کە کۆمەڵەی skeptics دەریدەکات، کە لە ٥٥,٠٠٠ ئەندام پێکهاتووە و گرنگی دەدات بە تەکنیکی زانست و ئەو گومڕاییانەی دەوریان داوە.

هەروەها پۆل بلۆم (مامۆستای زانستی دەروونزانی لە زانکۆی ییل لە ویلایەتە یەکگرتووەکان) دەڵێت:

(ئێمە بوونەوەری دوولایەنەین (لاشە و ڕۆح) لە جیناتماندا باوەڕبوون بەژیانێکی تر چەسپێنراوە، کە تێیدا ڕۆح دوای بە جێهێشتنی لاشەی فانی تێیدا دەژی. ئەو باوەڕە بنچینەی فیترەتی ئایینییە)[1].

**ئێستاش با بایۆلۆجیا قسەی خۆی بکات[2]**

دیان هامەر Dean Hamer (سەرۆکی بەشی توێژینەوی جینات لە پەیمانگای نەتەوەیی بۆ شێرپەنجە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان) پێمان دەڵێت کە مرۆڤ کۆمەڵێك جین بە بۆماوەیی وەردەگرێت کە وایلێدەکەن ئامادەی وەرگرتنی چەمکەکانی خوایەتی و ئایین بێت God Gene Hypofhesis.

هامەر ئەو چەمکەی لە دەرەنجامی ئەو توێژینەوانە داناوە کە لەسەر جینەکانی ڕەفتار ئەنجامی داون، هەروەها لەسەر توێژینەوەکانی بایۆلۆجیای دەمار و زانستی دەروونزانی و دەرەنجامی ئەو توێژینەوانە لە کتێبەکەیدا The God Gene: How faith is Hardwired in our genes خستۆتەڕوو کە لەساڵی[3] ٢٠٠٤ چاپکراوە.

پێشبینی کراوە کە کتێبەکەی دیان هامەریش (جینی خوایەتی) ڕووبەڕووی کۆمەڵێك ڕەخنە و بەرپەرچی کۆمەڵێك دامەزراوەی زانستی ببێتەوە و، لەوانەیە

---

(١) ئەو چەمکەی لە کتێبەکەی Descartes baby: How the Science of child development explains what makes us Human خستۆتەڕوو، کە لە ساڵی ٢٠٠٤ چاپکراوە.

(٢) یەکێك لە گرنگیدەرانی ئەو بوارە پرۆفیسۆر حوسەین ئەحمد ئەمینە، مامۆستای نەشتەرگەری. لەو بوارەدا کتێبێکی بە زمانی ئینگلیزی نووسیوە (کە بەکارمان هێناوە) بە ناونیشانی Genes and Human Nature لە ساڵی ٢٠٠٧ چاپکراوە.

(٣) گرنگترین جینی بەرپرس لەو ئامادەکارییە جینی ناسراوە بە VMAT2. ئەو جینە بەرپرسە لە درووستکرنی گوێزەرەوەی کیمیایی لە مێشکدا، بە ناوی Vesicular mon monamine transporter ناسراوە. هەروەها بەرپرسە لە ئاستی ژمارەی گوێزەرەوە کیمیایی کە کاری مێشك ڕێکدەخەن (سیرۆتۆنین – دۆپامین - نورئەدرینالین).
هەروەك چۆن ڕۆڵی هەیە لە ئاراستەکردنی ناوەندە بەرپرسەکانی هەست و سۆزی ڕۆحی و چەمکە غەیبییەکان.

ئەوەش بگەڕێتەوە بۆ ناوی کتێبەکە، کە ماددیگەراکانی توڕەکرد، چونکە ئەو چەمکە زانستیانەی خستوونیەتەڕوو نوێ نین!

چونکە پێش کێشەکەی (داین هامەر) بە بیست ساڵ، کلۆد کلۆنینگەر[١] Claud R. Cloninger (مامۆستای زانستی و دەروونی و پزیشکی دەروونی زانستی بۆماوەیی لە زانکۆی واشنتن) ((بیردۆزی میزاجەکان و ڕەوشتی بۆماوەیی))[٢] خستۆتەڕوو، کە بۆتە یەکێك لە چەمکە چەسپاوەکان لە ناوەندە زانستییەکاندا.

---

(١) کلۆد کلۆنینگەر Claud Robert Cloninger لە ساڵی ١٩٤٤ لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لەدایك بووە. پێشەوای زانایانی توێژینەوەکانە دەربارەی جینات و بایۆلۆژیایی و دەمارەکان و پزیشکی دەروونی نەخۆشییە دەروونیەکانە، مامۆستای هەریەك لەو بوارانەبووە لە زانکۆ و بەڕێوەبەری ناوەندی تەندروستی دەروونی بوولە زانکۆی واشنتن. هەروەها بڵاوکەرەوەی سەرەکی زۆر گۆڤاری زانستی بەهێز بووە لە بواری پزیشکی دەروونی و بۆماوەیی، هەروەها لە نووسینی چوار کتێب و ٤٠٠ توێژینەوەی زانستی بەشداری کردووە.
زۆر خەڵاتی وەگرتووە، لەوانە ئەندامێتی هەمیشەیی لە ئەکادیمیای ئەمریکی بۆ زانستەکان و، لە ساڵی ٢٠٠٩ خەڵاتی یەکێتی نەخۆشیە دەروونییەکانی ئەمریکی وەرگرت، بەهۆی هەوڵەکانی لە تێگەیشتنی مرۆڤ بە شێوەیەکی تەواوەتی (جەستە - عەقڵ - دەروون - ڕۆح).

(٢) بیردۆزی میزاج و ڕەوشتی بۆماوەیی Temperament and Character Inventory: ئەم بیردۆزە چوار جۆر میزاج و سێ کۆمەڵەی ڕەوشتی بۆماوەیی دیاریکردووە، کە جیناتمان کۆنترۆڵیان دەکەن و منداڵەکان لە باوکیانەوە بۆیان دەمێنێتەوە. ئاڕاستەی ئەو میزاج و ڕەوشتانەش کاریگەری دەبێت لەسەر ڕەفتارەکانی مرۆڤ و ڕەوشت و دینداریەکەی !!، هەروەها ئەوەش ئاشکرا دەکات کە تاچەند ئەو مرۆڤە تووشی نەخۆشی دەبێت تا چەند ئامادەیی ئاڵوودەبوونی تێدایە بە تایبەت بە ماددە کحوولیەکان.
ئەو حەوت خاسیەتانە هەریەکەیان بە شێوەیەکی سەربەخۆ وەردەگیرێن و لەگەڵ یەکتردا کارلێك دەکەن بۆ ئەوەی کەسایەتی مرۆڤ درووستبکەن.
کلۆنێنجەر لەو بیردۆزەدا پشتی بە توێژینەوەکانی دەربارەی زانستی جینات و بایۆلۆژیای دەمارەکان بەستووە، نەك بە توێژینەوە دەروونیەکان و ئامارەکان. ئەمەش هۆکاری بەهێزی ئەو بیردۆزەیە.
سەرەڕای ئەو سێ کۆمەڵەیەی ڕەوشتە بۆماوەییەکان کە لە کتێبەکەدا باسیان دەکەین، بیردۆزەکە چوار میزاج دەخاتەڕوو کە ڕەفتارەکانی مرۆڤ و قابیلیەتی بۆ نەخۆشیەکان دەردەخات، ئەوانیش:
١- مەیلی حاشاکردن لە زەرەر و زیان.
٢- گەڕان بەدوای شتی نوێدا.
٣- پشت بەستن بە پاداشت (ماددی و مەعنەوی).
٤- تێکۆشان.
شوێنی ئەو میزاجانەش لە مێشکی مرۆڤدا دەکەوێتە دەزگای حوفی و توێکڵی سەرەتایی مۆخ، ئەو شوێنانەش بەرپرسن لە عادەت و هەست و سۆز و ڕەفتارەکانی مرۆڤ.

لەو بیردۆزەدا، کلۆنینگەر سێ کۆمەڵەی ڕەوشتی بۆماوەیی خستۆتەڕوو (کە جینەکانمان ئامادە دەکەن تا ئەو ڕەوشتانە وەربگرین) کە مەیلەکانی مرۆڤ لە ڕووی مرۆڤایەتی و ڕەوشتی و ڕۆحی دیاریدەکەن. ئەو کۆمەڵانەش بریتین لە:

١- ڕاستگۆیی خوود Self-Directedness: کە ڕوونی ئامانجی Purpose fullness و جێی متمانەیی مرۆڤ Reliable لەخۆ دەگرێت (کە ئەو سیفەتانە تایبەتن بە کەسایەتی مرۆڤ).

٢- هاوکاری Cooperativeness: کە ئامادەیی مرۆڤ بۆ هاوکاری کردنی کەسانی دی Helpfull و ئارامگرتن Tolerant و وازهێنان لە تۆڵە Non-Revengeful لەخۆ دەگرێت (کە چەند سیفەتێکن ڕەفتاری مرۆڤ لەگەڵ کەسانی دی کۆنترۆڵ دەکەن).

٣- تێپەڕاندنی خود (بەرزی دەروون) Self-Transcendence: مەیلە ڕۆحیەکان Spiritualness و داهێنان Creativity و نکۆڵیکردن لە خوود Self-forgetfulness و دوورکەوتنەوە لە ماددیگەرایی Non-Materialism لەخۆ دەگرێت (کە چەند سیفەتێکی تایبەتن بە چەمکە بەرزەکان).

هەروەها جۆرە جیناتێکی دیاریکراو (لە کۆرپەلەدا و لە قۆناغی منداڵیدا) هەن کە هەڵدەستن بە پێکهێنانی بازنەی دەماری بەرپرس لەو سیفەتانە لەو ناوەندانەی تایبەتن بە فێرکردن و چەمکەکانی پێشوو لە توێکڵی مۆخی نوێ Neocortex، کە مرۆڤی پێ لە مەمکدارەکانی تر جیادەکرێتەوە.

بۆیە سەرنجی ئەو سێ کۆمەڵەیەی ڕەوشت بدەین، دەبینین کە بنچینەی دەروونی بۆ فیترەتی دینداری و فیترەتی دامەزراوەیی ڕەوشتی لە مرۆڤدا دەردەخات. پاشان پەروەردە هەڵدەستێت بە گەشەپێکردنی ئەو ئاڕاستانە.

د. کلۆنێنگەر باوەڕی بەوە هەیە کە پێویستە وەك بوونێکی تەواوەتی (لاشە - عەقڵ - دەروون - ڕۆح) سەیری مرۆڤ بکەین. و لەکاتی لێکۆڵینەوەی کەسایەتی پێویستە سنووری هەریەك لەو چوار پێکهاتانە بزانرێت، لەگەڵ دیاریکردنی پەیوەندی لە نێوانیاندا.

بەهەمان شێوە باوەڕی وایە کە مرۆڤ دەتوانێت لەڕووی عەقڵی و ڕۆحی باشتر بێت، ئەمەش لەڕێی ڕاهێنانی عەقڵی و ڕۆحی وەك بیرکردنەوە و نوێژ و کۆشش کردن لەگەڵ دەروونداا، بەتەواوی هەروەك چۆن لاشەی بە ڕاهێنانە وەرزشییەکان بنیات دەنێت.

## چەمکە ئاینییەکان و گەشەکردن :

ئەگەر زانست ئەوەی سەلماندبێت کە هەستکردن بە چەمکەکانی خوایەتی و ئایین و هەستکردن بە دوو لایەنیی ڕۆح و لاشە و، دامەزراوەی ڕەوشتی لە هەڵاتنی خۆری مرۆڤایەتی و لەگەڵ لەدایك بوونی هەر مرۆڤێك لە جیناتماندا بوونی هەیە، ئەدی بۆچی دەبینین هەندێ کەس لە کەسانیدی دیندارترن؟ و ڕۆڵی گەشەکردن چییە لە وەرگرتنی چەمکە ئاینییەکان؟

ئەوە بە تەواوی وەك فێربوونی زمانە، چونکە زمان بریتی نییە لەو وشانەی لە فەرهەنگەکانی کتێبخانەکانماندا بوونی هەیە، چونکە فەرهەنگ تەنیا ئەو وشانەی تێدایە کە لە هەر زمانێکدا بەکاردێن و، سەدان زمان هەن کە مرۆڤ بەکاریان دێنن.

بەڵام بنچینەی زمان، بریتییە لە ڕێگای درووستکردنی ڕستە Syntax. و لەو ڕێگایەشدا هەموو زمانەکان یەکسانن و لە جیناتماندا چەسپاوە.

جیناتی زمان لە منداڵەکاندا بوونی هەیە و، لە تەمەنی دوو ساڵیدا، ئەو جیناتە چالاك دەبن و توانای زمانەوانی لەلای منداڵ بەشێوەیەکی بەرچاو زیاددەکەن، و زانینی جیاوازی دەمەکان (ڕابردوو ئێستا ئایندە) کۆتا بەهرەی زمانەوانین کە لە منداڵدا دەردەکەون.

بەڵام ئەوەی کە منداڵ لە ژینگەوە فێری دەبێت، وشە و ڕێساکانی زمانن.

لە ڕاستیدا ناوەڕۆکی ئایین وەك ناوەڕۆکی زمان وایە، بابەتێکی جیهانییە و هەموو مرۆڤەکان تیایدا یەکسانن، چونکە لە جیناتماندا تۆمارکراوە.

بەڵام جۆری ئایین و، ئاستی تێگەیشتنی هەر تاکێك بۆ دامەزراوە ئایینیەکەی و دەستگرتن پێیەوە، ئەو بابەتێکە لە ژینگەوە وەردەگیرێت.

## دینداری و مێشك :

لێکۆڵەرەوە بایۆلۆژییە ماددیگەراکان لەکاتی لێکۆڵینەوە لە مێشك ڕووبەڕووی هەڵوێستێکی زۆر قورس دەبنەوە:

چونکە لە کاتێکدا هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆریان بۆ سەلماندنی عەقڵ (دەرك کردن و بیرکردنەوە و هەستکردن بەخوود...) دەدا وەك چالاکییەکی ماددی، کە زانست لەژێر ڕۆشنایی چالاکی کارۆکیمیایی مێشك دەتوانێت شیکردنەوەی بۆ بکات، ئێستا لەسەریان پێویستە لێکدانەوە بۆ چالاکی بەرزتر و ناڕوونتر بکەن، کە هەست و سۆزە ڕۆحیەکانن.

بابەتەکە زۆر گەرمە و، لەم دواییانە بە شێوەیەکی زۆر چڕ دەخرێتەڕوو و، سەدان توێژینەوە و دەیان کتێبی لەسەر نووسراوە.

### بـــایۆلۆژیای عـەقڵ :

بۆ لێکۆڵینەوە لە فەرمانە عەقڵی و دەروونی و هەستی و ڕۆحیەکانی مێشك، پێویستە شتێك دەربارەی پێکهاتەی شیکاری و فەرمانی ناوەندە بەرزەکانی مێشك بزانین. و بە چیرۆکێکی میلۆدرامی کە لەلایەن زانایانی کۆمەڵزانی و دەروونزانی باوە ڕێ بۆ تێگەیشتن لەوە خۆش دەکەین، ئەویش چیرۆکی ماتیلدایە.

بەمانای وشە کارەساتێکی جەرگبڕە، (ماتێلدا کراپتەری) کچە چواردە ساڵانەکە ویستی گاڵتەیەك لەگەڵ دایك و باوکی بکات، بۆیە لە دۆڵابی جلوبەرگدا خۆی حەشاردا، بۆ ئەوەی کاتێك دایك و باوکی لە میوانی هاتنەوە بێتە دەرەوە بڵێ (باوووو!).

(بۆبی کراپتەری) و هاوسەرەکەی وایاندەزانی کە مالتیدا لە دەرەوەیە و لەلای هاوڕێکانیەتی، لەبەر ئەوە کاتێك باوکەکە لە کاتی هاتنە ژوورەوەدا

گوێی لە دەنگێك بوو، بەرەو ئاراستەی ئەو شوێنە ڕۆیشت کە (دەمانچە عەیار ٣٥٧)ەکەی تێدا حەشاردابوو و، بەرەو ژووری نووستن کەوتەڕێ بۆ ئەوەی ئەو کەسەی دزەی کردۆتە ژوورەوە بیوەستێنێت.

کاتێك ماتیلدا لە دۆڵابەکە بە گاڵتەوە خۆی فڕێدا، کراپتەری گوللەیەکی تەقاند و بەر ملی کەوت و دوای دوازدە کاتژمێر گیانی دەرچوو.

زاڵکردنی کاردانەوە بەسەر هەستکردن و عەقڵ شتێکی دەگمەن نییە، سەیرکە کاتێك دوو کەس دەبێتە دەمەقاڵێیان، لەوانەیە کار بگاتە ئەوەی یەکێکیان چەقۆیەك دەربێنێت و ئەوی تریان بکوژێت، بەبێ گوێدانە دەرەنجامەکانی کە لەوانەیە ببێتە هۆی لەسێدارەدانی.

**دوو عەقڵمان لە مێشکدایە. هەروەها دوو یادەوەریش :**

هەموو ئەو بەدبەختییانە بۆ ئەوە دەگەڕێنەوە کە ئێمە دوو سیستەمی تەواو جیاوازمان هەیە بۆ زانین و هەست کردن، کە لەگەڵ یەکتردا کارلێك دەکەن بۆ پێکهێنانی ژیانی عەقڵی و هەستیمان. سیستەمی یەکەم عەقڵی لۆژیکییە Rational Mind، کە بەرپرسە لە تێگەیشتنی بابەتە ڕوون و ئاشکراکانی ناو بیر و هۆشمان، هەروەها بەرپرسە لە بیرکردنەوەی قووڵ و تێفکرین. ناوەندی عەقڵی لۆژیکیش بریتییە لە توێکڵی نوێی مێشك Neocortex[1].

لە تەك ئەو عەقڵەدا، سیستەمێکی تری زانیاریش هەیە، کە سیستەمێکی بەهێز و پاڵنەرە و، لەگەڵ هەست و سۆز و بابەتە ناڕوونەکانی بیر و هۆشمان ڕەفتار

---

(١) هەموو بەرهەمەکانی ژیارستانیەتی مرۆڤایەتی لە فیکر و زانست و هونەر و ڕۆشنبیری بەرهەمی عەقڵی لۆژیکین، کە دەکەوێتە توێکڵی دەوری مێشکی مرۆڤ.

توێکڵی نوێی مێشك هەڵدەستێت بە ئاراستەکردنی هەست و سۆزەکانی مرۆڤ، بۆ نموونە بوونی ئەو توێکڵە بۆتە هۆی گەشەکردنی پەیوەندی خۆشەویستی نێوان دایك و منداڵەکەی، کە بۆتە هۆی وابەستەبوونی دایك بو پەروەردەکردنی منداڵ بۆ ساڵانێکی زۆر و ئەمەش بۆتە هۆی گەشەکردنی ژیارستانیەتی مرۆڤایەتی و پێشکەوتنی.

لەبەرئەوە ئەو زیندەوەرانەی توێکڵی مێشکی پێشکەوتوویان نییە هەست و سۆزی دایکایەتییان کەمە، وەك خشۆکەکان کە بە غەریزە دوای لەدایك بوونیان بێچووەکانی لە دایکەکان دەشارێتەوە لەترسی ئەوەی دایکەکە بیانخوات.

دەكات، تەنانەت لەگەڵ ئەو هەست و سۆز و بابەتانەش كە بەهیچ شێوەیەك هەستیان پێناكەین، ئەو سیستەمەش بریتییە لە عەقڵی كاردانەوەیی (سۆزداری) Emotional Mind و ناوەندەكەی بریتییە لە لەوزەی مۆخ [1]Amygdala.

بەهەمان شێوە دەركەوتووە كە هەریەك لەم دوو عەقڵە ناوەندێكی سەربەخۆیان هەیە بۆ هەڵگرتنی زانیاری (یادەوەرییەكی جیاواز). لێكۆڵینەوەكان ئەوەیان دڵنیا كردۆتەوە كە ناوچەی هیپۆكامپوس Hippocampus (كە یەكێكە لە بەشەكانی دەزگای حووفی لە مێشكدا)و بەرپرسە لە تۆماركردنی ئەو بابەتانەی بە هەستەوەرەكان و عەقڵ هەستیان پێدەكرێت، بۆ ئەوەی دوایی ئەوە زانیارییەكە بنێرێت بۆ توێكڵی مۆخی، كە لەوێ لێكدانەوەی بۆ دەكرێت و بەشێوەیەكی وردتر و باشتر تۆمار دەكرێت.

لەهەمان كاتدا، لەوزەی مۆخ هەڵدەستێت بە هەڵگرتنی ئاماژە سۆزدارییەكان كە هاوپێچی ئەو رووداوانەن (یادەوەری كاردانەوەیی عەقڵ). بۆنموونە ناوچەی هیپۆكامپوس و توێكڵی مێشك ئادگارەكانی كەسێك نیشان دەكەن، بەڵام لەوزەی مۆخ هەست و سۆزەكانی بۆ زیاد دەكات، بۆ نموونە كە ئەو مرۆڤەت خۆشدەوێ یان نا[2].

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە مێشك دوو ناوەندی یادەوەری تێدایە: ناوەندێكی تایبەت بە رووداوە ماددیەكان كە ناوچەی هیپۆكامپوس و توێكڵی مێشكن و،

---

(١) لە ناوەندی مێشكدا ناوچەیەك هەیە كە پێی دەگووترێت دەزگای حووفی Limbic System كە لە چەند پێكهاتەیەك پێكهاتووە كە گرنگترینیان لەوزەی مێشك Amygdala و هیپۆكامپۆس Hippocampus ە.
لەوزەی مێشك ناوەندی فەرمانی كاردانەوە و سۆزدارییە، كە لەكاتی زاڵبوونی ئارەزوو یان توورەیی یان سۆزداری یان خۆشەویستی یان گەڕانەوە لەترسا یان... كار دەكاتە سەرمان.
بۆیە ئەگەر لەوزەی مێشك تووشی هەر كەم و كورتییەك ببێت، دەبێتە هۆی بێتواناییەكی گەورە لە هەست و سۆز و رووداوە سۆزدارییەكان، كە پێی دەگووترێت (كوێریی كاردانەوەیی) Affective Blindness .

(٢) نموونەیەكی تر: گریمان لە رێگایەكی تیژڕەودا وەستمان بەپێش ئۆتۆمبیلێك بكەوینەوە و لەو كاتەدا نزیك بوو بەر ئۆتۆمبێلی بەرامبەر بكەوین كە بە ئاراستەی پێچەوانە دەهات، لێرەدا ناوچەی هیپۆكامپوس و توێكڵی مێشك وردەكاری رووداوەكەمان بۆ تۆمار دەكەن، بۆ نموونە پانی رێگاكە و كێمان لەگەڵ بوو و شێوە و رەنگی ئۆتۆمبێلەكەی بەرامبەرمان چۆن بوو، بەڵام لەوزەی مێشك شەپۆلێك لە دڵەڕاوكێ دەنێرێتە مێشك هەركاتێ وەستمان لە بارودۆخێكی هاوشێوەدا پێش ئۆتۆمبێلێك بكەوینەوە.

ناوەندی دووەم کە تایبەتە بە کاردانەوەکانی هاوپێچی ئەو رووداوانە، کە بریتییە لە لەوزەی مێشك.

**گوونجان لەنێوان بیرکردنەوەو کاردانەوە = هاریکاری نێوان دوو عەقڵەکە**

دابەشکردنی (لۆژیکی) و (کاردانەوەیی) لە جیاکردنەوەی بەربڵاو لەنێوان عەقڵ و دڵدا، بۆنموونە کاتێك مرۆڤێك بە دڵی هەستدەکات کە شتێك راستە، ئەوە جۆرێك لە زانینە کە ئەوە رەتناکاتەوە کە دەکرێ بە عەقڵی لۆژیکیش هەستی پێبکرێت.

هاوسەنگییەکی ورد هەیە لەنێوان عەقڵی لۆژیکی و عەقڵی کاردانەوەیی، بەڵام ئەگەر هەست و سۆزەکان سنووری هاوسەنگییان تێپەڕاند، ئەوا لەو کاتەدا عەقڵی کاردانەوەیی دەبێتە گەورەی هەڵوێستەکە و عەقڵی لۆژیکی بەلاوە دەنێت[1].

هەروەها لێکۆڵەرەوان سەلماندوویانە کە لەوزەی مێشك (عەقڵی کاردانەوەیی) هەڵدەستێت بە فەرزکردنی دەسەڵاتی بەسەر کۆئەندامی دەماری خۆنەویستانە و ئاراستەی دەکات تا بە کاردانەوە هەڵبستێت، بەرلەوەی زانیارییەکە بگاتە توێکڵی مێشك (عەقڵی هەست پێکەر)، هەروەك لە چیرۆکی ماتیلدا کە پێشتر باسمان کرد روویدا.

لەرێی پەیوەندییەکانی نێوان لەوزەی مێشك و توێکڵی مێشك و دەزگای دەماریی خۆنەویستانە، عەقڵی کاردانەوەییمان و یادەوەری خۆنەویستانە و ئەزموونی دەروونیمان و گوونجانی دەروونیمان[2] کاردەکەنە سەر هەست کردنمان و کردار و رەفتار و بیرکردنەوەمان. هەروەك چۆن کاردەکاتە سەر فەرمانەکانی تری لاشەمان.

---

(١) ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو ئاماژانەی دەمارە خانەکان لە لەوزەی مێشك بۆ توێکڵی مێشك هەڵیان دەگرێت زیاترن لە ئاماژە پێچەوانەکان.

کەناڵەکانی پەیوەندی (دەمارە خانەکان) لەنێوان توێکڵی مێشك و لەوزەی مێشك ناوەندی هەموو ناکۆکییەکان و هەموو رێککەوتنەکانی نێوان عەقڵ و دڵە، واتە نێوان بیرکردنەوە و هەست کردن. روودانی هەر کەم و کوورپییەك لەو دەمارە خانانەی نێوان ئەو پێکهاتانەی مێشك، کە بە وردی رێکخراون، دەبێتە هۆی تێکچوونی گوونجانی دەروونیی-دەماریی زۆر توونږ.

(٢) گوونجانی دڵ بریتییە لە رێکی لێدانەکانی دڵ، لەباسی دواتردا بەدرێژی ئەوە روووندەکەینەوە.

لەبەر ئەوە دانییێل گۆلمان[1] لە کتێبەکەیدا (زیرەکیی کاردانەوەیی Emotional Intelligence) ئەوە دووپات دەکاتەوە کە زیرەکی مرۆڤ بەتەنیا دەرەنجامی چالاکی عەقڵ نییە، بەڵکو بەرێژەیەکی زۆر کاریگەرە بە لایەنە دەروونییە جیاوازەکان، وەك خوێنگەرمیی و هێزی پاڵنەر و هەستکردن بە تاوان و ئارەزووکردن لە بەدیهێنانی خوددا. گۆلمان ئەوە دووپات دەکاتەوە کە پەیوەندی نێوان عەقڵی لۆژیکی و عەقڵی کاردانەوەیی لە مێشکماندا چەسپێنراوە Hardwired.

## گەشەکردن و عەقڵی کاردانەوەیی :

پەروەردە و گەشەکردن رۆڵێکی گرنگی هەیە لە ئاراستەکردنی عەقڵی کاردانەوەیی، ئەگەر مرۆڤ لە ژینگەیەکی پڕ لە هەستی ترس و تووڕەیی گەورە ببێت، ئەوا بەو هەستانە رادێت و هیچ بێزاری ناکەن ئەگەر لە ئاییندەدا بەسەر خۆیشیدا تێپەڕن. بەپێچەوانەشەوە ئەگەر مرۆڤ لە کەشێکی پڕ لە خۆشەویستیی و ئارامیدا گەورە ببێت ئەوا لەگەڵ ئەو هەست و سۆزانە رادێت. مامۆستای پزیشکیی دەروونی و نەشتەرگەری دەمار د. کارل پریبرام[2] ئەم رۆڵەمان بۆ رووندەکاتەوە، بەوەی کە ئەزموونەکانی پێشووترمان لەگەڵ یادەوەری کاردانەوەیی لە مێشکدا (لەوزەی مێشك Amygdala دەلکێنرێن، بۆ ئەوەی ئەو ئەزموونە ببێتە پێوەرێك کە ئەزموونە نوێکانی پێ بپێورێن، د. پریبرام زاراوەی جۆرە باوەکان Familial Patterns ی لێناوە.

هەروەك چۆن لە پێکهێنانی جۆرە باوەکاندا بەشداری دەکات لە ناوەندی یادەوەری تێخستنەکان Inputs لە ناوەوەی لاشەی مرۆڤدا. لە بەهێزترین ئەو تێخستنە ناوەکییانەش ئیقاعی لێدانە گوونجاوەکانی دڵە، کە پێی دەگوترێت گوونجانی دڵیی.

---

(١) دانیال گۆلمان و کتێبەکەی زیرەکی کاردانەوەیی کە لەساڵی ١٩٩٦ بڵاوی کردەوە، دوو ناوی بەناوبانگن لە جیهانی پزیشکیی دەروونیدا، تا ئەو ئاستەی کە چەمکی Emotional Intelligence باشترین چەمك بوو کە خرابووە ناو زمانی ئینگلیزی بۆ چەندین ساڵ.

(٢) کارل پریبرام Karl Pribram لەساڵی ١٩١٩ لەدایك بووە، مامۆستای پزیشکیی دەروونی و نەشتەرگەری دەمارە لە زانکۆی ستانفۆرد لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و، لێکۆڵەرێکی دیاری بواری پەیوەندی نێوان دەزگای دەمار و هەستەکانی مرۆڤ و کاردانەوە و رەفتارەکانیەتی.

ئەگەر ڕووداوی وا بەسەر مرۆڤدا تێبپەڕێت کە پێچەوانەی جۆرە باوەکان بێت کە لە یادەوەری کاردانەوەییدا تۆمارکراون، ئەوا ئەو کەسە هەست بە هەست و کاردانەوەی خراپ و ماندووکەر دەکات و هەست بە نەبوونی گوونجانی دەروونی دەکات. هەروەك چۆن مرۆڤ هەست بە هەمان هەست و کاردانەوە دەکات ئەگەر ناڕێکییەك لە ڕێژە و گوونجان و ڕێکخراوی لێدانەکانی دڵدا ڕوویدات (نەگوونجانی دڵیی) و لەباسی دواتردا ئەوە ڕوونده‌کەینەوە.

**خوێنەری بەڕێز...**

لەوەی تێپەڕی بە جۆرێك باسمان لە بایۆلۆجیای عەقڵ کرد، بەوپێیەی کە ناوەندی هەستی دینداری بریتییە لە لەوزەی مێشك (عەقڵی کاردانەوەیی)، هەروەك چۆن ئەو هەستانە و ئەو ناوەندە لەژێر دەسەڵاتی توێکڵی مێشکدایە (عەقڵی لۆژیکی). هەروەها ئەو زانیارییە پێویستە بۆ تێگەیشتن لەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر ڕۆڵی دڵ لە هەستە ئایینی و ڕووحییەکان .

## زیرەکیی ڕووحیی !

گومان لەوەدا نییە کە تاقیکردنەوە باوەکانی زیرەکی زۆر لایەنی زیرەکی مرۆڤیان پشتگوێ خستووە، وەك لایەنی کاردانەوەیی و لێزانیی کۆمەڵایەتی، تا وایلێهاتووە کە وشەی زیرەکی بۆتە هاوواتای توانای زانستی و سەرکەوتن لە خوێندندا.

لە ساڵانی دواییدا، زانایانی زانستە دەروونییەکان چەند جۆرێکی زیرەکییان خستەڕوو کە لەسەر توانای عەقڵی و سەرکەوتن لە خوێندن بنیات نەنراوە و زۆر بیردۆز لەم بوارەدا دەرکەوتن، کە گرنگترینیان بیردۆزی زیرەکیی جۆراوجۆربوو Multiple Intelligence Theory[1] کە لەلایەن Howard Gardner خرایەڕوو.

---

(١) هاوەرد گاردنەر مامۆستا لە زانکۆی هارڤاردی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بۆیەکەم جار لەساڵی ١٩٨٣ لە کتێبەکەیدا بەناوونیشانی (چوارچێوەکانی عەقڵ) بڵاو کردەوە و بۆماوەی زیاتر لە ٢٠ ساڵ کاری لەسەر پێشخستنی کرد.

بوونی چەند جۆرێکی زیرەکی سەرنجی گاردنەریان ڕاکێشابوو و چەند شتێکی تێبینی کردبوو:

بیردۆزی گاردنەر سەلماندی کە تەنیا جۆرێك لە زیرەکی مرۆڤایەتی بوونی نییە، بەڵکو چەند جۆرێك زیرەکی بوونی هەیە، کە هەر یەکێکیان شێوازێکی تایبەت بەخۆی هەیە و هەر یەکێکیان ناوەندێکی سەربەخۆ لە مێشکدا داگیردەکات کە بە پشکنینە تیشکییەکان دەرکەوتوون.

گاردنەر لە بیردۆزەکەیدا هەشت جۆر زیرەکیی خستۆتەڕوو[١]، پاشان دوو جۆری تریشی باس کردووە(کە بواری گرنگیدانی ئێمەن)، ئەوانیش زیرەکی ڕووحی Spiritual Intelligence و زیرەکی بوون Existential Intelligence[٢] کە گرنگی دەدەن بە پرسەکانی سەروو هەست و پرسە سەرەکییەکانی بوونی مرۆڤ.

---

أ- ڕوودانی هەر کەم و کوڕییەك لە مێشکدا دەبێتە هۆی ڕوودانی کەم و کوڕی لە جۆرێکی دیاریکراوی زیرەکی بەبێ زیان گەیاندن بەجۆرەکانی تر.

ب-بوونی کەسی گێلی زیرەك Idiot savants ئەوانەی هەندێك توانای زۆر بەرزیان هەیە بەبەراورد بە توانا نزمەکانی تریان، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو توانایانە سەربەخۆن و هەر یەکێکیان ناوەندێکی جیاوازی لە مێشکدا هەیە.

ج- ڕوودانی تێهەڵچوون لەنێوان دوو کاری عەقڵی وەك خوێندنەوەی وتارێك و گوێگرتن لە ڕاپۆرتێك، کە ئاماژەیە بۆ بوونی(زیرەکی زمانەوانیی)، لەکاتێکدا یەکنەگرتنەوەی خوێندنەوەی وتارێك و گوێگرتن لە پارچە مۆسیقایەك ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هەریەکەیان پشت بە جۆرێکی سەربەخۆ لە زیرەکی دەبەستێت(زیرەکی زمانەوانیی و زیرەکی مۆسیقی)، هەروەها مرۆڤ دەتوانێت لەکاتی شۆفێریدا(زیرەکی شوێنی) لە مێشکیدا بەهەندێك کرداری حیسابی هەڵبستێت(زیرەکی لۆژیکی- بیرکاری).

(١) هەشت جۆرە زیرەکییەکە ئەمانەن:

١- زیرەکی زمانەوانی

٢- زیرەکی لۆژیکی-بیرکاری

٣- زیرەکی شوێنی

٤- زیرەکی مۆسیقی

٥- زیرەکی جەستەیی- جووڵەیی

٦- زیرەکی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی دی.

٧- زیرەکی تێگەیشتنی خوود.

٨- زیرەکی پۆلێنی.

(٢) کاتێك هاوەرد گاردنەر چەمکی(زیرەکی ڕووحی Spiritual Intelligence)ی بەکارهێنا دژایەتییەکی گەورەی کرا لەلایەن ئەوانەی کە پێیان وایە هەرچی دەدرێتە پاڵ ڕووح نابێتە زانست، بۆیە دەستەواژەی زیرەکی بوون Existential Intelligenc ی بەکارهێنا بۆ وەسف کردنی هەموو ئەو شتانەی دەیدانە پاڵ زیرەکی ڕووحی.

لە ماوەی دە ساڵی سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم، توێژەرانی زانستەکانی مێشك و دەمار و زانستی دەروونی و زانستی کۆمەڵایەتی و ئایینەکان بەشێوەیەکی بەرچاو گرنگییان بە زیرەکی ڕووحی دا[١].

**دەکرێ بە بەراوردکردنی زیرەکی ڕووحی بە جۆرەکانی تری زیرەکی لە مەبەستی زیرەکی ڕووحی تێبگەین:**

- زیرەکی لۆژیکی     تایبەتە بە بیرۆکەکانم
- زیرەکی کاردانەوەیی     تایبەتە بە هەستەکانم
- زیرەکی ڕووحی     تایبەتە بە من کێم؟

هەروەك زۆرێك لە چەمکە نامادديیەکان، قورسە پێناسەیەك بۆ زیرەکی ڕووحی دابنرێت، بەڵام دەکرێ بە زانینی پێکهاتەکانی لە زیرەکی ڕووحی تێبگەین، هەروەها لەڕێی تێبینی کردنی دەرەنجامەکانی ئەو زیرەکییە لە ژیانماندا.

---

(١) ئەو زانیارییانەی لێرەدا خراونەتەڕوو دەربارەی توانای زیرەکی رووحی لە کتێبی پێشەوایانی ئەو بوارە وەرمگرتووە، لەوانە:

١- دانە زوهار Dana Zohar : ژنە زانایەکی ئەمریکییە لە ساڵی ١٩٤٥ لەدایك بووە.
فیزیا و فەلسەفەی خوێندووە MIT و ئایینەکان و پزیشکیی دەروونی لە زانکۆی هارڤارد خوێندووە.. خۆی و مێردی Ian Marshall لە پێشەوایانی لێکۆڵینەوەی بواری زیرەکی رووحین. زۆر لێکۆڵینەوەی هەیە، جگە لە چوار کتێب دەربارەی جێبەجێکردنی فیزیای چەندیی لەسەر تێگەیشتن لە خوود و عەقڵ و کۆمەڵگە. لە چەند زانکۆیەکی جیهان وانە دەڵێتەوە.

٢- رۆبێرت ئیمۆنز Robbert Emmons: مامۆستای زانستی دەروونییە لە زانکۆی کالیفۆرنیا- گرنگی دەدات بە پەیوەندی نێوان کەسایەتی و کاردانەوەکان و ئایینەکان. سەرۆکی گۆڤاری زانستی دەروونناسی ئەرێنی The Journal Positive Psychology ە.

٣- تۆنی بوزان Tony Buzan : لە ساڵی ١٩٤٢ لە لەندەن لەدایك بووە.
زانستی دەروونناسی و بیرکاری و زانستەکانی خوێندووە. خاوەنی چەمکی نەخشەکانی عەقڵە Mind Mapping . بەڕاستەوخۆیی یان بە ناڕاستەوخۆیی بەشداری لە دانانی سەد کتێب کردووە لەو بوارانەی لە زۆربەی وڵاتانی جیهان ئامادەیان بووە، وەکو نەخشەکانی عەقڵ و تواناکانی مێشك و یادەوەری و داهێنان و بلیمەتی و زیرەکی رووحی.

٤- فرانسیس ڤۆگان Frances Vaugan : مامۆستای زانستی دەروونییە لە زانکۆی کالیفۆرنیا، بەشداری دامەزراندنی کۆمەڵەی پزیشکیی دەروونیی و رووحی کردووە، سەرۆکی یەکێتی پزیشکیی و رووحییە و، ئەندامی زۆرێك لەو کۆمەڵانەیە کە گرنگی بەو بابەتە دەدەن.

٥- کاسلین نۆبڵ Kathleen Noble : مامۆستای زانستی دەروونییە لە زانکۆی واشنتن. و زۆر کتێبی لەسەر زیرەکی رووحی داناوە و، هەروەها کێشە دەروونییەکانی ئافرەتان.

**پێکهاتەکانی زیرەکی ڕووحیی :**

١- هۆشیاری دەربارەی خوود: زانینی بیروباوەڕەکانم و، پێگەم لە بووندا و، پاڵنەرە قووڵەکانم.

٢- دەرك کردن بەوەی کە جیهانی ماددی بەشێکە لە ڕاستییەکی گەورە، کە پەیوەندییەکان پێیانەوە دەمانبەستنەوە.

٣- توانای خستنەڕووی پرسیارە مەعریفییە کۆتاییەکان و، توانای تێگەیشتن لە وەڵامەکانی.

٤- توانای بەرزبوونەوە لە ئاست چەمکە ماددییەکان، بۆ ئاستێکی بەرزتر و گەورەتر و قووڵتر.

٥- ژیان بەپێی بنەما و بیروباوەڕ و پێشەنگیی.

٦- ڕێزدانان بۆ چەمکە ڕووحییەکان لە مامەڵەکردنی ڕۆژانەماندا.

٧- بوونی قەناعەتێکی تایبەتی بەرامبەر بابەتەکان، ئەگەر لەگەڵ زۆرینەشدا ناکۆك بی.

٨- خۆبەکەمزانیی، و زانینی قەبارەی ڕاستەقینەمان لە جیهاندا و، زانینی ئەوەی کە ئێمە تاکێکین لە کۆمەڵێك.

٩- قبووڵ کردنی بەرامبەر کە بەتەواوی لە ئێمە جیاوازە.

١٠- وەڵامدانەوەی فیترەت بۆ هاوکاریکردنی کەسانی دی.

١١- دەستگرتن بە ڕەوشت و، دەستگرتن بە پاکیی.

١٢- هەستکردن بەوەی کە بەختەوەریم لە ناخمدا هەڵدەقووڵێت، نەك لە دەستکەوتی کرداری یان ماددی.

١٣- بەهێزی عەقڵ و بیرتیژی و دووربینی و وردبینی.

**کاریگەرییەکانی زیرەکی ڕووحی لەسەر ڕەفتارەکانمان و ژیانی ڕۆژانەمان**

١- مامەڵەکردنی حەکیمانە لەگەڵ بەڵاو نارەحەتییەکان، لەجیاتی تووڕەبوونی کوێرانە و لۆمەکردنی کەسانی دی.

٢- وەرگرتنی هەڵوێستی ئەرێنی لە ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکاندا.

٣- سوپاسگوزاری لەسەر هەموو شتێك، تەنانەت لەسەر مەینەتییەکانیش.

٤- مامەڵە نەکردن بە خۆپەرستانە.

٥- بینینی جوانی ناوەوە لە هەموو شتێکدا.

٦- هێنانەنەوەی پۆزش بۆ خەڵك و، وەرگرتنی داوای لێبووردنەکانیان.

٧- هەستی بەزەیی و سۆزداری لە مامەڵە کردن لەگەڵ کەسانی دیدا.

٨- پاراستنی ژینگە.

٩- بەکارهێنانی شتەکان بە دانایی و نەرم و نیانی و، فڕێ نەدانی و، چاککردنەوەی و دووبارە سوود لێوەرگرتنەوەی.

١٠- جێهێشتنی ئەو شوێنانەی سەردانیان دەکات بەشێوەیەکی باشتر و پاکتر لە پێشتر.

لە سەرنجدانی پێکهاتەکان و کاریگەرییەکانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پێوەری زیرەکی ڕووحی کارێکی زۆر قوورسە، بەڵام مەحاڵ نییە، چونکە چەند تاقیکردنەوەیەك بۆ پێوانی ئەو زیرەکییە دانراون.

پێویست نییە کە زیرەکی ڕووحی بەباوەڕ بە ئایینێکی دیاریکراو ببەسترێتەوە. چونکە دەکرێ کەسێك بە ئەندازەیەکی گەورە زیرەکی ڕووحی هەبێت و سەر بە هیچ ئایینێکیش نەبێت. لەوانەشە کەسێك زۆر دەمارگیربێت بۆ ئایینێك و زیرەکی ڕووحی کەمی هەبێت.

لە کۆتاییدا، ئایا لەگەڵمدا هاوڕای کە زیرەکی رۆحیی رێك ئەو شتە بێت کە ئێمە بەناوی (ویژدان) ناسیومانە؟

## ناوەندەکانی دینداری لە مێشکدا !

**ناوەندەکانی دینداری لە عەقڵی کاردانەوەییدا...**

لە کتێبی (تارمایی ناو مێشك Phantoms in the Brain)دا نووسەرەکەی د.راماشاندران[١] (مامۆستا و سەرۆکی ناوەندی لێکۆڵینەوەکانی بایۆلۆجیای مێشك و دەمار لە زانکۆی کالیفۆرنیا) دەڵێت: باوەڕبوون بە بابەتەکانی دەرەوەی سنووری سرووشت لە هەموو ژیارستانیەتە کۆن و نوێکاندا بوونی هەبووە، بە شێوەیەك کە ناچارمان دەکات لە مێشکدا بەدوای بنچینە بایۆلۆجییەکەیدا بگەڕێین. چونکە هیچ شتێك وەك ئەمەیان مرۆڤ لە زیندەوەرەکانی تر جیا ناکاتەوە.

د.راماشاندران پێمان دەڵێت کە خەڵکی گشتی بە چرکەساتی وادا تێدەپەڕن کە هەست بە بەرزبوونەوەی ڕووحی دەکەن و، هەست بەوە دەکەن کە لە حەقیقەت نزیك دەبنەوە، کاتێك گوێ لە مۆسیقا دەگرن یان دیمەنێکی سرووشتی دڵڕفێن دەبینن. هەرچی ئەوانەن کە لەبیرکردنەوەی قووڵ راهاتوون وەك سۆفییەکان و راهیبەکان، ئەوا بەشێوەیەکی قووڵتر و زیاتر هەست بەو هەستانە دەکەن. لەنموونەی ئەم جۆرە بەرزبوونەوە ڕووحییانە ئەوەیە کە ئەنیشتاین بۆمان باس دەکات کە هەست و سۆزە ڕووحییەکان (دوور لە هەر ئایینێك) لەکاتی گەڕان لە بابەتێك لە بابەتە زانستی و گەردوونییەکان زیاتر دەبێت.

راماشاندران لێکۆڵینەوەکانی لەسەر دەزگای حوفی Limbic System ئەنجامداوە کە دەکەوێتە ناوەڕاستی مێشك و بەرپرسە لە فەرمانە هەستیی و

---

(١) راماشاندران بە مارکۆپۆلۆی زانستەکانی مێشك و دەمار وەسف دەکرێت(مارکۆپۆلۆ گەڕیدەو دۆزەرەوەی بەناوبانگی سەدەکانی ناوەڕاستە) هەروەها بە پۆل برۆکای زانستی هاوچەرخ ناوزەد دەکرێت(پۆل برۆکا دامەزرێنەری زانستەکانی مێشك و دەمارە).

کاردانەوەییەکان. لەکاتی چالاك کردنی ئەو ناوچەیە (بە بەکارهێنانی بواری موگناتیسی) وەلامی لاشەیی و هەستیی و کاردانەوەیی روودەدا، لەوانە هەستکردن بە چێژێکی ڕووحی بێ وێنە، کە هەندێکیان وەسفیان کردووە: هەست بە بوونی خودا دەکەم، هەست دەکەم لەگەڵ خودا لە پەیوەندی دام، هەست بە یەکبوون لەگەڵ بووندا دەکەم...

راماشاندران لێکدانەوە دەکات بۆ هەستکردنمان بە هەستە رۆحییەکان لەو کاتەی بۆنی دار بخورێك دەکەین لە پەرستگادا، بەوەی دەزگای حووفی لە تەنیشت ناوەندی بۆن کردنە، بەڵکو وەك بەشێك لەگەڵ کۆرپە درووست دەبێت، پاشان چالاکی ناوەندەکانی بۆن کردن دەبێتە مایەی چالاك کردنی ناوەندی هەستە رۆحییەکان لە دەزگای حووفیدا.

**ناوەندەکانی دینداری لە عەقڵی لۆژیکیدا :**

د.ئاندرۆ نیوبێرگ و د.یوجین داکویلی[١] لەکتێبی (بۆچی خودا نایەوێت ون ببێت؟) Why God wont go away? زانستێکی نوێیان خستۆتەڕوو بەناوی Neuro - Theologgy کە تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە بنەما بایۆلۆجییە دەمارییەکانی ڕووحانییەتەکان.

ئەم دوو زانایە لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر راهیبە بووزی و فرانسیسکان ئەنجامداوە لەکاتی بیرکردنەوە و نوێژەکانیان، گەیشتن بەوەی کە هەڵوێستە ڕووحییەکان گۆڕانکاری راستەقینە(کە دەکرێ تێبینی بکرێت و تۆمار بکرێت و وێنەی بگیرێت) لە چالاك بوونی ناوچەی بەرپرس لە وەرگرتن و هەست کرد Otiention Association area لە مێشکدا روودەدات و، ئەو گۆڕانکارییانە دەبنە هۆی ئەو هەستە ڕووحییانەی کە هەستییان پێدەکەین. واتە ئەو هەستانە تەنیا خەیاڵ و ئەندێشە نین[٢].

---

(١) کتێبەکە لەساڵی ٢٠٠١ دەرچووە.

(٢) لە لێکۆڵینەوە زۆرەکانیان، دوو زاناکە بوارە موگناتیسییەکنیان بەکارهێناوە بۆچالاك کردنی ناوچەی بەرپرس لە وەرگرتن و هەست کردن Orientation Assocation area کە دەکەوێتە نزیك دیواری چەپی

لەبەرئەوە دوو دانەرەکە ئەوە دووپات دەکەنەوە کە مێشکی مرۆڤ بەجۆرێك دروستکراوە کە وەڵامی هەستە ئاینییەکان بداتەوە. هەروەك چۆن ئەوەش سەلمێنراوە کە هەستکردن بە خودا لەمێشکی مرۆڤدا چەسپێنراوە Hard wired هەروەك چۆن لە جیناتماندا چەسپێنراوە.

لەساڵی ٢٠٠٩، ناوەندی لێکۆڵینەوەکانی مێشك و بابەتە ڕووحییەکان لە زانکۆی پەنسلڤانیا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، کە د.ئاندرۆ نیوبێرگ سەرۆکایەتی دەکات کتێبێکی دەرکرد بەناوونیشانی: چۆن باوەڕبوون بە خودا مێشکت دەگۆڕێت؟ How God Changes your Brain.

کتێبەکە لەسەر ئەو توێژینەوانە دامەزراوە کە ناوەندەکە لەسەر کۆمەڵێك لە باوەڕدارانی ئایینە جیاوازەکان (بوزی - هیندۆسی- مەسیحی - مسوڵمان)[1] ئەنجامیداوە، بەبەکارهێنانی تەکنیکی تیشکیی هاوچەرخ، بۆ زانینی کاریگەری هەستە ئایینییەکان و ڕووحییەکان لەسەر فرمان و چالاکی مێشك !

**کتێبەکە بەم چوار دەرەنجامەی خوارەوە گەیشتووە:**

١- باوەڕبوون بە خودایەکی بەبەزەیی (نەك خودایەك بەدوای هەڵەکانمانەوەبێت و هەڕەشەی دۆزەخمان لێبکات) بەسە بۆ کەمکردنەوەی دوودڵی و دڵەڕاوکێ و هەستی خۆشەویستی و ئارامیمان لەلا زیاد دەکات.

٢- نوێژکردن و بیرکردنەوەی قووڵ و دڵسۆزانە گەرەنتی ئەنجامدانی گۆڕانکاری تەندرووستین لە فرمان و چالاکی مێشکدا، کە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوە لە بەهاکانی مرۆڤ و تێڕوانینەکانی بەرامبەر بە ژیان.

٣- کاریگەری نوێژ و چالاکییە ڕووحییەکان بەتەنیا لەسەر کەمکردنەوەی ڕێژە و توندی دڵەڕاوکێی مرۆڤ ناوەستێت، بەڵکو ئەنجامدانی ئەو چالاکییانە بۆ

---

مێشك، کە ئەو ناوچەیە بەرپرسە لە هەستکردن بە خوودمان و لە کەسانی دی جیامان دەکاتەوە. لەکاتی چالاك کردنی ئەو ناوچەیە ژنە راهیبە فرانسیسکان وایان هەستدەکرد کە خودا لەگەڵیاندایە، هەروەك چۆن هەستی رووحی بێ وێنەیان هەبوو.

(١) ئاقیکردنەوەی مسوڵمانان لەکاتی نوێژ و خوێندنەوەی قورئان و هێنانی ناوە پیرۆزەکانی خوای پەروەردگار کراوە.

ماوەی بیست خولەك لە ڕۆژێكدا گەرمتییە بۆ هێواش كردنەوەی پیربوون.

٤- ئەو بیرۆكە و بنەمایانەی توندڕەوە ئایینییەكان هەیانە، تووشیی دڵەڕاوكێیان دەكات و دەبنە هۆی وێران كردنی دەمارەخانەكانی مێشك.

**خـــوێنەری بەڕێز:**

لەم گەشتەمان لەگەڵ زانستەكانی بایۆلۆجیا بینیمان كە جیناتمان بەڕۆڵێكی گرنگ هەڵدەستێت لە ئاراستەكردنی مێشك بۆ وەرگرتنی چەمكە ڕووحی و ئایینییەكان، ئەمەش لەڕێگەی دروستكردنی گوێزەرەوەی كیمیایی كە دروستبوونی دەمارەخانەكان ئاراستە دەكات و ناوەندەكانی مێشك كە بەرپرسن لەو هەستانە چالاكیان دەكات.

هەروەك چۆن بینیمان كە پەیوەندی نێوان مێشك و باوەڕ پەیوەندییەكی ئاڵوگۆڕە. چونكە وەك چۆن بوونی ناوەندی بەرپرس لە هەست و سۆزە ڕووحی و ئایینییەكانمان لە مێشكدا سەلمێنراوە، بەهەمان شێوە سەلمێنراوە كە چالاكییە ئایینی و ڕووحییەكان گۆڕانكاری ئەرێنی لە چالاكی مێشكدا ئەنجام دەدەن. دەرەنجامی كارلێكی هەردوو لاش ژیانێكی بێ دڵەڕاوكێتر و پاكترە.

زۆرێك لە دیندارەكان هەڵوێستێكی ناڕوون (لایەنگر یان دژ) لەبەرامبەر دۆزینەوەكانی زانست دەربارەی پەیوەندی نێوان بایۆلۆجیا و هەستە ئایینییەكان هەڵدەبژێرن. ئەو هەڵوێستەش دەگەڕێتەوە بۆ پێداگرییان لەسەر ئەوەی كە بەتەنیا ڕووح تایبەتە بە فیترەت و هەستە ڕووحییەكان و، پێیان وایە كە لاشە (بە جینات و مێشكەوە) هیچ پەیوەندی بە هەستە ئایینییەكانەوە نییە.

گومان لەوەدا نییە كە ئەو هەڵوێستەیان زادەی كەم و كوڕییە لە تێگەیشتن لە سرووشتی هەستەكان و پەیوەندییان بە گوێزەرەوە كیمیاییەكان (كە كاردەكەنە سەر جینات)، و پەیوەندی بە دەمارەخانەكانی مێشكەوە. چونكە هەموو ئەو هەستە ئەرێنی یان نەرێنییانەی هەستیان پێدەكەین، بەرزبن یان نزم، ئەوا بەرهەمی گوێزەرەوە كیمیاییەكان و دەمارەخانەكانن. لەبەرئەوە پێویستە بەدوای ئەڵقەی

پەیوەندی نێوان خودی مرۆڤ (عەقڵ- نەفس- ڕووح) لەلایەك و، بایۆلۆجیا لەلایەکی تردا بگەڕێین. دەرچەی ئەوەش بە نکۆڵی کردن لە بەرهەمەکانی زانست نابێت. لە باسی هەشتەمدا جارێکی تر دەگەڕێینەوە سەر ئەو هەڵوێستەی نکۆڵی کردنە.

لێکۆڵینەوە دەربارەی پەیوەندی نێوان چەمکە ڕووحی و ئایینییەکان بە بایۆلۆجیا تەواو نابێت، بەبێ هەوڵدان بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارێکی زۆر گرنگ: ئایا دڵ پەیوەندی بەم چەمکانەوە هەیە؟ باسی ئایندە بۆ ئەم پرسە تەرخان دەکەین.

## باسی شەشەم : باوەڕ و بایۆلۆجیا -٢

## دڵ و دینداری

دڵ لە فیکری ئایینی و رەوشتیدا هەر لە دێرزەمانەوە پێگەیەکی گرنگی هەبووە، تا ئەو ئاستەی کە لە ئەفسانەکاندا بە جەوهەری مرۆڤ دانراوە و، جەخت لەسەر پێگەی دڵ دەکەنەوە وەك هێزێکی کاریگەر لەسەر ئەنجامدانی چاکە و خراپە. لەبەر ئەوە میسرییە کۆنەکان گرنگی تایبەتییان بە دڵ داوەو لەدوای مردن لە دەفرێکی تایبەتدا لەتەنیشت لاشەی مۆمیاکراودا دایاننناوە، چونکە لەدیدی ئەواندا دڵە کە لەجیهانەکەی تردا گرنگی پێدەدرێت و بەهۆیەوە سەرەنجامی مرۆڤ بۆ سزا یان پاداشت دیاریدەکرێت.

لەبەردی ئیبرزدا (ساڵی ١٦٠٠ پ.ز) لە بەشی تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ هاتووە، کە کەسایەتی و رەفتار و نەخۆشییەکانی دڵ پەیوەندییان بە رۆڵی دڵ و قەبارەی دڵەوە هەیە. هەر لەو بەردییەدا باسی دڵی سپی و دڵی رەش و دڵی گەورە هاتووە، هەروەك چۆن نەخۆشییە دەروونییەکان و نەخۆشییەکانی دڵ گەڕێنراونەتەوە بۆ ناتەندرووستی دڵ، لەبەر ئەوە ئەو نەخۆشییانە وەك نەخۆشی جەستەیی چارەسەر دەکرێن، چونکە ناکرێ دەروون و لاشە لە یەکتر جیا بکرێنەوە. ئەم گرنگیدانە بە دڵ بە درێژایی کات و لە هەموو ژیارستانیەتەکاندا گرنگی پێدراوە، تا وایلێهاتووە بە هەموو زمانە جیهانییەکان دەبیستین دەوترێت، فلان دڵی سپییە و فلان دڵی رەشە و فلان دڵی رەقە و فلان دڵ نەرمە و فلان بەگوێی دەنگی دڵی دەکات و...بەم شێوەیە.

پاشان ئایینە ئاسمانییەکان هاتن تا ئەو چەمکە دووپات بکەنەوە، ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت :

﴿ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ ﴾ الحج: ٤٦.

واتە: چاوەکان کوێر نابن، بەڵکو دڵی ناو سینە کوێر دەبێت.

هەروەك چۆن لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (ألا إن في الجسد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله، وإذا فسدت فسد الجسد كله، ألا وهي القلب).

واتە: لە لاشەدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر چاك بوو ئەوا هەموو لاشە چاك دەبێت، ئەگەر خراپ بوو ئەوا هەموو لاشە خراپ دەبێت، ئەویش دڵــە.

هەروەك چۆن مادییگەراکان بیردۆزی داروینیان کردە دەروازەیەك بۆ هێرش کردنە سەر ئایینەکان، بەهەمان شێوە تەوەری دڵیان لە هزری ئایینی و رەووشتیدا کردە دەروازەیەکی دی بۆ هێرش کردن. بەو پێیەی کە چەمکی زانستی باو وایدەبینێت کە هەموو کردارە عەقڵی و سۆزداری و رەووشتی و رەفتارییەکان لەلایەن مێشك/عەقڵ ئاڕاستە دەکرێن، و دڵ هیچ رۆڵێکی تێدا ناگێڕێت.

لە هەمان کاتدا، زانستە شیکارییەکان و فەرمانی ئەندامەکانی لاشە تا سی ساڵی رابردووش وەك ترومپا (مزەخە) سەیری دڵیان دەکرد، کە دوای پڕکردنی لە ئۆکسجین دووبارە خوێن کۆ دەکاتەوەو دابەشی دەکاتەوە. هەروەها مێشك هەڵدەستێت بە دیاریکردنی هێزو ژمارەی لێدانەکانی دڵ لە خولەکێکدا، بەپێی پێویستی لاشە[1].

---

(١) مێشك هەڵدەستێت بە رێکخستنی کاری دڵ لەرێگەی دەمارێکی چالاککەر کە بە دەماری سیمپتاوی ناسراوە، هەروەها دەمارێکی تریش کە رۆڵی هێورکەرەوە دەبینێت و پێی دەگوترێت جارسیمپتاوی، ئەو دوو دەمارەش پێکەوە دەزگای دەماری خۆنەکرد پێکدەهێنن، کە مرۆڤ هیچ دەسەڵاتێکی بەسەردا نییە.

لە دۆخی ناساییدا دڵ زیاتر لە سەد هەزار جار لەرۆژێکدا گرژ دەبێت و خاودەبێتەوە. جا کاتێك تەمەنی مرۆڤ دەگاتە حەفتا ساڵ، ئەوا ملیۆنێك بەرمیل خوێنی دابەشکردووە، ئەمەش لەرێی تۆڕێکی دەماری خوێنی زۆر وورد کە درێژییەکەی دەگاتە سەد هەزار کیلۆمەتر.

لە ماوەی چارەگی کۆتایی سەدەی بیستەمدا، تەقینەوەیەکی زانستی زۆر گەورە لە بواری زانستەکانی دڵدا روویدا، کە توێژینەوە یەك لەدوای یەکەکان دەیان سەلماند کە دڵ تەنیا ترومپایەك نییە و پەیوەندی نێوان دڵ و مێشك پەیوەندی نێوان کۆیلە و گەورە نییە، بەڵکو سەرۆکایەتییەکی بە نۆرەیە. ئەو راستییە زانستییانە وەك خەیاڵێکی زانستی وابوون لەبەر نامۆییان و پێچەوانەییان لەگەڵ چەمکە باوەکاندا. لێرەدا هەندێك لەو راستییانە دەخەینەڕوو:

**یەکەم: دڵ موگناتیسێکی بەهێز و بەرهەمهێنەرێکی چالاکی کارەبایە**

ماسوولکەی دڵ لە سەدان هەزار خانەی ماسوولکەیی تێکچەقیو پێکدێت کە وەك یەکەیەکی یەکگرتوو کاردەکەن، کە خوێن لە چوار رێگاوە پاڵدەدات تا دەگاتە زگۆڵەی چەپ کە دەکاتە دوا وێستگە و ئەویش پاڵیدەداتە خوێنبەر و ئەویش خوێن دەگەیەنێتە هەموو بەشەکانی لاشە.

هەموو خانەیەك لە خانە ماسوولکەییەکانی دڵ بوارێکی کارۆموگناتیسی هەیە[١]، کە وێنای ئەو زمانە دەکەن کە خانەیەك لەگەڵ خانەکانی تری دەوروبەریدا بەکاری دێنێت.

خانە وەرگرەکان هەڵدەستن بە کردنەوەی کۆدی ئەو نامە کارۆموگناتیسیانە و لەگەڵیدا کارلێك دەکەن بە دیاریکردنی هێز و ئاراستە و کاتی گرژبوونەوەی، ئەمەش رەنگدانەوەی دەبێت لەسەر بارودۆخی سرووشتی لەسەر شێوەی گۆڕانکاری تێبینی نەکراو لەسەر رێژە و رێکخراوەیی لێدانەکانی دڵ، ئەو گۆڕانکارییانە لە هێڵکاری دڵدا بەڕوونی دیارن و پێیان دەگووترێت گۆڕانکاری رێژەی لێدانەکانی دڵ[٢] Heart Rate Variability (HRV).

---

(١) لەڕێی سیستەمی conducting system خانە ماسوولکەییەکانی دڵ رێکدەکەون، کە لە ناوەندی دەماریی و تۆڕی دەماریی فراوان پێکدێت، بەهۆیەوە نامەکان لە شێوەی لێدانی کارەبایی دەگوازرێنەوە.

(٢) McCraty, R,M,Atkinson, et al.(1995). The effects of emotions on short term heart rate variability using power spectrum analysys American Journal of Cardiology 76:1089-1093.
Umetani,K,D,H. singer, et al.(1998). Twenty-four hours time domain heart rate variability and heart rate:relations to age and gender over nine decades. Journal of the American collage of Cardiology31(3): 593-601.

دەکرێ چالاکی کارەبایی ماسوولکەی دڵ لە هەر شوێنێکی پێستی مرۆڤدا تۆمار بکرێت، بە بەکارهێنانی تۆمارکەری کارەبایی دڵ ECG . بەهێزی ئەو چالاکییە شەست ئەوەندەی بەهێزی چالاکی کارەبایی مێشك دەبێت، کە تەنیا دەتوانرێت لە سەردا تۆمار بکرێت، لەرێگەی نەخشەی کارەبایی مێشك EEG .

گۆڕانکارییەکانی چالاکی کارەبایی دڵ دەبنە هۆی بەرهەمهێنانی بوارێکی موگناتیسی گۆڕاو بە دەورەی دڵدا (هەروەك چۆن بیردۆزی کارۆموگناتیسی ماکسوێل ئەوە دەسەلمێنێت). هێزی ئەو بوارە موگناتیسییە ٥٠٠٠ ئەوەندەی هێزی بواری موگناتیسی مێشکە، دەکرێ لە دووری ٢-٣ مەتر لە دووری لاشەی مرۆڤ هەستی پێبکرێت[١].

تاقیکردنەوەکان سەلماندوویانە کە بواری کارۆموگناتیسی دڵ کاریگەری هەیە لەسەر (شەپۆلە کارەبابیەکانی ئەلفا) کە لە مێشك دەردەچن و لە کاتی حەسانەوەدا چالاك دەبن، دەکرێ ئەوەش لە رێی نەخشەی کارەبایی مێشك هەستی پێبکرێت[٢].

هەروەك چۆن بەم دواییانە بە بەکارهێنانی ئامرازی تۆمارکەری ورد سەلمێنراوە کە روودانی کارلێکی نێوان دوو بواری کارۆموگناتیسی دڵی دوو کەسی تەنیشت یەك لە هەندێ بارودۆخدا دەبێتە هۆی گونجان و نزیك بوونەوەو لە هەندێ کاتیشدا دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە[٣].

ئەگەر زۆرێك لە توێژەران رەخنە لە ئەنجامی ئەو توێژینەوانە بگرن، بەڵام تێکگیرانی بوارە کارۆموگناتیسییەکان بابەتێکی سرووشتی فیزیاییە و هەموومان

---

(١) Damasio, A. R. (1994). Descartes Error, Emotion, Reason and the human Brain. NY, G.p. putnams Sons.

Watkins, A. D. (1995). Prrceptions, emotions and immunity: an integrated homeostatic network. Quarterly Journal of Medicine 88: 283-294.

(٢) Gahery, Y. and D. Vigier (1974). Inhibitory effects in the cuneate nucleus produced by va-goartic zfferent fibers. Brain Research 75: 241-246

Mc Craty , R. and M. Atkinson (1999).Influence of afferent cardiovascular input on cognitivr performance and alpha activity. Proceedings of the Annual meeting of the pavlovian society, tarytown. NY.

(٣) Rein,G., M. Atkinson, et al.(1995).The Phisiological and psychological effects of compassion and anger. Journal of Advancement in Medicine 8(2): 87-105.

لە تەشویش و تێکگیرانی تۆڕەکانی مۆبایل و ئامێرە ئەلیکترۆنییەکانی تر هەستی پێدەکەین.

## دڵەکانمان چی دەڵێن؟

ئەگەر سەرنجی ئەو شەپۆلە جیاوازانە بدەین کە لە دڵەوە دەردەچن، دەبینین کە لەڕووی خێرایی و هێواشییەوە جیاوازن؛ ئەو دەنگانەی پزیشکەکان لە ڕێی بیسەرەوە گوێی لێدەگرن شەپۆلەکانی هێواشن، جا کاتێك لە قوڵەوە وەریدەگرن هێواشترە، بەڵام شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان زۆر خێران و خێراییەکەشیان لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر جیاوازە وەك لە هێڵکاری دڵدا دەردەکەوێت.

با ناوەڕۆکی ئەو نامانە بێنینە بەرچاومان کە شەپۆلە جیاوازەکان هەڵیانگرتوون، بەراورد بکە لە نێوان کاریگەری هێمنکەرەوەی لێدانی دایك لە پشتی منداڵەکەی لە کاتی گریاندا، لەگەڵ کاریگەری کاتی سەیرکردنی فلمێکی ترسناکدا، هەروەها کاریگەری مۆسیقای خاو و مۆسیقای خێرا لەسەر لێدانەکانی دڵ و خێرایی هەناسەدان و کرداری هەرس کردن و کردارە عەقڵییەکان و لایەنی دەروونیی...

جا ئەگەر بوارە موگناتیسییەکانی دەوروبەرمان بەبێ ئەندازە زانیارییان هەڵگرتبێت[1]، ئەوا ئایا جۆری ئەو زانیارییانە چییە کە دەکرێ شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان لە دڵەوە و بۆ دڵ هەڵی بگرن؟

بە نموونەیەك لەسەر چۆنیەتی مامەڵەکردنی لاشەی مرۆڤ لەگەڵ شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان ڕێ بۆ ئەو وەڵامە خۆش دەکەین:

چاوی مرۆڤ حەوت ڕەنگی سەرەکی لە ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە دەبینێت، کە لە ڕەنگدانەوەو درێژییاندا جیاوازن. تۆڕی چاو ئەو شەپۆلانە دەگۆڕێت بۆ

---

(١) هەوڵدە ئەو ژاوەژاوە بێدەنگە بێنیتە بەرچاوت کە بەرگەهەوای زەوی پڕ کردووە. قسەی مرۆڤەکان بە مۆبایل، پەخشی تەلەفزیۆنی دەیان هەزار کەناڵ لەڕێی مانگە دەستکردەکانەوە، ئەو زانیاریانەی لەڕێی ئینتەرنێتەوە پەخش دەکرێن، هەموو ئەو زانیارییانە شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان هەڵیان دەگرن تا بگەنە ئەو ئامێرانەی توانای وەرگرتنی ئەو شەپۆلانەیان هەیەو دەتوانن هێماکانیان شیبکەنەوە(رادیۆ و تەلەفزیۆن و سەتەلایت و کۆمپیوتەر و....).

هێمای کارەبایی و دەمارەکانی بینین دەیانگوازنەوە بۆ ناوەندەکانی بینین، تا دەگاتە توێکڵی مێشك کە کۆدەکە دەکاتەوەو دەیانگۆڕێت بۆ ڕەنگە جیاوازەکان. کارەکە لێرەدا ناوەستێت، بەڵکو تێکەڵ بوون لە نێوان شەپۆلی ئەو حەوت ڕەنگەدا ڕوودەدات، بۆ ئەوەی بتوانین ژمارەیەکی بێ ئەندازەی ڕەنگەکان ببینین، کە مرۆڤ لە ئێستادا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ داهێنانی تێدا دەکات[١].

لەو نموونەیەدا، مێشك شەپۆلە تێکەڵ بووەکان دەگۆڕێت بۆ ژمارەیەکی بێ سنووری ڕەنگەکان، ئایا ڕۆڵی دڵ لێرەدا چییە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە چەمکێکی زۆر گرنگ دەخەینەڕوو کە ئەویش چەمکی یەکگرتنە.

**پێوەنووسان - یەکگرتن[٢] coherence:**

یەکگرتن هاوکاری و گونجانی نێوان چەند سیستەمێکە کە بە فرمانێکی دیاریکراو هەڵدەستن، بۆ بەرهەمهێنانی فرمانێکی ئاڵۆزتر[٣].

لەلاشەی مرۆڤدا یەکگرتن سێ ئاستی هەیە. یەکگرتنی فسیۆلۆجی (لاشەیی) کە لە هاوکاری و گونجانی هەندێك دەزگای لەشدا دەردەکەوێت لە کاتی ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراودا، وەك ئەوەی لە نێوان ماسولکەی دڵ و

---

(١) لەکاتی تام کردنی خواردندا هەمان شت ڕوودەدات. مەمیلەکانی سەر زمان تامی چوار جۆر تام دەکەن: (ترش - شیرین - تاڵ - سوێر)، ئەو مەمیلانە هەڵدەستن بە وەرگێڕانی ئەو تامانە بۆ شەپۆلی کارەبایی(کۆد) و دەگەنە ناوەندەکانی تام کردن لە مێشکدا، لەوێشدا کۆدەکە دەکرێتەوە. ئەم تامە بنچینەییانە تێکەڵ دەبن و بەمەش ژمارەیەکی بێکۆتایی تامی خواردنە جیاوازەکانمان دەستدەکەوێت کە مرۆڤ دەیانخوات، بە جیاوازی کلتووری خواردنی جیاوازیان .

(٢) Coherence: گونجان: زاراوەیەکە کە ڕۆژانە دێتە پێشمان. گونجان لە مۆسیقادا بریتییە لە ڕێك و پێکی تۆنەکان و دەنگی ئامێرە مۆسیقییەکانە، بۆئەوەی ئاوازێکی خۆش بێتە بەر گوێمان نەك ئاوازێکی نەشاز. گونجان لە فیزیادا بریتییە لە یەکگرتنی زیاتر لە شەپۆلێك بۆ دەرکردنی شێوەیەکی ڕێکخراو، وەك یەکگرتنی فۆتۆنەکانی ڕووناکی بۆ دەرکردنی تیشکی لێزەر.

(٣) Mc Craty, R. (2000). Psychophysiological coherence: A link between positive emotions, stress reduction, performance and health. Proceedings of the Eleventh International Congress on Stress, Manuna Lani Bay, Hawaii.

Childre, D. and B. Cryers (2000). From Chaos to Coherence: The Power to Chang Pemge Performance. Boulder Creek, CA, Planetary.

Tiller, W., R. McCraty, et al. (1996) Cardiac coherence; A new non-invasive measure of autonomic system order. Alternative Therapies in Health and Medicine 2(1): 52 – 65.

کۆئەندامی هەناسە رووەدات بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ئۆکسجین بۆ یاریزانی راکردن لە کاتی راکردندا.

لەسەر ئاستی دەروونیش، گرنگیدەرانی بواری کارۆموگناتیسی دڵ دەستەواژەی (دۆخی یەکگرتن) بەکاردەهێنن بۆ وەسف کردنی هەستە ئەرێنییەکان، وەك خۆشەویستی و رێز و خۆشی سەرکەوتن و، دەستەواژەی (یەکنەگرتن) بەکاردەهێنن بۆ وەسف کردنی هەستە نەرێنییەکان، وەك رق و تووڕەیی و دڵتەنگی و بێهیوایی.

دۆخی یەکگرتنی دەروونی دەبێتە هۆی دروستبوونی یەکگرتنی لاشەیی، کە لە رێك و پێکی لێدانەکانی دڵ و ئارامی کۆئەندامی دەماری خۆنەویستانە و چالاکی مێشك و ئەندامەکانی تری لاشە دەردەکەوێت، لەگەڵ بوونی (یەکگرتنی عەقڵی ) کە دەبێتە هۆی ساف بوونی مێشك و باشتربوونی هەستان بە کردارە عەقڵییەکان و، باشتر بینین و باشتر بیستن و باشتربوونی کاردانەوەکان.

کەواتە، یەکگرتن لایەنی دەروونی و عەقڵی و لاشەیی دەگرێتەوە، کە دەبێتە هۆی چالاکی کردەیی زیاتر و دڵەڕاوکێی کەمتر و بەدیهێنانی ئارامی دەروونیی و هەستکردن بە رەزامەندی و چەندین سوودی تر لەسەر هەر سێ ئاستە جیاوازەکان.

لە بەرامبەریشدا، دۆخی نەبوونی یەکگرتنی دەروونی دەبێتە هۆی نەبوونی یەکگرتنی فسیۆلۆجی، کە لە ناڕێکی رێژەی لێدانەکانی دڵدا دەردەکەوێت و دەبێتە هۆی زیادبوونی چالاکی کۆئەندامی دەماری سێمپتاوی و، ئەمەش دەبێتەهۆی زۆر نەخۆشی دەروونی - لاشەیی، وەك زام (قورحە)ی گەدە و هەوکردنی قۆڵۆن و نەخۆشییەکانی رۆماتیزم و لاوازبوونی بەرگری لەش و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و سنگ کوژە و جەڵتەی دڵ و تەنانەت مردنی لەناکاویش[1].

---

(١) لە دۆخەکانی نەگونجانی دەروونیدا، توێژەران تێبینییان کردووە کە:

أ- نزمبوونەوەی دژە تەنەکان S-IgA کە بە هێڵی بەرگری یەکەم دادەنرێت لە بەرگری کۆئەندامی هەناسەدان و هەرسکردن و دەردان.

ب- کەمبوونەوەی رێژەی هۆرمۆنی DHEA کە بە هۆرمۆنی دژە پیری ناسراوە. کە ئەمەش دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی بەرگری لەش و نەخۆشییەکانی دڵ و بەرزبوونەوەی رێژەکانی شێرپەنجە و زەهایمەر.

هەروەها نەبوونی یەکگرتنی دەروونی دەبێتە هۆی رووданی کەموکوڕی لە یەکگرتنی عەقڵی و لە شێوەی پشێوی و شەکەتی بیروهۆشدا دەردەکەوێت !

لەبەر ئەوە دکتۆر پۆڵ رۆش Paul Rosch (سەرۆکی پەیمانگای ئەمریکی بۆ چارەسەرکردنی دڵەڕاوکێ) دەڵێت کە ٧٥-٩٠٪ لەو نەخۆشانەی سەردانی نۆرینگەکانی دەرەوە دەکەن بۆ پشکنینی سەرەتایی کێشەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی یەکگرتنی دەروونی. هەروەها د.رۆش دەڵێت: چەمکی تەندروستی لە ئێستادا سنووری نەبوونی نەخۆشی تێدەپەڕێنێت واتا تەندروستیی تەنیا مانای نەبوونی نەخۆشی نییە، لەراستیدا تەندروستی بریتییە لە یەکگرتن و گونجان لەگەڵ خۆمان و خەڵك و ژینگەدا.

ئێستاش دەگەڕێینەوە بۆ ئەو پرسەی کە دەڵێت دڵەکانمان چی دەڵێن و چۆن دڵ لەگەڵ بوارە کارۆموگناتیسییەکاندا مامەڵە دەکات و ئەوە چ پەیوەندییەکی بە یەکگرتن و گونجانەوە هەیە؟

## دڵەکانمان چۆن فێری قسەکردن بوون؟

تێکەڵبوونی بوارە کارۆموگناتیسییەکانی کەسانی نزیك یەك دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە لە رەحمی دایکدا کۆرپەلە بووین، ئەو کاتەی بەتەواوی بە بواری کارۆموگناتیسی دڵی دایکمان داپۆشرابووین. ئەمەش لەسەر شێوەی کارلێك کردن و تێکەڵبوونی شەپۆلەکانی وێنەکێشی کارەبایی مێشك و وێنەکێشی کارەبایی دڵی هەریەکە لە دایك و کۆرپەلەدا دەردەکەوێت.

---

ج- بەرزبوونەوەی رێژەی هۆرمۆنی کۆتیزۆن(هۆرمۆنی دڵەڕاوکێ). کە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن و بەرزبوونەوەی رێژەی شەکر لە خوێندا، هەروەها دەبێتە هۆی لاوازی ئێسك و زەهایمەر و لاوازبوونی بەرگری و دواکەوتنی سارێژبوونی برینەکان.

لەبەرامبەریشدا گونجانی دەروونی دەبێتە هۆی زیادبوونی ئاستی هۆرمۆنی دژە پیری بۆ دوو ئەوەندە، هەروەها کەمبوونی هۆرمۆنی دڵەڕاوکێ بۆ دوو ئەوەندە.

Grossarth-Maticek, R. and H. J. Eysenek (1995). Self-regulation and mortality from cancer, coronary heart disease and other causes: A prospective study. Personality and Individual Differences .19(6): 781 – 795

لە ماوەی شیرپێدانیشدا، کاتێك دایك کۆرپەکەی بە نزیك دڵیەوە لە باوەش دەگرێت[١]، توێژینەوەکان سەلماندوویانە کە بواری کارۆموگناتیسی دڵی منداڵ بەشێوەیەکی ورد ڕێکدەخرێت تا لەگەڵ بواری دایکدا بگونجێت.

لەماوەی سکپڕی و شیرپێداندا دایك لەڕێی بواری کارۆموگناتیسییەوە زۆر زانیاری بۆ منداڵەکەی دەگوازێتەوە، سادەترین زانیاری بریتییە لەوەی کە منداڵەکە هەستدەکات کە منداڵێکی خۆشەویستە. لەو بارەیەوە ئیزاك کوخ مامۆستای لووی بیَ بۆری (الغدة الصماء) لە کالیفۆرنیا دەڵێت: شیری دایك بە تەنیا سەرچاوەی خۆراك نییە، بەڵکو ڕێگایەکە کە دایك لەڕێیەوە زانیاری بۆ منداڵەکەی دەگوازێتەوە.

منداڵ کردنەوەی کۆدی شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکانی دڵی دایکی فێردەبێت؛ کە لەناویاندا گەشەی کردووە، بەتەواوی وەك ئەوەی کە زمانی دایك لەو ناوەندەوە فێردەبین کە تێیدا گەشە دەکەین، لەبەر ئەوە دڵەکانمان توانای ئەومیان دەبێت کە ئەو زمانە بخوێننەوە و بەدرێژایی ژیان پێیەوە کاریگەر دەبین و، دڵ توانای ئەوەی دەبێت کە بە هەموو بوارە کارۆموگناتیسییەکانی دەوروبەری کاریگەر ببێت.

ئەمەش واتای ئەوەیە کە دڵ وەك وەرگرێك Reciever یان ئەندامی هەست Sense organ کاردەکات وەك چاو و زمان، بەڵام شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان ناگۆڕێت بۆ ڕەنگ و تام، بەڵکو بۆ هەست و سۆز و کاردانەوە، بۆیە بەرامبەر هەڵوێستێك هەست بە دڵتەنگی دەکەین و، لە بەرامبەر هەڵوێستێکی تردا هەست بە دڵ کرانەوە دەکەین و، بەم شێوەیە[٢].

---

(١) توێژینەوەکە سەلماندوویەتی کە ٪٩٠ ی دایکان لە هەموو ژیارستانییەتەکاندا منداڵەکانیان بەلای چەپ هەڵدەگرن، نزیکی دڵیان. ئەمەش بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە ئارەزوویان لەوەیە کە دەستی ڕاستیان ئازادبێت تا کاری پێبکەن؛ چونکە هەمان شت لەگەڵ ئەو دایکانەشدا ڕاستە کە چەپەن(دەستی چەپ بەکاردەهێنن).

(٢) Paddison, S.(1998). The Hidden Power of the Heart: Discovering an unlimited Source of Intelligence. Boulder creek, CA, Planetary Publications.

Fredrikson, B. (1998). What Good are positive emotions? Review of General Psychology2(3): 300-319.

دڵ بە ناردنی پەیام و زانیاری بۆ مێشك و بەشەکانی تری لاشە وەڵامی ئەو زانیارییانە دەداتەوە کە پێی دەگات، ئەمەش لە شێوەی (هۆرمۆنات کە دڵ دەریان دەدات) یان لە ڕێی دەمار(لە ڕێی کۆئەندامی دەماری خۆنەویستانە) یان میکانیکی(لەشێوەی ڕێکخستنی ئاستی لێدانەکانی دڵ و گۆڕانکاری لە فشاری خوێندا)، ئەمە لەلایەنی پەیامە کارۆموگناتیسییەکان و، پاش کەمێکی تر بە درێژی ئەو بابەتە دەخەینەڕوو.

بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر ڕۆڵی بواری کارۆموگناتیسی دڵی مرۆڤ لە بەدیهێنانی یەکگرتنی دەروونی و عەقڵی و لاشەیی، پسپۆڕانی ئەو بوارە چەند ئاستێکی تر دەخەنەڕوو کە ئەو شەپۆلانە ئەنجامیان دەدەن، لەوانە:

**١-پەیوەندی لەناو لاشەی مرۆڤدا:**

دەکرێ چارەسەر بە دەرزی چینی Acupuncture کۆنترین پراکتیکی بواری کارۆموگناتیسی بێت؛ کە دەگەڕێتەوە بۆ سێ هەزار ساڵ پێش زایین.

ئەم لقەی پزیشکیی چینی کۆن لەسەر ئەو بیرۆکەیە دامەزراوە کە ڕێچکەی وزە (بواری کارۆموگناتیسی) لە ناو لاشەی مرۆڤدا هەیە، کە بەرپرسن لە تەندرووستیی و نەخۆشیی مرۆڤ و ئەو ڕێچکانە لەسەر شێوەی بەشی هەستیار لە لاشەدا دەردەکەون، وەك گوێ و دەست و پێ.

لەبەر ئەوە پسپۆڕانی ئەو بوارە هەڵدەستن بە دانانی دەرزی بچووك لە چەند خاڵێکی دیاریکراوی ئەو ئەندامانەدا، بۆ چارەسەرکردنی ئازار و زۆر نەخۆشی لە شوێنە جیاجیاکانی لاشەدا.

یەکێك لە سەرسوڕهێنەرترین کارەکانی دەرزی چینی بەکارهێنانیەتی لە سڕکردنی نەخۆش پێش نەشتەرگەری[١].

---

(١) پزیشکیی سەردەم سەرکەوتنی ئەم تەکنیکەی بە بیردۆزی(دەروازە Gate) وەسفکردووە. ئەم بیردۆزە وای دەبینێت کە ئەو لەرینەوەیەی پسپۆڕان بەهۆی ئەم دەرزییەوە لە لاشەدا دروستی دەکەن، هەڵدەستن بە ناردنی شەپۆلگەلێك کە هەڵدەستن بە داخستنی ئەو دەروازانەی کە ئازاریان پێدا تێپەڕ دەبێت، بەمەش ئازارەکە ناگاتە مێشك.

بۆ یەکلاییکردنەوەی ئەو سەرسوڕمانەی باڵی بەسەر ناوەندە زانستییەکاندا کێشاوە لەهەمبەر ئەو تەکنیکە، پەیمانگای نیشتمانی تەندروستیی NIH لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەیاننامەیەکی دەرکردووە و بەکورتی دەڵێت: سەرەڕای ئەوەی کە ئەستەمە پزیشکیی چینی کلاسیکی بە چەمکە شیکاری و فسیۆلۆجییەکانی ئێمە لێکدانەوەی بۆ بکرێت، بەڵام نکۆڵی ناکرێت لە کاریگەری دەرزی چینی لە دیاریکردن و چارەسەرکردنی زۆر نەخۆشی.

**٢- پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤدا:**

زانایان گەیشتوونەتە ئەوەی کە بوونی ماددە کیمیاییەکان (کە بە فیرۆمۆنات Pheromonat ناسراون) و لە ئارەقی مرۆڤدا دەردەدرێت و کەسانی دی بۆنی دەکەن (بەڵام هەست بەبۆنەکەی ناکەن) و، دەبێتە هۆی هەڵقوولانی زۆر هەست و سۆز وەك دایکایەتی و خۆشەویستی، یان وەك نەبوونی مەیل لە هاوسەرگیریکردن لەگەڵ ئەندامە نزیکەکانی خێزان.

زۆربەی زانایانی بایۆلۆجی بەو میکانیزمە کیمیاییانە وازیان هێناوە و، هەستیان بە بوونی رۆڵێکی تری گرنگی بوارە کارۆموگناتیسییەکان نەکردووە، جا کاتێك بەم دواییانە هەندێك لە زانایان گرنگییان بەو بوارەدا گەیشتنە چەند دەرەنجامێکی سەرسوڕهێنەر.

بۆیە ئەگەر لە ئێستادا گەنجان باس لە کیمیا بکەن (کە مەبەستیان فیرۆمۆنات)ە بۆ لێکدانەوەی نهێنی سەرنجڕاکێشانیان لە یەکەم نیگاوە لەلایەن رەگەزی بەرامبەرەوە، ئەوا دەستەواژەی (سەرنجڕاکێشان) سەدان ساڵ پێش ئێستا بەکارهێنراوە!! بەم دواییانە توێژەران بوونی گونجانی بوارە کارۆموگناتیسییەکانیان سەلماندووە لەنێوان دڵی ئەوانەی هۆگری یەکتربوون، چ لەنێوان خۆشەویستاندا یان لە نێوان دایك و منداڵەکانیدا !

د. گاری شوارتز Gary Schwartz (مامۆستای پزیشکیی دەروونی لە زانکۆی ئەریزۆنا) بەدواداچوونی بۆ ٣٠٠ نەخۆش کردووە کە نەشتەرگەری چاندنی دڵیان بۆکراوە، دوای نەشتەرگەری بۆی دەرکەوتووە کە گۆڕانکاری ریشەیی

دەروونی و عەقڵی بەسەر هەموو ئەو نەخۆشانەدا هاتووە، بەتایبەت ئەوانەی دڵی دەستکردیان بۆ دانراوە! بەڵام زۆرێك لە پزیشکانی دڵ و نەخۆشییە دەروونییەکان ئەوەیان رەتکردۆتەوە کە ئەو گۆڕانکارییانە بۆ ئەوە بگەڕێنەوە کە دڵ ئەرکی عەقڵیی و هەستیی هەبێت و، لێکدانەوەی ئەوەی بۆ دەکەن کە ئەو نەخۆشانە لەسەر لێواری مردن بوون و بەر لە ئەنجامدانی نەشتەرگەری و دوای نەشتەرگەری ئازاری زۆریان دیوە، ئەمەش بۆتە هۆی روودانی گۆڕانکاری گەورە لە بارودۆخی دەروونی و عەقڵییاندا.

### ٣- پەیوەندی لەگەڵ رووەکدا:

توێژینەوە زۆر و زەوەندەکانی زانای رووەکناسی هیندی د.بۆس Jagadis Bose دەریانخستووە کە رووەکیش کۆئەندامی دەماری هەیە، کە زۆر لە کۆئەندامی دەماری مرۆڤ و ئاژەڵ دەچێت[1]! لەرێی ئەو کۆئەندامەوە، زانایان توانیویانە لێکدانەوە بۆ زۆر دیاردە بکەن کە ئەستەمە بە میکانیزمە کیمیاییەکان لێکدانەوەیان بۆ بکرێت، وەك خاوبوونەوەی گەڵای رووەکی (خانمە شەرمنەکە) کاتێك دەستی لێدەدەین.

سەلمێنراوە کە کۆئەندامی دەمار بواری کارۆموگناتیسی هەیە کە لەگەڵ بوارە کارۆموگناتیسییەکانی دەوروبەری کارلێك دەکات، نموونەی ئەوەش سیس بوونی هەندێك رووەکی ماڵەکانمانە لەکاتی سەفەر کردنی ئەوانەی راهاتوون بە گرنگی پێدانیان!

### ٤- پەیوەندی لەگەڵ بێ گیانەکان:

یەکێك لە توێژینەوە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەو بوارە، ئەو توێژینەوەیەکە زانای یابانی ماسارۆ ئیمۆتۆ Masaro Emoto لەسەر دڵۆپەکانی ئاو ئەنجامی داوە لەکاتی بەستنیاندا[2].

---

(١) توێژینەوەکانی لە کتێبی The Nervous Mechanisms of plants دا بڵاوکردۆتەوە.

(٢) کۆئەندامی دەماری رووەك لە خانە و ناوەندی دەمار پێکدێت، هەروەها بەستەر Synapass و ریشاڵی هاتوو و رۆیشتوو Afferent، Efferent nerve Fibers و کەوانی دەماریی کاردانەوەی Reflax arc بوونیان

ئیمۆتۆ تێبینی بوونی ڕێکخراوی بلووره ئاوییەکانی کرد چ لە شێوەی ڕێکخراوییەکی سەرسورهێنەر یان بێ سەروبەری ناڕێك کاتێك کە لەبەردەمی ئاودا هەستەکانمان دەربڕین چ بە هەست و سۆزی خۆشەویستی=یەکگرتن یان (رق = یەکنەگرتن) کە لە دڵی ئەو کەسانەدا هەیە کە بەو تاقیکردنەوەیە هەڵدەستن !!

گومان لەوەدا نییە کە دەرەنجامەکانی ئەو توێژینەوانە لە سەرووی چاوەڕوانی زۆربەی زانایان بوو، بۆیە هێرشیان کردە سەر ئیمۆتۆ و بە نابابەتی تۆمەتباریان کرد.

سەیرکردنی دڵ وەك موگناتیسێکی بەهێز و بەرهەمهێنەرێکی کارەبایی چالاك وەك حەقیقەتێکی زانستی لێهاتووە، وا دیارە پەیوەندی کردن لە ڕێی بوارە کارۆموگناتیسییەکان بە تەنیا لەلای مرۆڤ و گیانلەبەرانی دیکەی ئاژەڵی و ڕووەکی نەوەستاوە، بەڵکو دەکرێ درێژ ببێتەوە و بێ گیانەکانیش بگرێتەوە!

## دووەم: مێشکە بچووکەکە :

لەوانەیە کەسێك بڵێت: ئەو زانا کارۆمووگناتیسییانە بەجۆرێك باسی دڵ دەکەن وەك ئەوەی کە مێشك بێت. ئاخۆ هەر بەڕاستی دڵ ئەو توانایەی هەستکردن و وەرگرتن و ناردنەی هەیە؟!

لەساڵی ١٩٩٤ دکتۆر ئاندرۆ ئارمۆر[١] Andrew Armour جیهانی سەرسام کرد بە خستنەڕووی چەمکێکی زۆر گرنگ.

ئارمۆر لە توێژینەوەکانیدا گەیشتۆتە ئەو دەرەنجامەی کە دڵ کۆئەندامی دەماریی تایبەت بەخۆی هەیە Interinsic Nervous System کە شایەنی ئەوەیە

---

هەیە. ڕێك وەك کۆئەندامی دەماری مرۆڤ و ئاژەڵ.

(١) ئاندرۆ ئارمۆر، مامۆستای نەخۆشییەکانی دڵە لە زانکۆی مۆنتریال لە کەنەدا و سەرپەرشتیاری گۆڤاری Neuro Cardiology ە و ئارمۆر دەرەنجامی توێژینەوەکانی لە کتێبەکەی (مێشکی دڵ The Heart Brain) دا بڵاوکردۆتەوە.

پێی بگووترێت مێشکە بچووکەکە The Little Brain بە بەراورد لەگەڵ مێشکە گەورەکەمان کە لە دەماغمان دایە[١]!!

کۆئەندامی دەماریی دڵ لە نزیکەی ٤٠،٠٠٠دەمارە خانە پێکدێت، سەرەڕای جۆرە جیاوازەکانی خانە پشتگیرەکان کە هاوشێوەی خانەکانی ناو مێشکن Glial Sells و، هەمان گوێزەرەوە کیمیایی و پرۆتینییەکان بەکاردەهێنێت کە مێشك بەکاری دەهێنێت. لە ئەنجامی ئەو لەیەکچوونەش، هەندێك وەك دوورگەیەکی بچووك سەیری ئەو دەزگایە دەکەن کە لە مێشکی دایك جیابۆتەوەو لەدڵدا جێگیربووە[٢]!

ئەو مێشکە بچووکە دەتوانێت کاری دڵ بەبێ کۆئەندامی دەمار رێکبخات، هەر ئەوەشە کە تووشی ئەو نەخۆشانە دەبێت کە نەشتەرگەری چاندنی دڵیان بۆکراوە، کە لەو نەشتەرگەرییەدا ئەو دەمارانە دەبڕدرێن کە مێشك بە دڵ دەبەستنەوە.

کارەکە لێرەدا تەواو نابێت، بەڵکو ئەو مێشکە بچووکە رۆڵی هەیە لە ئاراستەکردنی مێشکە گەورەکەدا! لێکۆڵەران سەلماندوویانە کە چالاك کردنی دەماری جارسێمپتاوی لە دڵدا دەبێتە هۆی هێورکردنەوەی چالاکی کارەبایی مێشك بەرێژەی ٪٥٠[٣]!!

---

(١) Armour. J. A. and J. Ardell. Eds.(1994) Neurocardiology. New York, NY, Oxford University press.

(٢) Armour, J. A. (1991). Anatomy and function of the intrathoracic neurons regulation the mammalian heart. In: I. H. Zucker and J. P. Gilmore, eds Reflex Control of the Circulation. Boca Raton, FL, CRC Press. 1 – 37.

(٣) Sandman, C. A. B. B. Wallker, et al (١٩٨٢). Influence of afferent cardiovascular feedback on behavior and the cortical evoked potential. In: J. Cacioppo, J. T. and R. E. Petty, eds. Perspectives in Cardiovascular Psychophysiology. New York, The Guilford Press. MeCraty, R. W. A. Tiller, et al. (١٩٩٦) Heat – heart entrainment: A preliminary survry. Proceedings of the Brain – Mind Applied Neurophysiology EEG Neurofeedback Meeting, key west. Florida.

## سێیەم: دڵ وەك لووی بێ بۆری (غدة صماء)

یەکێك لە راستییە زانستییە سەرسوڕهێنەرەکان کە بەم دواییانە ئاشکرا کراوە، کاری دڵە وەك لووێکی بێ بۆری، تا ئێستا سەلمێنراوە کە دڵ شەش جۆر هۆرمۆن دەردەدات:

هۆرمۆنی یەکەم بە پیتەکانی ANH[1] -NPPC[2] -BNP[3] کە هەر سێکیان رۆڵێکی گرنگیان هەیە لە رێکخستنی ئاو و خوێیەکانی سۆدیۆم و پۆتاسیۆم لە خوێندا، لەبەر ئەوە روودانی هەر کەموکورتییەك تێیدا مرۆڤ تووشی چەندین نەخۆشی دەکات، کە گرنگترینیان بەرزبوونەوەی فشاری خوێنە .

هەروەها ئەو هۆرمۆنانە بەکاری گرنگ هەڵدەستن لە رێکخستنی کاری مێشکدا، وەك چالاك کردنی کاری ناوچەی ژێر میهاد Hypothalamus و غوددەی نوخامی Pituity gland کە بەرپرسن لە زۆر فەرمانی زیندووی لاشەی مرۆڤ، وەك رێکخستنی پلەی گەرمی لەش و رێکخستنی فشاری خوێن و هەڵسووڕاندنی کاری هەموو لووە بێبۆرییەکانی ناو لەش.

هەروەها ئەو هۆرمۆنانە درووستکردنی پرۆتین[4] چالاك دەکەن کە بەرپرسن لە پاراستنی دەمارەخانەکان لەکاتی دڵەڕوکێدا بەتایبەتی لە ناوچەی (فرس البحر Hippocampus) کە ناوەندی یادەوەریی هۆشیارە.

هۆرمۆنی چوارەمیش کە دڵ دەریدەدات هۆرمۆنی (ئۆکسیتۆسین Oxytocin)ە، کە پێشتر وادەزانرا لەلایەن غوددەی نوخامییەوە دەردەدرێت، پاشان سەلمێنرا کە ئەو رێژەیەی لە خانەکانی دڵدا دەردەدرێت دەگاتە هەمان رێژە کە لە مێشکدا دەردەدرێت !

---

(١) ANH: Atrial Natriuretic Hormone.

(٢) BNP: Brain Natriuretic Hormone. پێشتر وا دەزانرا کە لە مێشکەوە دەردەدرێت.

(٣) NPPC: Natriuretic Peptide Precursor.

(٤) Beta amyloid Precursor Protein.

ئەو هۆرمۆنە (کە بە چالاك کردنی کاری منداڵ بوون و دەردانی شیر بەناوبانگە) ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە چالاکییەکانی زانیاری و سێکسی و ڕەفتاریان و هەستکردن بە دایکایەتی، هەروەك چۆن پاڵپشتی تونای مرۆڤ دەکات لەسەر بەرگەگرتنی دڵەڕاوکێ و خۆگونجاندن لەگەڵیدا.

لەبەرئەوە ئۆکسیتۆسین بە هۆرمۆنی پەیوەندیی و یەکگرتن و گونجان ناسراوە.

لە کۆتاییشدا د.ئارمۆر[1] سەلماندوویەتی کە هەردوو هۆرمۆنی نۆرئادرێنالین Noradrenalin کە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە ئامادەکردنی لاشە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دڵەڕاوکێدا، بەهەمان شێوە دۆپامین Dopamin کە دەمارێکی گوێزەرەوەیە و لەناو مێشك و دەرەوەی مێشکدا بە ڕۆڵێکی گرنگ هەڵدەستێت.

ئای خودایە!...ئەمە زمانێکی ترە کە بەهۆیەوە دڵ لەگەڵ دەزگا جۆراوجۆرەکانی لاشەدا پەیوەندی دەکات و ئاراستەیان دەکات و، لەسەرووی هەمووشیانەوە سەرۆك (مێشك)!

## پەیوەندی نێوان مێشك و دڵ
## Heart – Brain Entertainment

لە سێ خاڵی پێشوودا باسی نوێترین زانیاریمان کرد دەربارەی فسیۆلۆجیای دڵ. لەوانەیە هەندێك لەو زانیارییە زانستییانە پێشتر زانراو بووبن، بەڵام تەواوکردنی لێکۆڵینەوەکان لەو بوارەدا و گەیشتن بەوەی کە دڵ ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لەسەر هەست و سۆز لەم دواییانەدا یەکلابۆتەوە.

ئەگەر مێشك ئەندامی هەست و سۆز بێت و بەرپرس بێت لەبەرامبەر ئەو بیرۆکانەی کە لە ناخماندان، ئەوا تۆبڵێی پەیوەندی نێوان ئەم دوو ئەندامە زیندووە (مێشك و دڵ) چی بێت؟

---

(١) د.ئارمۆر بوونی چەند خانەیەکی سەلماندووە بەناوی ICA Intrinsic Cardiac Adrenerig Cells لە دیواری ماسوولکەی دڵدا، کە بەرپرسن لە دەردانی ئەم دوو هۆرمۆنە .

**سەلمێنراوە کە پەیوەندییەکە لە ڕێی چوار میکانیزمەوە دەکرێت:**

**یەکەم: میکانیزمی شڵەژاو Nervous Mechanism**

پێشتر باسمان کرد کە مێشك کاری ڕێکخستنی دڵ دەکات، ئەویش لەڕێی دەماری لا ئیرادی خۆنەویستانەوە ANS کە دەمارەکانی ئەم دەزگایە زانیارییەکان لە مێشکەوە بۆ دڵ دەگوازنەوە.

هەروەها ئەوەی بەم دواییانە سەلمێنراوە، ئەوەیە کە ئاماژەی زۆر هەن کە ئاراستەی پێچەوانە (لە دڵەوە بۆ مێشك) دەڕۆن، ئەویش لەڕێگای هەمان دەزگای دەماری خۆنەویستانە، ئەو ئاماژانەش لە ناوچەی قەدی مێشك Brain Stem کۆتاییان پێنایەت کە بریتییە لە ناوەندی بەڕێوەبردنی ئەو دەزگایە، بەڵکو بەرەو ناوەندە بەرزەکانی مێشك بەرز دەبنەوە و کار لە کارکردنی مێشك دەکەن و دەگەنە:

- **لەوزەی مێشك Amygdala**: کە ناوەندی بەرپرسە لەهەموو فەرمانە کاردانەوەییەکانمان و ئاراستەکردنی رەفتارەکانمان، ئەویش بەپشت بەستن بەهەست و سۆزمان.

- **میهاد Thalamus** : کە وێستگەی یەکەمی ئاماژە هاتووەکانە لە هەستەوەرە جیاوازەکانەوە (چاو، گوێ...) میهادیش ئاماژە دەداتە ناوەندەکانی توێکڵی مێشك کە بەرپرسە لە لێکدانەوەی تەواوەتی ئەو هەستانە.

- **چاڵی بەشی پێشەوەی مێشك Base of Frontal Lobe**: کە ناوەندی بەرپرسی درووستکردنی هەماهەنگی نێوان هەست و سۆزەکان و فەرمانە عەقڵییەکانی تێدایە.

لە چالاکییە گرنگەکان و بەڵگە بەهێزەکان لەسەر رۆڵی دڵ لە ئاراستەکردنی چالاکییەکانی مێشك، ئەوەیە کە بەناوی چالاك کردنی دەماری ئاڵۆز Vagus Nerve Stimulation VNS[1] ناسراوە.

---

(١) دەماری ئاڵۆز ئاماژەی هێور کەرەوە لە مێشکەوە بۆ دڵ دەبات، هەروەك چۆن ئاماژەی پێچەوانەی ئەو ئاراستەیەش دەبات.

ئەم تەکنیکە پیشت بەوە دەبەستێت کە دەزوویەك لە دەوری دەماری ئاڵۆز لە ملدا دەپێچێت و دەیبەستێتەوە بە

ڕێکخراوی ئەمریکی بۆ حەپ و دەرمان FDA ئەم تەکنیکەی بۆ چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی فێ (صرع)ی توند بەکارهێنا لە ساڵی ١٩٩٧، هەروەها بۆ چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی بێتاقەتیی یاخیی لە ساڵی ٢٠٠٥ و، تائێستاش بەرێوەبەرایەتییەکە خەریکی لێکۆڵینەوەن لەو تەکنیکە بۆ بەکارهێنانی بۆ حاڵەتەکانی تری وەك دڵەڕاوکێ و زەهایمەر و سەرئێشەی نیوەیی (شەقیقە).

**دووەم: میکانیزمی کارۆموگناتیسی Electro-Mabnrtic Mechanism**

بە فراوانی باسی ڕۆڵی دڵمان کرد وەك موگناتیسێکی گەورە و بەرهەمهێنەرێکی وزەی کارەبایی و پەیوەندی بە کاری مێشکەوە.

**سێیەم: میکانیزمی میکانیکی Mechanical Mechanism**

بەشی ڕاستی دڵ ئەو ژوورە لەخۆدەگرێت کە بەرپرسە لە وەرگرتنی خوێنی گەڕاوە لەلاشەوە بۆدڵ، هەروەها بەشی یەکەمی کە بەرپرسە لە دابەشکردنی خوێن لە دڵەوە بۆ لاشە چەند وەرگرێکی میکانیکی لەخۆدەگرێت Brorecoptors کە بەشدارن لە دیاریکردنی ڕێژەی ترپەکانی دڵ و ڕێژەی ئەو خوێنەی پاڵی پێوەدەنێت، لەکۆتاییشدا کاردەکاتە سەر چالاکیی کارەبایی دڵ.

ئەو گۆڕانکارییانە کاردەکەنە سەر چالاکی کارەبایی مێشك (شەپۆلەکانی ئەلفا) و لە پاشانیشدا کاریگەری دەبێت لەسەر کاری ناوەندە جۆراوجۆرەکانی.

**چوارەم: میکانیزمی کیمیایی Chemical Mechanism**

باسی ئەوەمان کرد کە دڵ شەش هۆڕمۆن ( بەلایەنی کەمەوە) دەردەدات و باسی ڕۆڵی ئەو هۆڕمۆنانەشمان کرد لە ئاڕاستەکردنی زۆرێك لە چالاکیەکانی لاشە و مێشك

---

پاتریەك وەك تەزووی کارەبا. چالاك کردنی دەماری ئاڵۆز بەم تەزووە کارەباییە هاوشێوەی ناردنی ئاماژەی کارەباییە لە دڵەوە بۆ مێشك(لە دۆخی ئاساییدا ) لەڕێی هەمان دەمار بۆ ڕێکخستنی کاری مێشك.ا لە هەردوو دۆخیشدا ئاماژە لە دڵەوە یان لە پاتریەوە) لێدانە کارەباییەکان دەبنە هۆی دەردانی هەندێك گوێزەرەوە دەمار لە مێشکدا وەك نورئەدرینالین و گابا Gaba، کە کاردەکاتە سەر چالاکی کارەبایی توێکڵی مێشك.

دڵ بەم شێوەیە لەگەڵ مێشکدا پەیوەندی دەکات و، ئەو پەیوەندییەش دەبێتە هۆی ئەوەی بگەین بەوەی کە[١]:

دڵ ڕۆڵی لە هەستکردندا هەیە!
دڵ ڕۆڵی لە بیرکردنەوەدا هەیە!

لە کتێبی ((دڵە زیرەکەکە The Intelligent heart)) دوو نووسەرەکەی[٢] ڕۆڵی دڵ لە ژیانی فیکری و هەستکردنماندا بە شێوەیەکی جوان و لانەدان لە وردی زانستی بۆ دەخەنەڕوو و دەڵێن:

لەگەڵ هەر ترپەیەکی دڵدا، دڵ تەنیا پاڵ بە خوێنەوە نانێت، بەڵکو نامەی (دەماریی - هۆڕمۆنی - میکانیکی - کارۆموگناتیسی) بۆ مێشك دەنێرێت، کە زۆر زانیارییان هەڵگرتووە. بۆیە ئەگەر ترپەکانی دڵ زۆر ڕێك و پێك بن (لە ڕووی ڕێژەی ژمارە و گونجانیان) ئەوا ئەو زانیارییە دەگاتە مێشك و فەرمانەکانی توێکڵی مێشك (لە ڕووی هەست و زانیاری و هزری و دەروونی) باشتر دەکات و، ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوونی عەقڵی و دەروونی، لەگەڵ توانایەکی زیاتر لە هەڵسەنگاندنی شتەکان و دەرکردنی بڕیار و بەمەش توانا داهێنانەکانی مرۆڤ هەڵدەقوڵێت. هەموو ئەمانەش دەبنە هۆی گونجان و ڕێك و پێکی عەقڵی و دەروونی.

دەکرێ وەك موگناتیسی جووڵاو سەیری ئێمە بکرێت، کە هێزی کێش کردن و دوورخستنەوەی هەیە لەگەڵ ئەوانەی هاوشێوەین یان دژین.

لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە کە خۆشەویستی و سۆز و چاودێری کردن لەلایەن خزم و کەس و پزیشکەکانەوە بۆ تووشبووانی نەخۆشی شێرپەنجە ڕێ لە تەشەنەکردنی

---

(١) سێ کوچکەی فەلسەفەی یۆنانی کۆن(سوقرات- ئەفلاتون- ئەرستۆ) باوەڕیان وابوو کە عەقڵ (کاری مێشکە) و هەستکردن (کاری دڵە) و دوو لایەنی ڕۆ؛ی مرۆڤ دەردەخەن و، بەشێك نین لە فەرمانەکانی لاشەی ماددی و لە کێبڕکێی بەردەوام دان بۆ ئاراستەکردنی مرۆڤ. لەبەرئەوە ئەفلاتون هەست و سۆزی بەو ئەسپە چواندووە کە عەقڵ ئاڕاستەی دەکات.

(٢) David Mc Arthur و Bruce Mc Arthur لەو نووسەرانەن کە گرنگی بە زیرەکی ڕۆحی و پەیوەندی نێوان هەست و بیرکردنەوە دەدەن.

نەخۆشیەکە دەگرێت، ئەوەش هۆی باشتربوونی بەرچاوی کاری بەرگری لەشی نەخۆشەکەیە.

**خـوێنەری بەڕێز..**

لەم باسەدا و لە باسی پێشتریشدا زۆر زانیاریمان دەستکەوت، کە بوونی پەیوەندییەکی بە هێز لە نێوان چەمکە ڕوحی و ئاینییەکان و هەست و بیرکردنەوە و، نێوان لایەنی بایۆلۆجی لاشە دەسەلمێنن.

خستنەڕووی بە ئەمانەتی ئەم پرسە ناچاری کردین ئەوەی پێیگەیشتوون بیخەینەڕوو، بەبێ بازدان بێ دانانی وێناکردنێکی تەواو بۆ ئەو پەیوەندییە.

**ئەوانەی گرنگییان بەم چەمکانە داوە چەند هەڵوێستێکیان هەبووە:**

بێباوەڕان هەڵوێستی ڕەتکردنەوەیان هەڵبژاردووە، ئەمەش شتێکی سرووشتییە. دینداره‌کانیش یەکێك لەم سێ هەڵوێستەیان هەڵبژاردووە.

- هەیانە بەڕاکردن دەستی کردووە بە دەرکردنی دەرەنجامی یەکلاکەرەوە، بەو پێییەی ئەوەی پێیگەیشتوون ڕاستی زانستی تەواون و، هەندێکیان بە بەڵگەی ئیعجازی زانستی یەکلاکەرەوەی قورئانی پیرۆزی دەزانن.

- هەیانە خۆی پاراستووە، بەو پێیەی هەست و سۆزە ڕووحی و ئاینییەکان کاری ڕوحن و لاشە هیچ کاریگەرییەکی نییە. و ئەم کۆمەڵەیە لەوە دەترسن کە خستنەڕووی زانستی بمانگێڕێتەوە بۆ فیکری ماددیگەرایی و پاشان بۆ بێباوەڕی. لە باسی دواتردا بە درێژی باس لەو هەڵوێستە دەکەین .

- هەندێ لە دیندارەکان وایدەبینن کە خوای پەروەردگار ئەو میکانیزمە بایۆلۆجیانەی کردۆتە ئەڵقەی پەیوەندی لە نێوان ڕوح و لاشەدا، هەروەك چۆن مێشکی کردۆتە ئامرازی عەقڵ لە مرۆڤدا. بێگومان ئەم هەڵوێستەیان ڕاسترینە.

وەك دواوتە، کە ئەم دوو تەوەرەی ئایین و بایۆلۆجی پێ بە کۆتابێنین، دەڵێین: ئەگەر دیدی زانستی کلاسیکی ئەوە دڵنیا دەکاتەوە کە تەنیا مێشك بە چالاکییە

عەقڵییەکان هەڵدەستێت و بەرپرسە لە بارودۆخی دەروونیی، ئەوا لێکۆڵینەوە نوێیە وردەکان و بیردۆزە بوێرەکان لە ئاییندەدا پەردە لە سەر ئەوە لادەدەن کە چۆن مرۆڤ وەك بوونەوەرێکیپێك بەستراو و تەواو پێکهاتوو لە دامەزراوەی بچووکتر (ڕوح - عەقڵ - دەروون - لاشە) دی ئێن ئەی و مێشك پێی هەڵدەستن، دڵیش لە بەڕێوەبردنیاندا ڕۆڵێکی گرنگ و مەزن دەبینێت.

گومانیش لەوەدانییە کە چەند دەیەك زیاتر تێناپەڕێت، زانست زۆر نزیك دەبێتەوە لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی هەریەکە لە ماددیگەراکان و دیندارەکان.

## باسی حەوتەم : ڕاستیی خوودی مرۆڤایەتی

**لە دوای بایۆلۆجیا چی؟**

لە دوو باسی ڕابردوودا زیاتر تیشکمان خستە سەر جینات و، ناوەندەکانی مێشك و بازنە دەمارییەکان و، دڵ و پەیوەندی بە مێشك و دەوروبەری، واتا لایەنی ماددی مرۆڤ.

جا ئایا حەقیقەت و ڕاستی مرۆڤ وەك بونەوەرێکی زیندوی عاقڵ لەو سنورە دەوەستێت؟

کاتێك بایۆلۆجییەکان بەرپەرچی لێکۆڵینەوە لە دیاردە جیاکەرەوەکانی مرۆڤیان دایەوە (ژیان و ئەوەی بە دوایدا دێت لە بیرکردنەوە و هەست و نەست و ڕەفتار و دینداریی) میکانیزمی زانستی ماددی هاوچەرخیان بەکارهێنا کە بناغەکەی بنچینەی ڕێبازی ئیختیزالی DNA بوو، کە زیندەوەر ورد دەکاتەوە بۆ ئەندامەکان، پاشان بۆ شانە، پاشان بۆ خانە،پاشان بۆ بەش، تا دەگاتە ئاستی گەردیلە و پێکهاتەکانی بچوکتر لە گەردیلە و شەپۆلەکانی وزە .

گومان لەوە دانییە کە ڕێبازی وردکردنەوە (اختزالی) بەمە ژیان (بایۆلۆجیا)ی بۆ مادده (فیزیا) وردکردۆتەوە. بەمەش دیاردەی ژیان کە لێی دەکۆڵێتەوە لەوانەیە هەر لەخانەدا ون بوبێت!! چونکە ژیان بریتی نییە لە بەش و گەردیلەو وزە.

لە سەرەتای ئەم باسەدا دوو نموونە دەهێنینەوە کە کەموکورتی ڕێبازی تورێکاری وردکردنەوە دەردەخەن: دی ئین ئەی و پەیوەندی بە مرۆڤەوە، پاشان پەیوەندی نێوان مێشك و عەقڵ.

## دی ئێـن ئەی :

کاتێك زانایان گەیشتنە گرنگترین و گەورەترین دۆزینەوەی بایۆلۆجی لە سەدەی بیستەم، کە بریتی بوو لە دۆزینەوەی DNA و میکانیزمی کارکردنی[1]، زۆر لە زانا بایۆلۆجیەکان وایانزانی کە زانست نهێنی ژیانی دۆزیوەتەوە.

بەڵام دوای پەنجا ساڵ لە لێکۆڵینەوەی بێ ئەندازە ئەو سەرسامیە نەما و، ئیتر بایۆلۆجیەکان ڕاستیەکەیان بۆ دەرکەوت، کە DNA تەنها پێکهاتەیەکی بایۆلۆجییە و بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دروستکراوە، بە جۆرێك کە زانیاری کیمیایی تێدایە کە خانە بۆ دروستکردنی پرۆتینەکانی پێویستی پێیان هەیە، هەروەها بۆ گواستنەوەی خاسێتە بۆماوەییەکانیش[2]، بەڵام ئەمە نهێنی ژیان نییە.

DNA وەك ئەو وشە چاپکراوانەی سەر ئەم لاپەڕەیەی بەردەستت وایە، کە زانیاریەکان لە لاپەڕەکە یان لە مەرەکەبی وشەکان یان لە هەر وشەیەکدا دانین، بەڵکو لەو واتایانەدان کە ئەو وشانەی سەر لاپەڕەکە گوزارشتی لێدەکەن. هەمان

---

(١) جێمس واتسن و فرانسیس کریك و مۆریس ولکینز لە سەرەتای پەنجاکاندا گەیشتنە ئەو دۆزینەوەیە، لەسەر ئەوەش خەڵاتی نۆبڵیان لە پزیشکیدا وەرگرت لە ساڵی ١٩٦٢.

(٢) بەشی دی ئێن ئەی لە زۆر ئەڵقە پێکدێت کە بەشێوەی دوو زنجیرە لەیەك ئاڵاون لە شێوەی گوریس لە موو دروستکراو، ئەم گوریسەش بە شێوەیەکی زۆر ئاڵۆز و توند بەدەوری خۆدا دەخولێتەوە لەناو ناوکی خانەدا. ئەگەر بیکەینەوە درێژییەکەی دەگاتە ٢،٠٤ لە هەر خانەیەکدا. ئەگەر گوریسەکانی هەموو خانەکانی لاشەی یەك مرۆڤ پێکەوە ببەستینەوە، ئەوا درێژییەکی سەرسوڕهێنەری هەیە، بە ئەندازەی پێنج هەزار جاری ئەندازەی نێوان زەوی و خۆر!!
زنجیرەی دی ئێن ئەی دابەش دەبێت بۆ چەند یەکەیەك، کە کرۆمۆسۆمەکانن، کە لە یەکەی بچووکتر پێکدێن کە جینەکانن. هەر جینێکیش بەردەوام هەڵدەستێت بە پێدانی تێکەڵەی کیمیایی پێویست بۆ دروستکردنی هەندێك پرۆتین. درێژایی زۆر هەن لە دی ئێن ئەی کە جینیان تێدا نییە(نزیکەی ٪٩٥ لە درێژی زنجیرەکە) کە پێشتر ناوی کەوتنی دی ئێن ئەی Gung DNA یان لێنابوو، واتا (ئەو دی ئێن ئەی) ڕۆڵی نییە!، پاشان سەلمێنرا کە ئەو دی ئێن ئەیەی بەبێ ڕۆڵ هەژمار دەکرا ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە لە کۆنترۆڵ کردندا لە چالاك کردنی هەر جینێك بەپێی بەرنامەیەکی کاتی و شوێنی کە عەقڵ بێتوانایە لە وێناکردنی، تا لەم دواییانە وەك(مایسترۆی جینەکان) تەماشایان دەکرد، هەروەك چۆن، فەرمانی تریشی هەیە کە هێشتا زانایان بە هەموو نهێنییەکان نەگەیشتوون.

ئەو زانیاریانە دەکرێ لەسەر کاسێتیك یان ڕیکۆردەرێك، یان سیدیەك تۆمار بکرێت، هەمو ئەوانە گرنگ نین، گرنگ ئەو زانیاریانەن کە ئەو هێمایانەیان بۆ کۆد دەکرێن.

## کێشەی پەیدابون morphogenesis

تێگەیشتنی باوی لای ماددیگراییە وردکەرەوەکان Reductionists وایدەبینێت کە DNA (کە جیناتی خانەی لێپێکدێت) بە هەمو ڕۆڵێك هەڵدەستێت لە بنیاتنانی زیندەوەرێك بە خاسییەتە لاشەیی و دەروونی و ڕەفتارییەکانی. ئەوە بە ڕونی دەرکەوتووە کە ئەم دیدە وردکەرەوەیە زۆر پڕە لە کەموکوڕی، چونکە لە دوایین لێکۆڵینەوە بۆمان دەرکەوتوەوە کە DNA ئەگەرچی سیفاتەکانیش دیاری بکات، بەڵام بەتەواوی بێ توانایە لە بەدیهێنانی زیندەوەرێك لەسەر شێوەی خۆی morphogenesis (واتە گۆرینی لە زانیارییەوە بۆ بوونێکی ڕاستەقینە).

دەتوانین چەمکی پەیدابون بە نمونەیەك ڕوون بکەینەوە کە وێنەکەمان بۆ نزیك بکاتەوە: ئەو وشانەی لەسەر لاپەڕەکان دەیاننوسین و، تێیدا وەسفی شێوەی مرۆڤێك دەکەین، جا ئەو وەسفە هەرچەند ورد و دورو درێژ بێت، ئایە دەکرێ ئەو وەسفە بگۆڕی بۆ مرۆڤێکی ڕاستەقینە( لە گۆشت و خوێن)! ئێستا بۆتە پێویستی کە دان بەوە دابنێیت کە( سیستەمێکی تر هەیە) کە بەرپرسە لەو پێکهاتنە. بەڵام چۆن؟ تائیستا نازانین.

## مێشك و عەقڵ[1] :

بە هەمان شێوە، ئەگەر مێشکی ماددی ورد بکەینەوە بۆ پێکهاتەکانی لە بەش و گەردیلە و بچووکتر لە گەردیلە، ئایا ئەو کارە دەمانگەیەنێتە تێگەیشتن

---

(١) زاراوەی عەقڵ بە ژمارەیەك فرمانی بەرز دەگوترێت کە توێکڵی مێشك بۆ دوو نیوە گۆیەکەی مێشکی مرۆڤ ئەنجامی دەدات، ئەو فرمانانەش بریتین لە: هەست- فێربوون- یادەوەری- زمان- لۆژیك- توانای حوکمدان بەسەر شتەکاندا.

لە حەقیقەتی عەقڵ؟ ئایا چالاکی عەقڵی دەگەڕێتەوە بۆ کیمیا و کارەبای مێشك؟ کە لە کۆتاییدا ئایۆناتی سۆدیۆم و پۆتاسیۆمە و لە جوڵەیەکی بەردەوام دان لە ڕێی دیواری دەمارە خانەدا؟ چۆن جوڵەی ئەو ئایۆناتە وامان لێدەکات کە لە چەمکە ڕوتەکان Concepts تێبگەین وەك ئەوەی کە دەڵێین ((لە ڕاستیدا مرۆڤ ئەو بونەوەرە بەڕێزەیە کە بە دوای واتای ژیاندا دەگەڕێت، جوانیی خۆش دەوێت، بە شتە شاراوەکان سەرسامە، ئامانجی حەقیقەت و چاکە و دادگەرییە))؟!

لە ڕاستیدا مێشك دەزگایەکی ماددیە کە لە تۆڕی زۆر ئاڵۆزی خانە دەمارییەکان پێکدێت[1]، کە هەمویان بە یەك زمان دەدوێن و ئەویش ترپەی کارۆکیمیاییە، - تا ئێستا - شتێکی مەحاڵە کە هەرچەندە بە ناو مێشکدا بگەڕێی شتێکمان دەستبکەوێت کە ئاماژە بۆ ملیۆن هەست و نەست و چەمکە ڕوتەکان و بیرۆکەو هەستە عەقڵیەکان بکات.

جیاوازی نێوان مێشك و عەقڵ وەك جیاوازی نێوان دەربڕینی وشەو واتەکەی وایە، کە دەربڕین میکانیزمێکی جیهانی ماددییەو بریتیە لە دەنگێکی بەردەوام کە قورگ لە شێوەی لەرینەوە لە هەوادا بڵاوی دەکاتەوە، پاشان قورگ و زمان و هەردوو لێو هەڵدەستن بە بڕینی دەنگە بەردەوامەکە، تا بیکەنە پیت و وشە، لە ڕاستیدا بابەتەکە هەمووی فیزیاییە، ئەمەیە کرداری دەربڕینی وشەکان، بەڵام (واتا) شتێکی ترە، چونکە دەکرێ گوزارشت بێت لە خۆشەویستی یان ڕاگەیاندنی جەنگ بێت یان دەستەواژەیەکی تر، واتای وشەکان شتێکی جیاوازە و لە دەرەوەی بازنەی ئەو میکانیزمە ماددییانە و پێکهاتەی ماددی گەردوونە!

---

(١) لێرەدا پێویستە باسی ئەوە بکەین کە دەمارە خانەکان Neurons کە بۆ زانینی فرمانەکانی مێشك تیشکیان خراوەتە سەر نزیکەی ٪١٠ی خانەکانی مێشك نیشان دەدەن، لەکاتێکدا کە خانەکانی تری پاڵپشت Glial Cells نزیکەی ٪٩٠ی خانەکانی نیشان دەدەن، لەم دواییانە سەلمێنراوە کە ئەم خانانە ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە فرمانەکانی مێشکدا کە زۆر لەوە زیاترە کە تائێستا دۆزراوەتەوە. بەهەمان شێوە باسمان کرد کە فرمانەکانی دی ئێن ئەی کە بە کەوتوو و بێ فەرمان ناودەبران نزیکەی ٪٩٥ی بنچینەی دی ئێن ئەی پێکدێنن، ئەمەش واتای ئەوەیە کە زانایان بەتیشك خستنە سەر جینەکانی ناو دەمارە خانەکان لەکاتی لێکۆڵینەوە لە کاری مێشك ئەوا تەنیا تیشکیان خستۆتە سەر نیوەی ماددەی مێشك!!
(٪١٠ × ٪٥) بەو واتایەی کە نزیکەی ٪٩٩.٥ لە ماددەی بۆماوەیی مێشك هێشتا بە باشی لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە.

## وەڵامی میتافیزیکییەکان :

هەندێك لە گەورە زانایان دەستیان کرد بە باسکردنی بێتوانایی تەواو لە تێگەیشتن لە میکانیزمی پێکهاتن Morphogenesis بە پشت بەستن تەنیا بە DNA و، هەروەها باسی ئەوەش دەکەن کە چالاکی کارۆکیمیایی خانەکانی مێشك بە تەنیا بێ توانایە لە لێکدانەوەی عەقڵ و ڕەفتار .

ئەو زانایانە وایدەبینن کە پێویستە دید و بۆچونەکانمان فراوانتر بکەین، تا جۆرێك لە بوارەکانی لە سەرووی مادده Supernatural Fields لە خۆ بگرێت، کە بەرپرس بێت لە پێکهاتن و، بە هەمان شێوە بەرپرس بێت لە عەقڵ و ڕەفتاری هەر زیندەوەرێك. لەبەر ئەوە فرانکلین هارۆڵد جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە فیکری ماددی سروشتیی Naturalism شکستی هێناوە لە لێکدانەوە و تێگەیشتنی سێ دیاردە گشتیەکە: گەردوون - ژیان - عەقڵ.

فەیلەسووف دێڤید چاڵمەرز[1] David chalmers لێکۆڵینەوەیەکی بەپێزی هەیە بە ناو ونیشانی: عەقڵ و پێگەی لە سرووشتدا (( consciousness and its place in nature )) کە تێیدا ئەو بیرۆکە هاوچەرخانەی خستۆتەڕوو کە بە دەوری حەقیقەتی عەقڵدا دەخوولێنەوە و، هەوڵدەدات ڕوونیبکاتەوە کە چۆن هەست و نەست و بیرۆکە ڕووتەکان دروست دەبن و سەرچاوەکانیان چین.

(چاڵمەرز) پێمان دەڵێت: دوو ئاراستەی سەرەکی بەرپەرچی ئەو پرسەیان داوەتەوە: ئاراستەی ماددی فیزیایی کە عەقڵ بە دیاردەیەکی ماددی بەرهەمی مێشك دەزانێت و، کارەبا و کیمیای مێشك، کە دەکرێ عەقڵ و ئەوەی گوزارشتی لێدەکات لە هۆشیاری و هەست و نەست و بیرۆکەی ڕوتمان لێك بداتەوە، کەواتە هیچ شتێك لە سەرووی مێشکەوە نییە.

---

(١) مامۆستای فەلسەفەی ناودار، بەڕێوەبەری ناوەندی توێژینەوەکانی عەقڵ لە ئوستراڵیا. ئەو توێژینەوەی باسمان کردووە بۆ یەکەم جار لە کتێبەکەی فەلسەفەی عەقڵ Phylosophy of mind دا لەساڵی ٢٠٠٢ بڵاو کردۆتەوە.

هەرچی ئاراستەی ماددی نا فیزیاییە، وایدەبینێت کە عەقڵ دیاردەیەکی فیزیایی نا ماددییە و، لەگەڵ دیاردە فیزیاییەکانیش لە پەیوەندی دایە. هەروەها ئەو ئاراستەیە وایدەبینێت کە عەقڵ و مێشک بە تەواویی لە یەك جیاوازن و، سەر بە دوو جیهانی جیاوازن، مێشك سەر بە جیهانی ماددمیە لە کاتێکدا عەقڵ سەر بە جیهانێکی نا ماددیە کە بە هیچ جۆرێك هەست بە حەقیقەتەکەی ناکەین.

**دیاردەی بینینی پێشوەخت = دیاردەی هەستکردن بە هۆگریی.**

یەکێك لە بەڵگە بەهێزەکان کە لایەنگرانی ئاراستەی نا ماددی پێشکەشی دەکەن بریتییە لە بەڵگەی بینینی پێش وەخت Deja vu phenomenon. کە دیاردەیەکی ناسراوە لە زانستی دەروونناسیدا و تەنانەت هەمووومان یان زۆربەمان تێیدا ژیاوین. بینینی پێشوەخت واتای ئەوەیە کە ئێمە لە ژیانماندا بە هەڵوێستێکدا تێپەر دەبین و لە بەرامبەریدا هەست بە هۆگریی دەکەین و، وادەزانین کە پێشتر هەمان هەڵوێست بە هەموو وردەکارییەکانییەوە ژیاوین، تەنانەت واهەستدەکەین کە عەقڵمان پێشتر لە یەکێك خەونەکانماندا ئەوەی نیشاندراوە کە چی لە وردەکارییەکانی ئەو هەڵویستەدا ڕوودەدات!!

ماددیگەراکان پرسەکەیان سادە کردۆتەوە تا لە تەنگ و چەڵەمەکە ڕزگاریان بێت و، بەوە لێکیان داوەتەوە کە ئەوە تەنیا وەهمێکە و لەو ساتەدا هەستی پێدەکەین. هەر وەك چۆن، تەفسیرێکی تریان بۆ دیاردەکە کردووە، ئەویش ئەوەیە کە یەکێك لە دوو نیوەکەی مێشك پێش نیوەکەی تر بە ماوەیەکی زۆر کەم چرکەیەك هەستی بە هەڵوێستەکە کردووە و کاتێك نیوەکەی تر هەستی پێدەکات مرۆڤ لە بەرامبەر هەڵوێستەکەدا هەست بە هۆگریی دەکات.

لە بەرامبەریشدا، زۆر هەڵوێست هەن کە گرنگیدەرانی لێکۆڵینەوە لەو دیاردەیە تۆماریان کردوون بە تەواوەتی هەموو ئەو تەفسیرە ماددیانە ڕەتدەکەنەوە. یەکێك لەو هەڵوێستانە کە هاوڕێیەکم بۆی گێڕامەوە کە لە خەوندا بینیبوی کە بەشی لای ڕاستی پشتەسەری کوڕەکەی تاشرابوو، دوای ئەوە بە دوو ڕۆژ من و هاوڕێکەم دەگەڕاینەوە بۆ ئەو نەخۆشخانەیەی لێی دەوام دەکەین، بینیمان

منداڵەکە لە ژووری پێشوازییەو، پزیشکەکان لە دەوری کۆبونەتەوە و برینەکەی سەریان بۆ دەدووریەوە، بە دیاریکراوی هەمان ئەو بەشەی پرچیان بۆ تاشیبوو کە لە خەوندا بینیبوی! بە هەمان شێوە هەندێ کەس و، لە نێویاندا نوسەری ئەو دێرانە، خەونە دورودرێژەکانیان دەنووسنەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر ڕوداوێکیان بەسەردا تێپەڕی و هەستیان بەوە کرد کە پێشتر بەسەریان هاتووە (بینینی پێشوەخت) بگەڕێنەوە سەر ئەو نووسینە کە زۆرجار لێکچونی تەواو هەیە لە نێوان ڕوداوەکەو خەونە نوسراوەکەدا.

ئەم دیاردەیە ئاراستە ماددییەکان بەتەواوی ڕەتدەکاتەوە، ئاخر چۆن مێشکی ماددی دەتوانێت هەست بە شتێك بکات کە هێشتا ڕووی نەداوە و بە تەواوی وردەکاریەکانیشییەوە!

## زانست و ڕوح...

شتێکی سروشتی بوو کە زانستی تاقیکاری ڕۆڵی تەماشاکەر نەبینێت لە هەمبەر پرسی (عەقڵ و حەقیقەتی خود).

یەکێك لەو زانا پایە بەرزانەی گرنگیان بەم پرسە داوە (د. گاری شوارتز)[1]ە.

بواری دکتۆر شوارتز گرنگیدانە بە دواوەی دەروون (پاراسایکۆلۆجی parapsychology)، لەبەر ئەوە ئامانجی ناوەندی لێکۆڵینەوەکانی وزەی مرۆڤایەتی لە بەشی پزیشکی دەروونی زانکۆی ئەریزۆنا کە سەرۆکایەتی دەکات، بریتیە لە سەلماندنی ئەوەی کە مێشکی مرۆڤایەتی وەك وەرگر Antenna - Receiver ـێك بۆ خوودی مرۆڤایەتی کار دەکات، نەك وەك دروستکەری

---

(١) گاری چوارتز Gary Schwartz لە زانکۆی هارڤارد دکتۆرای بەدەست هێناوە، لەئێستادا مامۆستای پزیشکیی دەروونییە لە زانکۆی ئەریزۆنا، دوای ئەوەی مامۆستای پزیشکیی دەروونیی و نەخۆشییە دەمارییەکان بوو لە ناوەندی پزیشکیی دەروونیی لە زانکۆی ییل لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. چەند نووسینێکی هەیە دەربارەی حەقیقەتی زات، لەوانە(بەڵگەی زانستیی لەسەر ژیانی دوای مردن Breakthruugh Scientific Evidence After Death) و (وزەی زیندوو لە گەردووندا The Living Energy in Universe).

خوود Creator، هەروەها تاقیکردنەوەی گریمانەیی Hypothesis کە جەوهەری مرۆڤ دوای مردنی لاشە دەمێنێتەوە.

لێکۆڵینەوەکانی دکتۆر شوارتز پشت بە شێوازێکی باوی پاراسایکۆلۆجی دەبەستن، ئەویش پەیوەندی هەندێك کەسە وەك ناوەندە هۆکارێك Mediums بۆ پەیوەندی کردن بەو کەسانەی مردوون. دکتۆر شوارتز جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەم ئامرازە (تا ئێستا) باشترینە بۆ لێکۆڵینەوە لەم پرسە، بە مەرجی پەیوەست بوون بە ڕێبازی زانستی لە ڕاستگۆیی ئەو کەسە ناوەندە هۆکارانە و، لە شیکردنەوەی ئەنجامەکان.

د. شوارتز لە بیردۆزەکەی دەربارەی خوودی مرۆڤایەتی لە چەمکە فیزیایی و لۆژیکییەکان دەست پێدەکات. چونکە هەمو کردارەکانی مرۆڤ وەك قسەو جووڵە لە بۆشاییدا لە شێوەی چەند شەپۆلێکی کارۆموگناتیسی دەردەچن و لەناوناچن، چونکە ئێمە هەر ماوین، رێك وەك ئەو ڕوناکییەی کە لە ئەستێرەیەکی دوورەوە بۆمان دێت، کە لەوانەیە ئەو ئەستێرەیە بەر لە ملیۆنان ساڵ بونی نەمابێت و لە ناوچوبێت! هەروەها د.شوارتز ئەوەش دڵنیا دەکاتەوە کە ئەگەر زانست ئامرازی زانینی ئەوە بێت کە خودا چۆن بیردەکاتەوە[1]، ئەوا ئامرازیشە بۆ ناسینی حەقیقەتی (خوودی مرۆڤایەتی) کە دیندارەکان ناوی (رۆح) ی لێدەنێن و دەڵێن -تا ئێستا- نەگەیشتووە بە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر لەسەر ژیانی مرۆڤ لە دوای مردن. بەڵام دڵنیایە لەوەی کە زانست (لە ماوەیەکی نزیکدا) ئەو بیرۆکەیە تێدەپەڕێنێت کە مرۆڤ بە مردنی لاشەی لەناودەچێت، هەروەك چۆن بیرۆکەی ڕاخرانی زەوی تێپەڕاند.

**خـــوود و مێشکی سەر بە خوود:**

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسەی دەربارەی حقیقەتی خوودی مرۆڤایەتی، کارڵ پۆپەر[2] Karl Popper بەناوبانگترین فەیلەسووفی زانستەکان و سێر جۆن ئێکلز

---

(١) ئەنیشتاین ئەو چەمکەی بەکارهێناوە مەبەستی لەو یاسا سرووشتییانەیە کە گەردوون و مرۆڤ بەرێوە دەبەن.

(٢) مامۆستای ئابووری لە زانکۆی لەندەن. یەکێکە لە بەناوبانگترین زانایانی فەلسەفەی زانستەکان لە

John Eccles[1] کتێبێکیان داناوە کە زیاتر لە ٥٠٠ لاپەڕەیە و ناوونیشانەکەی دەرخەری ڕەهەندەکانی پرسەکەن (خوود و مێشکی سەر بە خوود)[2] The Self and its Brain واتا هەر یەکێکمان خوودێکی ڕاستەقینەی هەیە کە مێشك وەك ئامراز و ئامێرێك بەکاردێنێت. ئەمەش هەمان ئەو واتایەیە کە د. شوارتز باسی کردووە لەوەی کە مێشك وەك وەرگری خوودی مرۆڤایەتی کاردەکات. دەکرێ لە ناوونیشانی ئەم کتێبەوە ئەو پرسەی لەم بەشە باسی دەکەین کورتی بکەینەوە، ئەو پرسەی کە زانا و فەیلەسوفەکانی سەرسام کردووە، ئەگەرچی لە لای دیندارەکان یەکلابۆتەوە، لە یەك پرسیاردا: ئایا ڕاستی مرۆڤ و حەقیقەتی بریتیە لە (خوود و مێشکی سەر بە خوود) یان (مێشك و خوودی هەڵقوڵاو لە مێشك)؟

**خـوێنەری بەڕێز...**

ئامانجم لە نوسینی ئەم باسە ئەوەبووە کە بە (زانستیانە) ئەو دڵنیاییەی ماددیگەراکان شلۆق بکەم کە وادەزانن مێشك سەرچاوەی خوودی مرۆڤایەتییە و، هەروەها تا بە دیندارەکانی نیشان بدەم کە پرسی ڕۆح پرسێکی زانستیەو دەکرێ بخرێتە ژێر بەڵگەی عەقڵی و لێکۆڵینەوەی زانستی[3].

لەبەر ئەوە لە باسی ڕابردوودا بە خستنەڕوویەکی کورت (بێزیاندان) لە باسکردنی فەلسەفی و زانستی بۆ خوودی مرۆڤایەتی، هەروەها چەند کتێبێك و توێژینەوەیەکم وەك نمونەی هەزاران لێکۆڵینەوە لەسەر بابەتەکە هەڵبژارد. پێم وایە ئەوەی

سەدەی بیستەمدا.

(١) زانای بایۆلۆجیای مێشك و دەمار، خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لە فەرمانی ئەندامەکانی لەش لەساڵی ١٩٦٣.

(٢) بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٧٧ چاپ کرا، لە ساڵی ٢٠٠٣ چاپی پێنجەمی دەرچوو.

(٣) هەندێك لە دیندارەکان واتێدەگەن کەخودا بەفەرموودەی : ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء: ٨٥ قەدەغەی کردووە لە ڕۆح بکۆڵرێتەوە، بەڵام لەڕاستیدا ئایەتەکە واتای قەدەغەکردن نابەخشێت، بەڵکو گەورەیی رووح نیشان دەدات، هەروەها واتای ئەوەیش کە دوای لێکۆڵینەوەکانیش کەمێك زانیاریمان دەستدەکەوێت، ئێمەش هەوڵی لێکۆڵینەوە لەو کەمە دەدەین، پێشینەکانمان بەباشی لەو واتایە تێگەیشتبوون، بۆیە پێشەوا ئیبنولقەییمی جەوزی کتێبە گەورە و بەناوبانگەکەی بۆ نووسین بەناوی (الروح).

خستومەتەڕوو بەس بێت بۆ لەخۆگرتنی هێڵە سەرەکیەکانی پرسەکە. بەڵام وادیارە پرسەکە خۆی دەیەوێت خۆی بۆ تۆ (خوێنەری بەڕێز) بە دوورو درێژی بخاتەڕوو.

لەکاتێکدا کە کتێبەکە بۆ چاپ ئامادە بوو، گفتوگۆیەکی دەوڵەمەند لە نێوان سێ لە گرنگیدەرانی پەیوەندی نێوان مێشك و خوودی مرۆڤایەتیدا ڕوویدا. بۆیە پێم باش بوو کە ئەو گفتوگۆیە لەم باسەدا زیاد بکەم، چونکە وا گومان دەبەم کە پرسەکە دەوڵەمەندتر دەکات و چەند هەنگاوێك دەیخاتە پێشەوە و، وەك دەوترێت خاڵ دەخاتە سەر پیتەکان.

**یەکەم:** کەسی یەکەمی سێ بەشداربووەکەی گفتوگۆکە، ڕۆژنامەنووس و ڕاگەیاندنکاری بەناوبانگی ئەمریکی (لی سترۆبڵ) Lee Stroble بوو، کە بۆ چەند ساڵێك لەسەر بێباوەڕیی بوو پاشان هاتەسەر باوەڕو داننان بە بوونی خودا، پرسیارەکانی ئەو وەك نوێنەری فیکری ماددیگەرانی دەخەمە ڕوو بە ناوی خوازراوی (زریان) ئاماژەی بۆ دەکەم!

**دووەم:** (د. مۆریلاند J.P.Moreland) ە، مامۆستای فەلسەفەی ئەمریکی کە گرنگی بە فەلسەفەی عەقڵ و زانستی ئایینەکان دەدات.

**سێیەم:** (من) م، نوسەری ئەم کتێبەی بەردەستت. من و دکتۆر مۆریلاند نوێنەری فیکری ئایینی دەبین و لەژێر ناوی خوازراوی (داربەڕوو) ئاماژەمان بۆ دەکرێت!

**ناوونیشانێکیشم بۆ گفتوگۆکە هەڵبژاردووە:**

**هۆش و عەقڵ و خوودی مرۆڤایەتی**

(زریان) دەستی بە گفتوگۆ کرد و، لە (داربەڕوو)ی پرسی:

مرۆڤ بە عەقڵ Mind لە بونەوەرانی تر جیاوازە، کە(هۆش) Consciousness گرنگترین دیمەنەکانیەتی، ئیتر چۆن دەتوانین پێناسەی هۆش بکەین؟

داربەڕوو وەڵامی دایەوە: هۆش بریتییە لە توانای بیرکردنەوە لە دەورووبەرمان و ناخمان. هۆش لە پشت هەموو هەست و نەست و بیرۆکە و ئارەزوو و بیروباوەڕ و ئازادی مرۆڤەیەوە، کە وامان لێدەکات هەست بەوە بکەین کە زیندووین.

بە سادەیی هۆش جیاوازی نێوان مرۆڤی هۆشیار و مرۆڤی خەوتووە. کاتێك لە خەو هەڵدەستی، هەستناکەی کە ئامادە نەبوو (غائب) یان نەبوو بووی، پاشان وردە وردە هەست بە دەورووبەرت دەکەی: دەزانی کە کێ خەبەری کردوویتەوە، لە کوێی، بەر لە خەوتن بیرت لە چی دەکردەوە، ئەو ئەرکانە چین کە پێویستە ئەو بەیانییە ئەنجامیان بدەی. تۆ ئێستا هاتیتەوە سەر شانۆی ژیان، ئیستا تۆ هۆشیاری.

دەکرێت هۆش بە تەزوی کارەبا بچوێنرێت کە کۆمپیوتەر بەو نەبێت کار ناکات! تواناکانی کۆمپیوتەر پەکیان دەکەوێت ئەگەر تەزووی کارەبایی بپچڕێت. زریان گوتی: زۆر لە زانایانی بایۆلۆجی عەقڵ Mind بە بەرپرس دەزانن لە هۆشیاریی بەرهەمی راستەوخۆی مێشکی ماددی Brain، رێك وەك چۆن دوو گورچیلەکە میز بەرهەم دێنن لەبەر ئەوە لایەنگرانی پەرەسەندنی داروینی پێیان وایە کە کاتێك مێشك گەیشتە ئەم قەبارەو ئاڵۆزییەی ئێستای، عەقڵ بەشێوەیەکی خۆکردارانەو وەك هەنگاوێکی پەرەسەندن درووستبوو.

بۆ ئەوەی لەگەڵت ڕاشکاوبم، ناتوانم باوەڕ بەوە بکەم کە پەرەسەندنی هەڕەمەکی توانای ئەوەی هەبێت عەقڵی مرۆڤ بە هەموو تواناکانیەوە دروست بکات، ڕای تۆ چییە؟

داربەڕوو گوتی: تۆ بە تەنیا نیت کە پێت وایە ئەم کارە ئەستەمە، سەیری مامۆستای فەلسەفەی بەریتانی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد کۆڵن ماك گین Colin Mc Ginn بکە، کە چی دەڵێت:

ناتوانم باوەڕ بەوە بکەم کە ماددە بە هەر ئامرازێکی بایۆلۆجیا بتوانێت عەقڵ درووست بکات.

عەقڵ وەك ژیان وایە، بە تەواوی میوانێکی نوێیە لەسەر ئەم گەردوونە، لە ڕاستیدا بازدانێکی گەورەیە لە جۆرێکی جیاوازدا. پێویست ناکات کە زانایانی بایۆلۆجی پەرەسەندن لە کێشەکە ڕابکەن و چاوپۆشی لێبکەن!!

**هەروەها داربەڕوو گوتی: ئەوانەی دەڵێن عەقڵ لە مێشکی ماددی سەرچاوەی گرتووە ڕووبەڕووی چوار کێشە دەبنەوە:**

**یەکەم:** ئەم قسەیەیان، واتای ئەوەیە کە مادده بەوە جیادەکرێتەوە کە عەقڵێکی شاراوەی تێدایە و، کە دەگاتە ئاستێکی دیاریکراو لە ئاڵۆزی پێکهاتەی و دەتەقێتەوە و ئەو توانا شاراوانەی دەردەکەون!

ماددیگەراکان سیفاتی وایان بە مادده بەخشیوە کە بە تەواویی پێچەوانەی چەمکە ماددیگەراییەکانن، لە ڕاستیدا ئەو سیفاتانە لە دیدی دینداران نزیکترن وەك لە دیدی ماددیگەراکان.

**دووەم:** ئەگەر عەقڵ لە مادده هەڵقوولاوە، بە بێ پشتبەستن بە زیرەکیی ڕەهای بەرز، ئەوا چۆن متمانە بە زیرەکیەکانی عەقڵ بکەین؟
لە خانەی لێکچواندندا، ئەگەر کەسێکی عەقڵ ناتەواو بەرنامەڕێژی کۆمپیوتەر بکات، ئایە متمانەمان بە دەرکردەکانی کۆمپیوتەرەکە دەبێت! ئەدی ئەگەر ئەو بەرنامەداڕێژەرە هەر عەقڵی نەبێت؟

**سێیەم:** عەقڵەکانمان باوەڕیان بە زۆر چەمکی سرووشتی هەیە (وەك ئەوەی کە بەشێك لە هەموو بچوکترە (الجزء أصغر من الكل) و، لە پشت هەموو دەرئەنجامێك هۆکارێك هەیە)، کە پێویستیان بە بەڵگە نییە، یەکەم چەمکیش بریتییە لەوەی کە باوەڕمان بە سەلامەتی عەقڵمان و حوکمەکانمان هەیە، ئیتر ئەو چەمکانە لە کوێ هاتوون کە هەموو کاروبارەکانی ژیانمان و بیرۆکە و چەمکەکانمانی لەسەر بنیات بنێین؟ چۆن دەکرێ دەردراوێکی ڕاستەوخۆی چالاکی کارۆموگناتیسی خانەکانی مێشك بێت؟ چۆن وامان لێدەکات کە بەو دڵنیاییەوە متمانە بەم چەمکە سرووشتیانە بکەین.

چوارەم: هەڵقوڵانی عەقڵ لە ماددەوە پێویستی بەوە هەیە کە بچێتە ژێر باری یاسا کیمیایی و فیزیاییەکانی ماددە و خاسیەتە حەتمییەکانی. گریمانەی چارەنووسیی حەتمییەت نایەتەوە لەگەڵ ئەو ئازادییەی مرۆڤ لە هەڵبژاردندا هەیەتی، تۆ ئێستا ئازادی لەوەی خوێندنەوەی ئەو باسە تەواو بکەی، یان کتێبەکە دابخەی.

زریان قسەی پێ بڕی و گوتی: من داوات لێدەکەم لەگەڵ مندا بێی. گریمان عەقڵ هەڵقووڵاوی ڕاستەخۆی مێشکە هەروەك ماددیگەراکان باوەڕیان وایە، بەڵام دەرەنجامەکانی چی دەبێ؟

داربەڕوو وەڵامی دایەوە: ناتوانم زۆر لەگەڵت بڕۆم، چونکە ئەگەر ئەم دیدە ڕاست بووایە ئەوا عەقڵی مرۆڤ هەر لە بنەڕەتدا بوونی نەدەبوو!!

چونکە ئەگەر عەقڵ دەرەنجامی ڕاستەوخۆی ماددە (مێشك) بێت، ئەوا هەموو مرۆڤەکان لە هەموو پرسەکاندا یەك ڕا و بۆچونیان دەبوو! چونکە دیدی ماددیگەرایی یەك دیدە هەروەك لە زانستیە سرووشتییەکاندا دەیبینین، ئەمە واتای ئەوەیە کە دیدی ڕێژەیی پرسەکان ون ببێت، کە گرنگترین خاسیەتی عەقڵی مرۆڤە.

زریان گوتی: تۆ کۆسپە لۆژیکییەکانی بەردەم بیرۆکەی پەیدابوونی عەقڵ لە مێشکی ماددیت خستەڕوو، لە بوونی ئەم کۆسپانەش ناکرێ عەقڵ بەرهەمی مێشك بێت. بەڵگەی لەم شێوەیە لە لای زانایانی لۆژیك بە بەڵگەی نەرێنی هەژمار دەکرێت، ئایا بەڵگەیەکی ئەرێنیت هەیە؟

داربەڕوو گوتی: بەڵگەی تاقیگەییت پێشکەش دەکەم. گومانیش لەوە دانییە کە بەڵگەی تاقیگەیی بەهێزترین بەڵگەی زانستین.

د.ویڵدەر پێنفیڵد (دامەزرێنەری زانستی نەشتەرگەریی دەماریی نوێ) زیاتر لە هەزار نەشتەرگەری بۆ نەخۆشانی فێ (صرع) کردووە کە بەدەرمان چارەسەر نەبوون و، لە کاتی نەشتەرگەرییەکاندا هەوڵیداوە بگاتە ناوچەی عەقڵ لە ناو

مێشکی مرۆڤدا، ئەمەش لە ڕێگەی چالاك کردنی کارەبایی ناوەندە جیاوازەکانی پەردەی مێشك، لە کاتێکدا کە نەخۆشەکە لە ژێر کاریگەری سڕکەری خۆجێییدا بووە.

لە کاتی چالاککردنی ناوچەیەکی دیاریکراودا، دەستی نەخۆشەکە دەجولا و، نەخۆشەکە هەوڵی دەدا لە ڕێی دەستەکەی تری ڕێ لە جووڵەی بگرێت. کاتێك پێنفیڵد ئەمەی لەگەڵ نەخۆشەکانیدا باس کردووە، لە وەڵامدا گوتوویانە کە ئەو دەستی ئەوانی جووڵاندووە، ئەوان نەیان توانیوە ڕێگری لێبکەن.

ئەمە واتای ئەوەیە، لەو کاتەی دەستێکی نەخۆشەکە لەژێر دەسەڵات و کاریگەری ڕاستەوخۆی چالاکی کارەبایی بۆ پەردەی مێشك بووە، ئەوا ویستی نەخۆشەکە هەوڵی داوە کە بە دەستەکەی تری ڕێ لە جووڵەکەی بگرێت. ئەمە ئەوە دڵنیا دەکاتەوە کە مرۆڤ ویستێکی سەربەخۆی هەیە لە چالاکی کارۆکیمیایی مێشك.

سەرەڕای ئەوەی کە د.پێنفیڵد لە لێکۆڵینەوەکانیدا ئامانجی ئەوەی هەبوو کە بیسەلمێنێت کە مێشکی مرۆڤ هەموو شتێکە و هیچ شتێکی تری لە پشتەوە نییە، بەڵام لە کۆتاییدا دانی بەوە دانا، کە هەر یەکە لە مێشك و عەقڵ بوونێکی سەربەخۆیان هەیە و، هەریەکەیان خاوەن سرووشتێکی جیاوازن!

هەروەها دکتۆر ڕۆجێر سپێری (کە خاوەنی خەڵاتی نۆبڵە بەهۆی لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی جیاوازی فەرمانەکانی هەردوو بەشەکەی مێشك) دوای تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوە زۆر و زەوەندەکانی لەسەر مێشکی مرۆڤ، ئەوەی دڵنیا کردۆتەوە کە فەرمانە عەقڵییەکان پشت بە چالاکییەکانی مێشکی ماددی نابەستن، ئەگەر چی وەك ئامرازێکیش بەکاری دەهێنێت.

زریان گوتی: گومان لەوەدانییە کە سەرچاوەی عەقڵی مرۆڤ گرنگترین پرسی ژیانمانە، ئەگەر چی خەڵکی ئاساییش زۆر گرنگی پێنەدەن. ئایا بەڵگەی تر هەیە لەسەر ئەوەی عەقڵ شتێکەو مێشك شتێکی ترە؟

داربەڕوو (وەك ئەوەی قسە بە زریان ببڕێت) گوتی: داوای لێبوردن دەکەم.. سەردانی پزیشکم هەیە بۆ ئەنجامدانی هەندێك پشکنینی تیشکی تا لە فەرمانەکانی دڵ و سیەکانم و مێشکم دڵنیاببمەوە. ڕێگریەکیش نییە لەبەردەم ئەوەی کە هەندێك پشکنین و وێنەی هێڵکاری کارەبایی مێشکیش بگرم بۆ دڵنیابوونەوە لە ڕاستی و دروستی بیرۆکە و هەستەکانم. ها..ها..ها.

گومان لەوە دانییە کە هەر پشکنینێك کە لەسەر مێشك ئەنجامدەدرێت ناتوانێت پەی بە بیروبۆچونمان ببات و ڕاستی و هەڵەییان هەڵسەنگێنێت. ئەوەی لەناو عەقڵماندا ڕوودەدات شتێکی زۆر تایبەتییە.

زریان قسەی بە داربەڕوو بڕی و گووتی: زانست توانای زانینی چالاکیە عەقڵیەکانمانی سەلماندووە، چونکە زانایان لە ئێستادا دەتوانن لە ڕێی تۆمارکردنی چالاکی کارەبایی مێشك و سەرنجدانی جوڵەی چاوەکانی لە کاتی خەوتندا ئەوە دیاری بکەن کە کەی خەون دەبینین.

داربەڕوو گووتی: ئایا جووڵەی چاوەکان و چالاکی و کارەبایی مێشك دەتوانن ناوەڕۆکی خەونەکانمان پێبڵێن؟

نەخێر پێویستە کەسەکە خەبەر بکەینەوە تا ناوەڕۆکی خەونەکەیمان پێبڵێت.

ئەو چالاکییە کارەباییەی لە کاتی خەوندا تۆماری دەکەین ئەوە دەگەیەنێت کە گونجانێك هەیە لە نێوان چالاکی عەقڵیمان و چالاکی کارەبایی مێشك، بەڵام ئەمە بۆمان دیاری ناکات کە کامەیان هۆکارەو کامەیان ئەنجامە.

زریان لە ڕۆڵی هاندەردا بە داربەڕووی گوت:

من بەڵگەیەکی زانستیی بە هێزم هەیە، کە وا هەست دەکەم ناتوانی ڕەتی بکەیەوە، کە دڵنیای دەکاتەوە بەوەی مێشك سەرچاوەی عەقڵە، تەنانەت سەرچاوەی هەستەکانیشە.

مرۆڤ هەر لە دێر زەمانەوە توانیویەتی کە بەسەر ئاستی هۆشیاریی و بیرتیژیی و هەستەکانیدا زاڵ بێت، لە ڕێی دەرزی هۆشبەرو مەیخواردنەوەوە:

جارێکیان هۆشیاری مرۆڤ و هەستەکانی جارێکیان سەری لێدەشێوێت دەربارەی خۆی. من براوەمەتەوە!

جارێکیان لە بوون جیادەبێتەوەو، دەچێتە جیهانێکی ترەوە!

جارێکیان عەقڵی لەدەست دەدات!

بە هەمان شێوە پزیشکە دەروونیەکان لە ڕێی ئەودەرزییەی راستکردنەوە لە کیمیای مێشکدا دەکات توانیویانە هەستەکانی مرۆڤ بگۆڕن، تەنانەت تێڕوانینەکانی بەرامبەر خوود و بوونیش بگۆڕن. لە ڕێی دەرزی و دەرمانەوە توانیویانە زۆر کەم و کووڕی چاك بکەن کە تووشی هۆش و عەقڵ و دەروون دەبن.

ئایا هەموو ئەوانە نایسەلمێنن کە کیمیای مێشك لە پشت هەموو شتێکەوەیەو، پاشان هۆش و عەقڵ و هەست هەموویان لە مێشکەوە سەرچاوە دەگرن؟

داریەڕوو بە زەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە:

یەکێك لەو لێکچواندنانەی زۆر بەکاردەهێنرێت و بەباشی گوزارشت لە پەیوەندی نێوان عەقڵی مرۆڤ و مێشکی دەکات، ئەویش چواندنیەتی بەپەیوەندی نێوان شەپۆلەکانی کارۆموگناتیسی، کە پەخشی تەلەفزیۆنی (عەقڵ) هەڵی دەگرێت، لەگەڵ ئامێری وەرگری تەلەفزیۆن (مێشك). گومانیش لەوە دانییە کە لەڕێی کۆنترۆڵەوە دەتوانین هەموو خاسیەتەکانی ئەو پەخشە بگۆڕین کە بۆمان دێت.

ئێمە دەتوانین وێنەکە بکەینە ڕەنگاو ڕەنگ یان ڕەش و سپی، روون یان لێڵ، دەنگی بەرز بکەینەوە یان نزمی بکەینەوە، تەنانەت دەتوانین توانای وەرگرتنی ئامێرەکە بەرز بکەینەوە، هەموو ئەم شتانە دەکەین، کەچی پەخشی تەلەفزیۆنی ناگۆڕێت. هەر ئەوەشە کە دەرزی و دەرمانە بێهۆشکەرەکان و مەی بە ئامێری تەلەفزیۆن! ببورن بە مێشك دەیکەن.

زریان گوتی: تۆ بە شێوەیەکی تاقیگەیی و لۆژیکی سەلماندت کە عەقڵی مرۆڤ دیاردەیەکی نا ماددییەو، بەرهەمی ڕاستەوخۆی مێشکی ماددی مرۆڤ نییە. ئایا عەقڵ حەقیقەتی مرۆڤە و خوود و جەوهەریەتی؟

داریەڕوو وەڵامی دایەوە: نەخێر، ئەگەر هۆش یەکێك بێ لە فرمانەکانی عەقڵ، ئەوا عەقڵ یەکێکە لە ڕووکارەکانی خوودی مرۆڤایەتی.

زریان پرسی: خوودی مرۆڤایەتی چیە؟ بۆچی ئەوە قەبووڵ ناکەی کە عەقڵ کۆتایی ڕێگاکەیەو، بریتییە لە خوودی مرۆڤ؟

داریەڕوو گوتی: با ڕووداوێکی راستەقینەی بە ئازارت بۆ بگێڕمەوە، بەڵام بە باشی مەبەستەکەم ڕووندەکاتەوە.

یەکێك لە قوتابیە کچەکانی زانکۆم بە ناوی سۆزی لە مانگی هەنگوینیدا تووشی ڕووداوێکی سەخت بوو، کە بەهۆیەوە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك ( هۆش)ی لەدەست دا. کاتێك هۆشی هاتەوە، تووشی لەدەستدانی بەشێك لە یادەوەری ببوو، لە بیری کردبوو کە هاوسەرگیری کردووە. هەروەك چۆن توشی گۆڕانی ( کەسایەتی و ڕەفتارەکانی ) ببوو.

وەك هەنگاوێکی چارسەر تۆمارێکی ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەیان نیشاندا، بەمەش وردە وردە بیری کەوتەوە کە هاوسەری ئەو پیاوەیەو، وردە وردە کەسایەتی و سرووشتی خۆی بۆ گەڕایەوە.

سۆزی بە درێژایی ماوەی لەدەست دانی یادەوەری بۆ ئێمە هەر سۆزی بوو. هەروەك چۆن بە درێژایی ئەو ماوەیەش و سەرەڕای لەدەستدانی بەشێکی یادەوەری و گۆڕانی کەسایەتی خۆیشی دەیزانی کە سۆزییە!

ئایا ئەمەیان ئەوە ناسەلمێنێت کە ئێمە بوونێکی راستەقینەمان هەیە و جیاوازە لە هۆش و یادەوەری کەسێتیمان.

ئێمە هەر (خۆمانین)، هەتا ئەگەر هۆشیشمان لەدەست بدەین و یادەوەریشمان لاوازبێت و کەسایەتی و سرووشتمان بگۆڕێت.

ئەگەر مێشکی مرۆڤ بەش بەش بکەین، هەتا ئەگەر سەیری هەر خانەیەك لە خانەکانی بکەین، ئەوا ناتوانین دەست بخەینە سەر شوێنی بوونی خوودی مرۆڤایەتی.

ئێمە لە ڕێی پشکنینەکان ناتوانین کەسایەتی مرۆڤ بزانین، چۆن ئەو مرۆڤە هەست دەکات؟ بیر لە چی دەکاتەوە؟ ئامانجەکانی چین؟ تێڕوانینی بەرامبەر بوون چیە؟ و بەم شێوەیە.

پوختەی قسان ئەوەیە کە حەقیقەتی مرۆڤ سنووری لاشەو مێشك و عەقڵ و هۆش تێدەپەڕێنێت، مرۆڤ ئەو جەوهەرەیە کە وا هەستدەکات بوونێکی تەواو و یەکگرتووە، دەربارەی خۆی دەڵێت (من).

لەبەر ئەوە سێرجۆن ئیکلز لە کاتی وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ لە پزیشکیدا (لەسەر لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی بایۆلۆجیای مێشك) ڕایگەیاند: من ناچارم دان بە سرووشتێکی نامادی خوودی خۆم و عەقڵم دابنێم، سرووشتێك کە لەگەڵ ئەوەدا دێتەوە کە دینداره‌کان ناوی (ڕۆح) ی لێدەنێن.

هەروەها سێر شێرینگتۆن[1] بەر لە مردنی بە پێنج ڕۆژ ڕایگەیاند کە ( ڕۆح جەوهەری مرۆڤە کە بە مردن لەناو ناچێت).

زریان هەڵچوو گووتی: شێرینگتۆن بازێکی گەورەی داوە بە قسەکردنی دەربارەی نەمریی جەوهەری مرۆڤ، بەڵام چ بەڵگەیەکی زانستی لەسەر ئەوە هەیە؟

داربەڕوو وەڵامی دایەوە: لەوانەیە شتێکت بیستبێت دەربارەی ئەزموونی ئەوانەی لە مردن نزیك دەبنەوە Near Death Experiences.

زۆر لێکۆڵینەوەی متمانەپێکراو دەربارەی ئەو بابەتە دەریانخستووە کە هەستکردنی مرۆڤ تا دوای وەستانی مێشکیش هەر بەردەوام دەبێت.

یەکێك لە گرنگترین لێکۆڵینەوەکان[2] ٦٣ نەخۆشی لەخۆ گرتووە کە تووشی جەڵتەی توندی دڵ بوون و، مردنیان ڕاگەیەنراوە، بەڵام دواتر چاك بوونەتەوەو،

---

(١) مامۆستای فەرمانەکانی ئەندامەکانی لەش لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، کە لیژنەی خەڵاتی نۆبڵ بە بلیمەت ناویان برد کە گەیشتۆتە کاری مێشك و دڕکەپەتك.

(٢) ئەم لێکۆڵینەوەیە لە گۆڤاری زانستی Resuscitation بڵاو کراوەتەوە. ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە لە ساڵی ٢٠٠١ لە بەردەم زانایانی مێشك و دەمار و چاودێری چڕ لە The California Institute of Technology بڵاو کرایەوە.

هەندێکیان شتی سەیر دەگێڕنەوە. هەندێکیان باسی ئەوەیان کردووە کە وایان هەستکردووە کە لە لاشەیان جیابونەتەوەو بەسەریەوە سوڕاونەتەوەو، پزیشك و پەرستارەکان لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ لاشەی مردووەکەدا هەستیان بەوە کردووە کە چۆن دواتر ڕوحیان دێتەوە بەر!

هەندێکی تریان دەڵێن کە تونێلێکی دوورو درێژی تاریکییان دیوەو لە کۆتاییەکەیدا بازنەیەکی ڕووناکیان بەدی کردووە. هەندێکی تریان دەڵێن کە تۆپی تێنسیان بینیوە کە فڕێ دراوەتە سەر نەخۆشخانەکەو، ڕاستی هەموو ئەمانەش سەلمێنراوە.

شتگەلێکی وایان دیوە کە لە یادەوەریاندا ماوەتەوەو، هەندێ لەو شتانە سنوری هەستەکانیان تێپەڕاندووە، لەو ماوەیەی ئۆکسجین لە مێشك بڕاوە!

ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە خوودێکی سەربەخۆ و جیاواز لە مێشکمان هەیە، کە توانای هەستی بەرزی هەیەو، سەرچاوەی هەستکردنە بە خوود و سەرچاوەی عەقڵە و، ئەم خوودە هەر لەسەر هۆشی خۆی دەبێت هەتا ئەگەر خەریك بێت مێشکیش لەکار بکەوێت.

ئەگەر ئەم دەرەنجامانە لەلای ماددیگەراکان قبوڵ نەبێت، ئەوا کەسە دادگەرو ڕاشکاوەکانیان دان بەوەدا دەنێن کە بێتوانان لە لێکدانەوە بۆ ئەوەی کە چۆن توانا عەقڵیەکان لە مێشکی ماددیەوە سەرچاوە دەگرن.

ئەم چەمکە سەرنجی زۆر لە زانایانی دەروونناسی ڕاکێشاوە، بۆیە هەندێکیان هەستاون بە پەیوەندی کردن لەگەڵ ئەو خوودە ناماددییانەی لە دوای مردنی لاشەکانیان هەر بەزیندوویی ماونەتەوە، بۆ ئەوەش هیچ ڕێگایەکیان لەبەردەمدا نەبووە، تەنیا لەڕێی کەسە ڕۆحانییەکانەوە نەبێت!

زانایانی دەروونناسی سوورن لەسەر جێبەجێکردنی تەواوی مەرجەکانی لێکۆڵینەوەی زانستیی بەسەر ئەو تاقیکردنەوانەدا، ناوەندە زانستییەکانیش بە گومانەوە سەیری دەرەنجامەکانی ئەو تاقیکردنەوانە دەکەن، ئەمەش بەهۆی پێگەی خراپی ئەو کارە و خراپ بەکارهێنانی لەلایەن فاڵچی و فێڵبازەکانەوە. لە کۆتاییدا بەڵگەیەکی ئایینیت پێشکەش دەکەم لەسەر ئەوەی کە عەقڵ

بەتەنیا بوونی نییە، بەڵکو چالاکییەکی خودیی مرۆڤە، چونکە قورئانی پیرۆز باسی لاشە و دڵ و دەروون و رۆحمان بۆ دەکات، بەڵام باسی عەقڵمان بۆ ناکات! ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە چالاکی بە عەقڵ بیرکردنەوە ٤٩ جار و بە دەستەواژەی جیاواز لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.

ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بە عەقڵ بیرکردنەوە کردارێکە مرۆڤ پێیەوە هەڵدەستێت و پێکهاتەیەکی سەربەخۆ و دیاریکراوی نییە؟

زریان هێمن بووەوە و خەریك بوو خۆی دەدا بەدەستەوە، پرسی: ئایا دەکرێ کە بڵێین خوودی مرۆڤ لە دیدی دینداراندا بریتییە لە ڕووح؟

داریەڕوو لەگەڵیدا هاوڕا بوو و گوتی: ئایینە ئاسمانییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ڕوح جەوهەری ناماددی مرۆڤە، چونکە مرۆڤ بریتییە لە لاشە و ڕوح، لەبەر ئەوە دەتوانین بەوە وەسفی خۆمان بکەین و بڵێین کە ئێمە ڕوحی بە لاشەو لاشەی بە ڕوحین.

دووانەیی ڕوح و لاشە Dualism لە هەموو ژیارستانییەتەکاندا بوونی هەیە، بەدرێژایی مێژوو و بەدرێژایی جوگرافیا، هەروەك دەشزانن کە ئەم دوانەییە تەوەری ژیانی میسرییە کۆنەکان بووە.

وشەی ڕوح لە دیدی ئیسلامدا دوو ناوی هەیە[1]، یەکەمیان پێی دەگووترێ ڕوحی زیندەوەریی، کە مەبەست لێی ژیانە و، خاسیەتی جیاکەرەوەی هەموو زیندەوەرانە و، بزوێنەری هەموو چالاکییە زیندووەکانی وەك هەناسەدان و کاری دڵ و گورچیلەکان و هەرسکردن، لە کاتی خەوتن و هۆشیاریدا. ئەمەش لە هەموو مرۆڤێکدا بوونی هەیە، هەر لەو کاتەوە کە هێلکە یان سپێرم بووە، بۆیە ئەگەر ڕوحی زیندەوەریی لە لاشە جیابێتەوە مرۆڤ دەمرێت.

ناوەکەی تری ڕوح رۆحی هەستپێکەرە، کە تایبەتمەندییەکی جیاکەرەوەی مرۆڤە و، مەبەستیش لە فەرموودەی خودا (قل الروح من أمر ربي) واتا: بڵێ

---

(١) ئەم چەمکە ئیمامی غەزالی لە کتێبی (إحياء علوم الدين) بەرگی یەکەم بابی (العلم) خستوونیەتەڕوو.

ڕووح فەرمانی خودایە و من نازانم چییە و چۆنە. ئەم ڕووحە بەرپرسەیە لە چالاکییە عەقڵییەکان، هەروەك چۆن دوێنراو و راسپێردراو و لێپرسراوە لەلایەن خودا. ڕووحی هەستپێکەر لە کاتی خەوتندا لە لاشە جیادەبێتەوە، بەمەش مرۆڤ لە هۆش و هەست دەوەستێت. ڕووحی هەستپێکەر نەمرە و لەناوناچێت، بەڵام لەکاتی مردندا لەلاشە جیادەبێتەوە و لەکاتی زیندووبوونەوەدا بۆی دەگەڕێتەوە[1].
زۆر کەس بڕوایان وایە کە ڕووحی هەستپێکەر بە تەنیا بریتییە لە خوودی مرۆڤ و، لاشە جگە لە ئاژەڵی سواریی ڕووح هیچی تر نییە. بەڵام راستەکە ئەوەیە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی تێکەڵە لە ڕووح و لاشە، بەمەش ئەم دووانەیە خوودی مرۆڤ و جەوهەری مرۆڤن.

زریان بە تەواوی ئارام بووەوەو ئۆخژن بە دڵیدا هات، چونکە بەڵگەی عەقڵی و زانستی دەستکەوت کە ماوەیەکی زۆر بوو لە پرسی خوودی مرۆڤایەتیدا بەدوایاندا وێڵ بوو.

لەوکاتەدا داریەڕوو گووتی:

دواقسەم لەسەر ئەو بابەتە بە وتەی چارلس داروین دەستپێدەکەم، کە دەڵێت:

((ئەگەر پەرەسەندن لە لێکۆڵینەوە بۆ هەر دیاردەیەك پەکیکەوت، ئەوا پێویستە پەنا ببەینە بەر لێکدانەوەکەی تر، ئەویش چەمکی بەدیهێنانی تایبەتییە کە خودا لە پشتییەوەیە)).

ئەگەر پرسەکەمان بەم یاسایە بپێوین، دەڵێین: گەیشتووینەتە دووڕیان و لەسەرمان پێویستە یان دان بە خوودی مرۆڤایەتیدا بنێین و بڵێین ئەو چالاکییانەی ئەنجامیان دەدات لە بیرکردنەوە و هەست کردن و ڕەفتار و دینداریی، مەحاڵە وردبکرێتەوە بۆ کیمیا و فیزیا، پاشان بڕۆین لە دەرگای زانستە ئایینییەکان بدەین، تا ئەم مەتەڵەمان بۆ وەڵام بداتەوەو، دید و بۆچوونمان

---

(١) ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝١ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ۝٢ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝٣ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ۝٤ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة: ١ - ٧

فراوانتر و گشتگیرتر و قووڵتر بکات، یان ئەوەتا زانست بگۆڕێت بۆ ئامرازێك بۆ سەلماندنی هزرە ماددیە پێشوەختەکان، لە جیاتی ئەوەی ئامانجەکەی بریتی بێت لە گەڕان بەدوای ڕاستییەکاندا.

پێویستە زانست ئەوە پەیڕەو نەکات کە یەکێك لە بانگەشەکارانی دەڵێت:

I made up my mind، don't bother me with facts

من بڕوای خۆمم یەکلاکردۆتەوە و لاپەڕەکانم پێچاوەتەوە، بۆیە تکایە بە ڕاستەقینەی زانستیی نوێ بێزارم مەکە!

## باسی هەشتەم



## زانست لە نێوان خراپ بەکارهێنانی بێباوەڕان و تۆمەتبارکردنی دینداران: بێباوەڕیی لە خراپترین دۆخیدا

لە کاتی پێداچوونەوەی یەکێك لە هاوڕێ ڕۆشنبیرەکانم بە چەند بەشێکی کتێبەکە، پێی گوتم:

میسرییەکان (مسوڵمان و مەسیحی) هەر لە سەردەمی فیرعەونەکانەوە سرووشتێکی دینداریيان هەیە. بێگومان ئەو مێژووە دوورو درێژەی دینداریيان جێپەنجەی لەسەر فیترەتیان داناوە.

سەرەڕای ئەوەش، لە شێواز و خستنەڕووی کتێبەکەتدا وا دەردەکەوێت کە گفتوگۆ لەگەڵ بێباوەڕاندا دەکەی.

پاشان پرسی، ئایا نووسین و بڵاو کردنەوەی ئەم کتێبە ئەوەندە دێنێت کە ئەو هەموو کات و هەوڵەی تێدا خەرج بکەی؟ من پێم وایە کە خستنەڕووی ئایین بەم شێوەیە زۆر پەیوەندی بە ئێمەوە نییە.

وەڵامی هاوڕێکەمم دایەوە و گوتم : گومان لەوەدا نییە کە میسیرییەکان بە ئارەزوونکی بەهێز بۆ ئایین لە دایك دەبن، پاشان خێزان و کۆمەڵگە ئەرکی چاودێری کردنی ئەم تۆوە و بە خێوکردن و گەشەپێدانی دەگرنە ئەستۆ.

واتا هۆکارە بایۆلۆجیەکان و هۆکاری گەشە کردن - زۆر - کاریگەریان لەسەر بنیاتنانی هزری ئایینی هەر یەکێکمان هەیە.

بەڵام مرۆڤ (کە توانای عەقڵی هەبێت) پێویستە بەوەندە وازنەهێنێت، بەڵکو پێویستە دینداریەکەی لە باوەڕی لە دایك بوون و گەورەبوونەوە بۆ ئاستی (دڵنیایی) عەقڵی و زانستی بەرز بکاتەوە، قورئانی پیرۆزیش پڕە لەو ئایەتانەی هانی ئەوە دەدەن، ئەوەتا بانگەوازکردن بۆ عاقڵبوون زیاتر لە پەنجا جار هاتووە، هەروەك فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾ الرعد: ٤

واتە: لە هەموو ئەمانەدا نیشانەو دەلیل هەیە لەسەر گەورەیی خودا بۆ کۆمەڵێ کە خاوەن هۆش بن.

هەروەها بانگەوازکردن بۆ بیرکردنەوە زیاتر لە بیست جار هاتووە، فەرموویەتی

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الرعد: ٣

واتە: لەم کارانەدا چەندین ئایەت و بەڵگە هەن دەلالەت لە گەورەیی و دەسەڵاتی خودا دەکەن بۆ ئەو کۆمەڵەی بیرو هۆشیان ئەخەنە کار.

هەروەها ستایشی دانایی زیاتر لە بیست جار هاتووە، فەرموویەتی:

﴿ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ﴾ البقرة: ٢٦٩

واتە: بێگومان ئەوەی ئەو زانایی و ژیری و حیکمەتەی بدرێتێ ئەوە خێرێکی زۆری پێدراوە. بۆیە لەسەر مرۆڤ پێویستە بە دەم ئەو بانگەوازەوە بچێت تا دەگاتە پلەی:

﴿ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ﴾ فاطر: ٢٨

واتە: لە ناو بەندەکانی خوادا هەر زانایان لە خوا دەترسن چونکە ئەوان شارەزای کارو کردەوەی خوان و پەی بە گەورەیی خوا ئەبەن.

من وادەزانم کە کتێبی (گەشتی عەقڵ) هەنگاوێکە لەو ڕێگایە.

پاشان گوتم : باشترین ڕێگا بۆ ئەوەی مرۆڤ نرخی حەق لە لای خۆی بزانێت، ئەوەیە کە بەهی کەسانی دی بەراوردی بکات. ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالیبیش (ڕەزای خوای لێبێت) مەبەستی ئەوەیە کە دەفەرموێت: هەر کەسێك کوفر نەناسێت باوەڕ ناناسێت. من وادەزانم کتێبی (گەشتی عەقڵ) هەنگاوێکە لەو ڕێگایە.

سەرەڕای ئەوەی هەموو ئەو شتانەم دەزانی، کەچی قسەکانی هاوڕێکەم وایان لێکردم کە نووسین ڕابگرم و پێداچوونەوەی بۆ بکەم ئاخۆ خوێنەری ئێمە تا چ ئاستێك پێویستیان بەم کتێبە هەیە، دوو دڵ بووم لە نێوان وەستان و بەردەوام بوون .

دوای چەند ڕۆژێك، بە ئەزموونێکدا تێپەڕیم کە گەرمی کردمەوە لەسەر تەواو کردنی کتێبەکەو، گێڕامیەوە بۆ نووسین.

**خـــوێنەری بەڕێز...**

بانگهێشتی کۆنگرەیەك کرام کە لە ئەسکەندەرییە بەسترا بە بۆنەی تێپەڕبوونی سەد ساڵ بەسەر لە دایك بوونی چارلس داروین (خاوەنی بیردۆزی پەرەسەندن) و، لە کۆنگرەکەدا دوو مامۆستای کۆلێژە پزیشکیەکانی میسر بەشداربوون، کە چەندین ساڵیان لە پێناو داروین و بیردۆزەکەی خەرج کردبوو، کە تەمەنیان حەفتا ساڵی تێپەڕاندبوو.

دوو مامۆستاکە بەهێمنی تێڕوانینی خۆیان بۆ چەمکی پەرەسەندنی هەڕەمەکی خستەڕوو و، هەوڵەکانی خۆیان بۆ خستنەڕووی بیرۆکەکانی داروین خستەڕوو.

هەروەها بە ڕاشکاوی گوتیان کە پێویستە زانست و ئایین تێکەڵ نەکرێن، چونکە هەریەکەیان بوارێکی جیاوازە، پێویست ناکات پیاوانی هیچ کام لەو دوو بوارە نکوڵی لەوە بکەن کە لەلای ئەوانی تر هەیەو باوەڕیان پێی هەیە، هەروەها نابێت (بەناوی ئایینەوە) ڕەخنە لە هەڕەمەکیی بگرین کە خاڵی گرنگی بیرۆکەی داروینیزمە.

بەشداریکردنی من لە گۆنگرەکەدا، بۆ خستنەڕووی چەمکی دیزاینی زیرەك و پەرەسەندنی ئامانجدار بوو، کە وایدەبینێت پەرەسەندن ڕاستییەکی بایۆلۆجییە، بەڵام هەڕەمەکی و ڕێکەوت ناتوانن پەرەسەندن بەرەو بەدیهێنانی ئەو هەموو زیندەوەرە ببەن کە لەسەر زەویدا نیشتەجێن، بۆیە هیچ ڕێگاچارەیەکمان نیە جگە لە دانانان بەبوونی بەدیهێنەرێکی زیرەك لە پشت ئاراستەکردنی پەرەسەندنەوە.

دوای کۆنگرەکە، ڕێکخەری کۆنگرەکە و بەڕێوەبەری کۆنگرەکە (کە مامۆستایە لە یەکێك لە کۆلێژە پزیشکیەکان و یەکێکە لە گەورە ڕۆشنبیرانی میسر) هەر سیانمانی بانگهێشت کرد بۆ خوانی ئێوارە و دانیشتنێکی تایبەت کە زیاتر لە سێ کاتژمێری خایاند، لە دانیشتنەکەدا گفتوگۆکەمان دەربارەی (بەدیهێنەرو بەدیهێنراو و ئایین و پەرەسەندن بوو) بەڵام گفتوگۆکە ئاراستەیەکی تری وەرگرت و، پەردەی بابەتەکە لادراو، بە ئاشکرایی دوژمنداری دەرکەوت، لێرەدا بە قسەکانی دوو مامۆستاکە دەست پێدەکەم.

١- (چ پێویستیەکی زانستیمان) بەوە هەیە کە دان بە بوونی بەدیهێنەرێکی زیرەك یان بوونی خودا دابنێین؟ بە تایبەتی لە کاتێکدا کە ژیانمان دەڕواتەڕێوە، چ باوەڕبێنین یان بێباوەڕبین، هەروەها دانانان بە بوونی خودا هیچ شتێك لە بیردۆزە زانستییە پراکتیکیەکانی ئێمە ناگۆڕێت. یەکێکیان لێی پرسیم ئاخۆ باوەڕ بوون بە خودا هیچ شتێك لە بەرنامەکانی ڕۆژانەم دەگۆڕێت!

٢- دانانان بە بوونی دیزاینەرێکی زیرەك تەنیا هەوڵێکی میانڕەوە و هەڵبەستراوە لە نێوان ئایین و زانستدا، گرتنی دارەکەیە لە ناوەڕاستدا، بە تایبەت لەو کۆمەڵگایانەی لە ئازادی فیکر دەترسن.

٣- ئەگەر تا ئێستا زانست نەیتوانیبێت لێکدانەوە بۆ چەند پرسێکی وەك ( دروست بوونی گەردوون لە نەبوونەوە و، دروست بوونی ژیان لە ماددەی نازیندوو) بخاتەڕوو، بەڵام لە ئایندەدا زانست لێکدانەوەی زانستی بۆ ئەم پرسانەش دەخاتەڕوو.

٤- پێویست ناکات بەهۆی نەبوونی زانیاری زانستی پەنا ببەینە بەر بوونی خودا، چونکە بیرو باوەڕ نابێت لەسەر نەزانی دابمەزرێت.

٥- داننان بە بوونی خودا پێچەوانەی زانستە، چونکە ناتوانین بە هەستەوەرەکانمان هەستی پێبکەین.

٦- چۆن خودا ڕێ بەم هەموو جەنگ و لەناوبردنی مرۆڤ دەدات؟ چۆن خودا کارەساتە سروشتییە کاولکارەکان بەسەر مرۆڤ دێنێت؟ (ئەم بابەتە هەمان ئەو بابەتەیە کە ئەنتۆنی فلوی بەرەو بێباوەڕی برد و لەسەرەتای کتێبەکەدا باس کراوە).

٧- چۆن زاتی خودا، لە دەرەوەی کات و شوێندایە؟

٨- ئەگەر هەموو بەدیهێنراوێك بەدیهێنەرێکی هەبێت، ئەی کێ خودای بەدیهێناوە؟ دوو مامۆستاکە زۆر بەم پرسانەیان دڵخۆش بوون و لە گاڵتەکردندا کێبڕکێیان دەکرد!

٩- هەندێك لە فەیلەسوفەکانی سەردەم چەمکێك دەخەنەڕوو بە ناوی نارێکی بەدیهێنەر "الفوضى الخلاقه" (Creative chaos) کە واتای ئەوەیە نارێکی دوای تەقینەوە گەورەکەی گەردوون دەکرێ (بە شێوەیەکی خۆکرد) ئەو یاسایانەی لێ پەیدا بوبێت کە ئێستا گەردوون لەسەری دەڕوات . یاخود دەکرێ ئەو نارێکییە لەسەرەتادا سیستەم بووبێت بەڵام ئێمە نازانین یاساکانی چۆن بوون.

١٠- پابەندبوونی مرۆڤ بە بەها بەرزەکان و نموونە و ڕەوشت پێویستی بە ئایینی ئاسمانی نییە، بەڵکو بەشێکی بنچینەیی مرۆڤە.

١١- پێویست ناکات کە منداڵەکانمان فێری ئەو شتانە بکەین کە لە کتێبە ئاسمانییەکاندا هاتوون و بەڵگەیان لەسەر نییە، وەك بوونی هەندێك پێغەمبەری وەك پێغەمبەر ئیبراهیم کە هیچ بەڵگەیەك لە مێژوودا لەسەر ئەو کەسایەتیانە بوونی نییە.

**خـــوێنەری ئازیز...**

لەوانەیە تێبینی ئەوەت کردبێت کە ئەو بابەتانەی دوو مامۆستاکە خستوویانەتەڕوو شتێکی نوێیان تێدا نیە و، هەمان بەڵگەو ڕەخنەکانی بێباوەڕانە بەر لە سەدان ساڵ. من و خانەخوێکەمان وەڵامی دوو مامۆستاکەمان دایەوە و وەڵامەکان بە کورتی بەم شێوەیە بوو:

**یەکەم:** داننانمان بە بوونی دیزاینەرێکی زیرەك گرتنی دارەکە نییە لە ناوەڕاستەوە، بەڵکو بیرکردنەوەیەکی تەواو زانستیە و دەرەنجامێکی ڕاستەوخۆیە، چونکە زانست ئەوەی سەلماندووە کە گەردوون سەرەتایەکی هەیە و لە هەمان کاتدا بێتوانایی یاسا سروشتییەکانیشی سەلماندووە لە پێشکەشکردنی تەفسیر و لێکدانەوەی درووستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە . ئەمە هەمان ئەو واتایەیە کە زانست بە یاسای مانەوەی مادده ( مادده لە ناو ناچێت و دروست ناکرێت) و یاسای هۆکاریی (کە هەموو بە دیهێنراوێك هۆکارێکی هەیە) دەری بڕیوە.

بۆیە هیچ ڕێگایەکمان لەبەردەمدا نیە جگە لە داننان بە بوونی هێزێك کە توانای بەدیهێنانی هەبێت لە نەبوونەوە، ئەو هێزەش جگە لە خودا هیچی تر نیە.

**دووەم:** ئەو پرسانەی لەسەر دروستبونی گەردوون و ژیان خستمانەڕوو کە تا ئێستا زانست وەڵامێکی بۆیان نییە، کە پرسی زانیارین Ontological، کە پێشتر زانست بێتوانایی خۆی لە پێشکەشکردنی وەڵام لە ئێستاو ئاییندەدا سەلماندووە تەنانەت زانایان پێیان ڕاگەیاندووین کە ئەو پرسیارانە لە دەرەوەی بازنەی زانستەو پێویستە بۆ ئایین و فەلسەفە جێبهێڵدرێن.

زانایانی گەردووونناسی پێمان دەڵێن کە زانستەکەیان لە تەقینەوە گەورەکەی گەردوونەوە دەستپێدەکات، هەروەها زانایانی بایۆلۆجی پێمان دەڵێن کە سەرەتای لێکۆڵینەوەکەیان لە بوونی RNA و DNA و پرۆتینەکان دەستپێدەکات و بە دوای پێکهاتەو فرمانەکانیان دا دەگەڕێن، بەڵام چۆن ژیان بەبەر ئەوانەدا کراوە، ئەوە لە دەرەوەی بازنەی زانستە.

**سێیەم:** ئەوپەڕی ئەوەی زانست خستویەتیەڕوو و عەقڵیش قەبوڵی دەکات ئەوەیە کە ناڕێکیی بەدیهێنەر دەکرێ ڕێکخراوی Order بێنێتە بوون، وەك ڕیزبوونی هەندێك گەردیلەو تەنۆلکە لەسەر شێوەی بلوری یان هێڵی ڕێکخراو کە شەپۆلەکان لەسەر لمی کەنار دەریا دروستیان دەکەن . واتە دەکرێ هەندێك کرداری کیمیایی و فیزیایی ئاراستە بکات.

بەڵام دروستکردنی ڕێکخراوی بایۆلۆجی systems وەك DNA ی زیندەوەران، یان تەنانەت دروستکردنی ئەسپێك لەسەر دیوارێك، ئەوا لەسەروو توانای ناڕێکیی بەدیهێنەرە و، بەهۆی ئەوەی کە پێویستی بە مواسەفات و تایبەتمەندی ئاڵۆز هەیە Specification .

**چوارەم:** کاتێك دوو مامۆستاکە وەڵامی ئەو دوو پرسیارەیان دایەوە کە چۆن ناڕێکیی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون گۆڕاوە بۆ ڕێکخراوەیی، بەوەی کە دەکرێ ئەو ڕێکخراوییە لەسەرەتادا بوونی هەبووبێت بەڵام نازانین چۆن بووە.

بەڵام کاتێك لێم پرسین سەرچاوەی ئەو ڕێکخراوییە کێ بووە، بێدەنگیان هەڵبژارد.

بەهەمان شێوە کاتێك پەیڕەوی کردنی مرۆڤیان لە هەندێك بەهای بەرز و پێشەنگبوون و ڕەوشت ڕونکردەوە بەوەی کە مرۆڤ لەوەدا پێویستی بە ئاینە ئاسمانیەکان نییە، بەڵکو لە بوونی مرۆڤدا هەیە، بەڵام کاتێك دەربارەی سەرچاوەی ئەو فیترەتە پرسیارم لێکردن، بێدەنگیان هەڵبژارد.

**پێنجەم:** ئامانج لە داننان بە بوونی خودا ڕاییکردنی ژیانی زانستیی و ڕاستکردنەوەی بیردۆزە پراکتیکیەکانمان نییە (وەك دوو مامۆستاکە گوتیان)، بەڵکو داننانە بە حەقیقەتێکدا، کە لە ئێستادا زانست زۆر بەهێزەوە دەیخاتەڕوو.

پاشان گوتم، چی ڕوودەدات ئەگەر خوایەتی و پەروەردگارێتی و پەیامە ئاسمانیەکان حەقیقەت بوون و لەسەر ئەو بنەمایە داوا لە نکوڵیکاران کرا کە بێنە بەردەم حەشر و حیساب لە دوارۆژدا؟

**شەشەم:** بە دوو مامۆستاکەم گوت، لە کۆنگرەکەدا باسی ئەوەتان کرد کە ناکرێ زانست و ئایین تێکەڵ بکرێن و، پێویست ناکات هیچ کامیان نکوڵی لە بیرو باوەڕی ئەوی تر بکات، بەڵام ئێوە داواتان دەکرد کە منداڵەکانمان فێری ئەو بابەتە ئایینیانە نەکەین کە زانست و مێژوو نەیان سەلماندووە.

لە ڕاستیدا چیرۆکی پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێت) یەکێکە لەو بابەتانەی زانستی مێژوو پشتڕاستی کردۆتەوە، چونکە ئەو کەعبەیەی

ئایینە ئاسمانیەکان پێمان دەڵێن کە پێغەمبەرێك هەستاوە بە دروستکردنی ئەوەتا تا ئێستاش لەبەر چاومانە.

هەروەها لێکۆڵەرانی ڕەچەڵەك بە تەواتری سەنەدی دوورو درێژی نەوەکان ناوی تاکە تاکەی نەوەکانی ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێت) مان تا ئەم سەردەمە بۆ دەژمێرن.

پاشان گوتم، ئەگەر ئێوە داوای ئارام گرتن لە ئێمە دەکەن تا ئەوکاتەی زانست دەگاتە وەڵامێك بۆ ئەو پرسە زانستیانەی کە لە دەرەوەی بازنەی زانستدان، بۆچی ئێوە ئارام ناگرن تا مێژوونوسان دەگەنە بوونی ئەو کەسایەتیانەی کتێبە ئاسمانیەکان باسیان کردوون و تا ئێستا لە مێژوودا تۆمار نەکراون؟!.

حەوتەم: هەندێ خاڵی تر کە دوو مامۆستاکە وروژاندنیان، دەکرێ بگەڕێیتەوە بۆ باسەکانی کتێبەکەی ئەنتۆنی فلو و بەشی بەڵگەی گەردوونی لە تەرازوودا کە لە بەشی پێشەوەی کتێبەکەدا باسمان کردوون، وەك:

**گرفتی خراپە و ئازار.**

**کێ خودای بەدیهێناوە؟**

- بێتوانایمان لە هەستکردن بە زاتی خودا واتای نەبونی خودا ناگەیەنێت .

بەڵام سێ خاڵی کۆتایی چەند چەمکێکی بنەڕەتییان تێدا دەخەمەڕوو کە بۆ دوو مامۆستاکە خستمەڕوو و، دەمەوێ لەبەر گرنگیەکەی و پێویستییەکەی بابەتەکەی پێ بە کۆتا بێنم.

هەشتەم : لەوەدا لەگەڵ دوو مامۆستاکە هاوڕابووم (کە نابێت نەزانی بکەینە بەڵگە بۆ بوونی شتێکی تر) چونکە بەهانەگرتن بە توانای خودایی هەر کاتێك عەقڵ لە لێکدانەوەی بابەتێك بێ توانا بوو، دەبێتە هۆی ڕاگرتنی عەقڵ و پەککستنی و، لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی وەستانی کاروانی زانست، بۆ نموونە - مردن - ناتوانرێت بە بەڵگەی زانستی بسەلمێنرێت و ئەگەر بەوە وازی لێبهێنرایە کە ویستی خودایە،

ئەوا زانایان لە گەڕان بەدوای نەخۆشیەکان و هۆکارەکان و ڕێگاچارەکان دەوەستان و بەمەش زانستی پزیشکی هەر لە قۆناغی پێش هیپۆکرات دەمایەوە.

بەڵام لێرەدا پێویستە جیاوازی لە نێوان (نکوڵیکردنی بە زانست و نکوڵیکردنی نازانستی بکەین) بۆ ئەو قسەیەش دوو نمونەم هێناوە:

ئەگەر زانایانی شیکاریی و زانایانی فەرمانەکانی ئەندامەکانی لەش کۆبوونەوە، لە دوای گفتوگۆیەکی دوورو درێژ گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کە مرۆڤ ناتوانێت بەبێ پشت بەستن بە ئامرازێکی دەرەکی بفڕێت، بۆیە هەر مرۆڤێکمان دیت دەفڕێت ئەوا ئامرازێکی یاریدەدەری هەیە وەك فڕۆکە یانە پەرەشووت یان ئەوەتا ئامێرێکی بەکار هێناوە کە هێزی کێشکردنی زەوی نەهێڵێت.

ئایا لەو کاتەدا دەکرێ بەو زانایانە بڵێین کە دەکرێ مرۆڤ توانای فڕینی هەبێت ئێوە نایزانن و، ناکرێ ئەو نەزانییەتان بکەنە بەڵگە بۆ پشتبەستنی مرۆڤ بە ئامرازێکی دەرەکی (ئەمە نکوڵیکردنێکی نەزانانە نییە، بەڵکو نکوڵیکردنی بە زانست)ە.

بە هەمان شێوە ئەگەر لە ڕۆژنامەکاندا خوێندمانەوە کە یەکێك لەو منداڵانەی توشی بەرزترین پلەی دواکەوتوویی مێشك بووەو ڕێژەی زیرەکییەکەی (I.Q) ٢٥ پلەیە و، توانیویەتی بگاتە بیردۆزی یەکگرتنی گەورە (Grand Unification Theory) (کە بیردۆزەکە هەرچوار هێزە سرووشتیەکەی گەردوون پێکەوە دەبەستێتەوە)[1] کە ئەنیشتاین مرد نەیتوانی پێی بگات، ئایا دەکرێ بڵێین لەوانەیە ئەو منداڵە (کە ناتوانێت کاری ڕۆژانەی خۆی ڕاپەڕێنێت) توانیویەتی بە ڕێگایەك بگات بەو بیردۆزە بەڵام ئێمە نایزانین؟ یان ئەوەتا بە دڵنیاییەوە دەڵێن کە ئەم هەواڵە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە؟ بۆیە جارێکی تر دەیڵێمەوە کە نکوڵیکردن بە نەزانی جیاوازە لە نکوڵیکردن بە زانینەوە.

---

(١) گەردیلەیی بەهێز، هێزی گەردیلەیی بێ هێز، هێزی کێشکردن، هێزی کارۆموگناتیسی.

ئێمە بە دڵنیاییەوە دەزانین کە سرووشت عەقڵێکی وا بلیمەتی نییە کە بتوانێت شتی وا بێنێتە بوون کە زیرەکترین عەقڵی مرۆڤایەتی تەنانەت توانای تێگەیشتنی نەبێت، وەك بەدیهێنان لە نەبوونەوەو دروستکردنی ژیان و عەقڵ، بۆیە ئایا ڕازی نەبوون بەوەی کە سرووشت بەدیهێنەر بێت دەچێتە خانەی نەزانینمان بەتواناکانی سرووشت یان ئەوەتا نکوڵیکردنێکی بە زانستەو دەزانین تواناکانی سرووشت چەندەو، ئەمەش ناچارمان دەکات کە دان بە بوونی خودای بەدیهێنەر و بەڕێوەبەری بوونەوەر دابنێین.

گەورە زانای سرووشتی ئەمریکی "جۆرج ئێرڵ دیڤیس" ئەو بابەتەی بە کورتی خستۆتەڕوو، کاتێك دەڵێت: ( ئەگەر گەردوون توانای ئەوەی هەبێت خۆی دروست بکات، کەواتە خاسیەتی خوایەتی بەدیهێنەری هەیە، لەو حاڵەتەشدا باوەڕمان وا دەبێت کە گەردوون خودایە.. خودایەکی غەیبی و ماددی لە هەمان کاتدا!!! من ئەوەم پێباشترە باوەڕم بەو خودایە هەبێت کە جیهانی ماددی دروست کردوەو خۆی بەشێك نیە لە گەردوون، بەڵکو خاوەن و بەڕێوەبەر و هەڵسوڕێنەریەتی، من ئەوەم پێباشترە لە پەنا بردنە بەر ئەفسانەو قسەی بێ مانا).

نۆیەم : بە دوو مامۆستاکەم گوت، گرنگترین هۆکار کە ئێوەی توشی ئەو نارونیە کردووە، بریتیە لە تێکەڵکردنی جیهانی ماددی هەست پێکراو و جیهانی غەیبی نادیار.

لە ڕاستیدا باوەڕبوون بە پرسە غەیبییەکان (وەك خوایەتی) ڕێبازێکی تەواو جیاوازی هەیە لە ڕێبازی ڕاستییە زانستیەکان.

چونکە زانست بەڵگە Proof پێشکەش دەکات کە لە ڕێی ڕێبازی پراکتیکی پێی گەیشتووە، یان لە ڕێی ڕێبازی عەقڵی پێی گەیشتووە کە بیرکاری بەشێکی گرنگیەتی.

هەرچی بابەتە غەیبییەکانە ئەوا نموونە Evidences یان لەسەر دێنینەوە و، هەرچەند مرۆڤ بیریکاتەوە و تێبفکرێ باوەڕی قوڵتر دەبێتەوە، بەهۆی زیادبوونی واتا نموونەییەکان تا ئەو ئاستەی لە دڵنیاییدا دەگەنە بەڵگەی زانستی، بەڵام

ناگەنە ئەو ئاستە، چونکە ئەگەر پێی بگات باوەڕبوون بە غەیب نامێنێت کە بنەمای ئایینە ئاسمانیەکانە.

دەیەم: دوو مامۆستاکە گوتیان : ئەو بەڵگانەی لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر پێشکەشت کردن بە بەڵگەی نەرێنی هەژمار دەکرێن، کە لەسەر ئەوە دامەزراوە بە دوور بزانرێت سرووشت بەدیهێنەر بێت، واتە ئەو خودایەی باسی دەکەیت بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکانە[1] بەڵام ئێمە بەڵگەی ئەرێنیمان دەوێت، چونکە بیروباوەڕ پێویستە لەسەر بەڵگەی دڵنیایی بنیات بنرێت نەك لەسەر نەزانیی. هەر بەڵگەیەکم پێشکەش دەکردن دەیانگوت ئەمە بەڵگەیەکی نەرێنیە و ئێمە بەڵگەی ئەرێنیمان دەوێت!

پێم گوتن: ئێوەن بەم قسەیەتان زانستتان کردۆتە خوای پڕکردنەوەی بۆشاییەکان! چونکە هەر کاتێك ماددیگەراکان لە لێکدانەوەی بابەتێك بێ توانا بوون، دەڵێن زانست لە ئایندەدا پێی دەگات.

پاشان گوتم: پێمان بڵێن چ جۆرە بەڵگەیەك بە لای ئێوەوە ئەرێنیە، با ئێمەش بۆتانی بخەینەڕوو. بێباوەڕان بەدرێژایی سەردەمەکان بەو موعجیزە ماددیە ئەرێنیانە وازیان نەهێناوە کە پێغەمبەرەکانیان بۆیان هێناون، نە بەبەڵگە عەقڵییە لۆژیکییەکانیش. ئەوان مەبەستیان لە بەڵگەی ئەرێنی ئەوەیە کە هەستەوەرەکانیان هەست بە خودا بکەن وەك ئەوەی گەلی موسا داوایان لە پێغەمبەرەکەیان کرد و لە قورئانی پیرۆزیشدا تۆمار کراوە:

﴿لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةً﴾ البقرە: ٥٥

واتە[2]: ئیمان ناهێنین بەوەی کە خودا قسەت لەگەڵ ئەکات تا خودا بە ئاشکراو بەرەوڕوو نەبینین.

---

(١) : خودای پڕکردنەوەی بۆشاییەکان God of the Gaps دەستەواژەیەکە بێباوەڕان بەکاری دەهێنن، بە واتای ئەوەی کە ئێمە هەرکاتێك نەمانتوانی لێکدانەوە بۆ شتێك بکەین کە زانست پێی نەگەیشتبێت، خێرا پەنا دەبەینە بەر ئەوەی بڵێین ئەمە کاری خوایە

(٢) راڤەی ئایەتەکان لە تەفسیری (نامی) مامۆستا مەلا عبدالکریمی مودەڕیس (رەحمەتی خوای لێبێت) وەرگیراون.

یان وەکو ﴿ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةً ﴾ النساء: ١٥٣

واتا: خودامان بە ئاشكرا نیشان بدە.

من وامدەزانی تا ئەم نزیكانەش، كە بێباوەڕانی سەردەم لە كۆمەڵگا موسڵمانەكاندا شەرم دەكەن ئەم جۆرە قسانە بكەن، بەڵام دوو مامۆستاكە لەوەش خراپتریان دەگوت.

خۆزگە بێباوەڕان لە وتەی زانای سرووشتیی جۆرج دیڤیس دەگەیشتن كە پێشتریش باسمان كرد كە دەڵێت خودا لە گەردوون جیاوازەو بە هەستەوەركانمان هەستی پێناكەین، خودا:

﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ ﴾ الشورى: ١١، واتە : هیچ شتێ لە خودا ناچێت.

لەبەر ئەوەخودا زاتی پاكی خۆی، لەوەی هەستەوەرەكان هەستی پێ بكرێت پاك دەكاتەوە و دەفەرموێت :

﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ الأنعام: ١٠٣

واتا : بە بینایی هەستی پێناكرێت، بەڵام ئاگای لە هەموو بیناییەكانە.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ ﴾ الصافات: ١٨٠

واتا: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرزت لەو سیفەتانەی دەیدەنە پاڵ.

خودا ئەو ڕێبازەی دیاری كردوە كە بە هۆیەوە دەتوانین هەست بە بوون و توانای بكەین، ڕێبازی (بیركردنەوە لە بەڵگەكانی نەك بیركردنەوە لە هەست و بینینی ڕاستەوخۆ).

﴿ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ ﴾ فصلت: ٥٣

واتا: بەڵگەكانمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆكاندا و لە دەروونیاندا، تا ئەوكاتەی بۆیان دەردەكەوێت كە ئەم ڕێبازە حەقە.

واتا گەردوون و نیشانەکانی و زیندەوەران و نیشانەکانیان کتێبی بینراوی خودان، هەروەك چۆن قورئانی پیرۆز و بەڵگەکانی کتێبی خوێنراوی خودایە.

ئەو بەڵگانەی خوودی ئێمە و بوونی دەوروبەرمان پڕن لێی، بەڵگەی زیندوون تا ڕۆژی قیامەت:

﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ﴾ لقمان: ٢٧ - ٢٨

واتا: ئەگەر هەرچی دار و درەخت لە زەویدا هەیە هەمووی قەڵەم بێ و دەریایش هەمووی مەرەکەب بێ و حەوت دەریا لە دوایەوە یارمەتی بدا و بچێتە سەری، هێشتا وتەکانی خوا تەواو نابن بەو قەڵەم و مەرەکەبانە بنوسرێن. بەراستی خوا خاوەن عیززەت و خاوەن حیکمەتە.

﴿ قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ﴾ الكهف: ١٠٩

واتا: تۆ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئەگەر دەریا مەرەکەب بێ بۆ نوسینی کەلیمەکانی زانیاری و دەسەڵات و توانای خودا، دەریا تەواو ئەبێ پێش ئەوەی کەلیمەکانی خودا تەواو ببن، هەرچەندە ئەوەندەی ئەو دەریایە دەریای تر بێنن بۆ یارمەتیدانی، چونکە کەلیمەی خودا سنوری نیە و تەواو نابێ و وەك خوودی خۆی قەدیمە لە ئەزەلەوە بووە و تا ئەبەد ئەمێنێ، بەڵام دەریا سنوردارە.

پەروەردگار بەمە وازی لێمان نەهێناوە، چونکە هەموو مرۆڤەکان وەك ئەنتۆنی فلو نین، کە لە ڕێی (گەشتی عەقڵ)ێك کە زیاتر لە شەست ساڵی خایاند بگەن بە بوونی خودا، لەبەر ئەوە خودا لە ڕێی پێغەمبەرانەوە گفتوگۆ لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکات:

﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴾ فاطر: ٢٤

واتا: هیچ گەلێك نیە ئاگادارکەرەوە (پێغەمبەر)ێکی بۆ نەهاتبێت.

بەمەش سرووش (وەحی) دەبێتە یارمەتیدەری عەقڵ بۆ بیرخستنەوەی مرۆڤ بە بوونی خودا، کە پێشتر لە فیترەتیدا چەسپاندوویەتی:

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ﴾ الأعراف: ١٧٢

واتا: ئەی پێغەمبەر! بیری ئەوە بکەرەوە کە خودای گەورە لە پێش لە دایکبوونی هەر ئینسانێ لەو کاتەدا کە تۆو بووە لە پشتی باوکیدا ئەو تۆوەی هۆشیار کردووەتەوەو قسەی لەگەڵ کردووە: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش وتویانە: بەڵێ پەروەردگاری ئێمەی و، کردوونی بە شاهید لەسەر خۆیان بۆ ئەم پەیمانە نەبادا لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن ئێمە ئاگامان لەو پەیمانە نەبووە. یا لە عالەمی ئەرواحدا قسەی لەگەڵ کردوون و پەیمانی ئیعتیراف بە خودایەتی خۆی لێ وەرگرتوون و کردوونی بە شاهید لەسەر خۆیان.

هەروەها وەك چۆن خودا لەسەر فیترەتی باوەڕبوون بە خودای تاك و تەنها درووستکردووە، بەهەمان شێوە لەسەر فیترەتی دامەزراوەی ڕەوشتیش درووستی کردووە و، چاکە و خراپەی لەبەردەم دەروونی مرۆڤایەتی ڕۆشن کردۆتەوە.

﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا﴾ الشمس: ٧ - ٨

واتا: سوێند بە نەفسی ئادەمیزاد و بەو خوایەی وای دروست کردووە کە ئامادەی کردووە بۆ هەموو سیفەت و کردارەکانی . جا نیشانی داوە لە فەرمانی خوا دەرچوونی کامەیەو لە خواترسانی کامەیە.

هەروەها یاسای ڕزگاربوونیشی لە دەروونداچەسپاندووە:

﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠﴾ الشمس: ٩ - ١٠

واتا: سوێند بە هەموو ئەوانە، ئەو کەسەی نەفسی پاك بکاتەوە لە سیفاتی خراپ و ناشیرین ڕزگار ئەبێ و! ئەوەی پەردەی نەفامی و نەزانی و بێ شەرمیی بدا بەسەر نائومێد و بێ بەش ئەبێ.

من و خانەخوێکەمان خواردنەکەمان بە وەڵامدانەوەی دوو مامۆستا بێباوەڕەکە کۆتایی پێهێنا، هەروەك چۆن ڕێبازی ئیسلامبمان لە مامەڵە لەگەڵ پرسەکانی خوایەتی و ئایین و دامەزراوەی ڕەوشتی خستەڕوو.

وادیار بوو وەڵامەکانمان بە تەواوی لە لای ئەوان نوێ بوون، بە ڕاشکاوی گوتیان کە چاوەڕێی ئەو وردییەو زانستی و فەلسەفی و ئاییینییەیان نەدەکرد، چونکە بە وەڵامی ڕوکەشی دیندارەکان ڕاهاتبوون! ئەمەش وای لێکردبوون زیاتر دەست بە بیروڕاکانیانەوە بگرن.

من ناڵێم هەردووکیان لە بێباوەڕی هەڵگەڕانەوە، چونکە خۆبەزلزانی بەئاسانی خۆی نادات بە دەستەوە، بەڵام دەتوانم بڵێم کە توانیم گۆمەکە بشلەقێنم.

دوای ئەم ژەمە گەرم و گوڕە، گەڕامەوە ئوتێل، ئەو شەوە خەو نەچووە چاوم، دەمپرسی:

ئاخۆ چەندانی وەك ئەم دوو بێباوەڕە لە ناوماندا دەژین؟ خۆزگە لەو کەسانە بوونایە کە بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێن. خۆزگە لە خاوەن بەڵگە عەقڵیەکان دەبوون.

خۆزگە ئەوەی بانگەشەیان بۆ دەکرد لەوەی کە زانست بە ڕێی خۆی، خۆشیان و ئایین بە ڕێی خۆی جێبەجێیان دەکرد . خۆزگە لە گاڵتە کردن دەوەستان.

تۆ بڵێی ئەو لۆژیکە بێ بنەمایە چەند گەنج لە خشتە ببات؟ ئایا گەنجان پێویستیان بە قەڵایەکی عەقڵی نییە کە بەرگری باوەڕیان بەهێز بکات؟

بە دەم شنەبای بەیانی ڕۆژم کردەوە پڕبووم لە هیممەت کە گەشتی عەقڵ تەواو بکەم.

## توندڕەویی زانست تۆمەتبار دەکات

**خـوێنەری بەڕێز...**

دوای ئەوەی بە هیممەت و خوێنگەرمییەوە دەستم کردەوە بە تەواو کردنی گەشتی عەقڵ و، کاتێك کۆتایی گەشتەکە نزیك بووەوە، کۆسپێکی تری نوێ هاتە بەردەمم کە لە وانی دی جیاواز بوو. وەك وێناکردنی ئەوە نەبوو کە ئێمە باوەڕدارین و باوەڕمان (تەواوی تەواو و بەرزی بەرزە)و، وەك کۆسپی بێباوەڕی بارگاوی بە زانستیش نەبوو، بەڵکو ئەو کۆسپە بۆتە هۆی جڵەوگیرکردنی ژیارستانیەتی ئیسلامی بەدرێژایی چەند سەدەی رابردوو، تا ئێستاش!! ئەویش بە تەواوی کۆسپی پەراوێزخستنی زانست و عەقڵە، هەروەك چۆن لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەوروپادا ڕوویدا.

لە کاتێکدا کە خەریکی گفتوگۆکردنی بەشە تایبەتیەکانی پەیوەندی نێوان زانست و بایۆلۆجیا بووم لەگەڵ هاوڕێیەکم کە تێڕوانینێکی ئایینی تایبەتی هەیەو، خاوەن ڕۆشنبیرییەکی زانستی فراوان بوو، هاوڕێکەم گۆڕا بۆ گەردەلوولێکی وێرانکەر و هەموو ئەو چەمکانەی بەشەکانی ئایین و بایۆلۆجیا خستومەتەڕوو لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵیکێشان!!

چەقی گەردەلوولی هاوڕێکەم ئەوەبوو کە هەریەکە لە لاشەو رۆح و بوونێکی جیاواز لەوی دیکەیان هەیە و، بەمەش مەحاڵە وێنای پەیوەندییەك بکرێت لە نێوان لاشەو هەستە رۆحییەکان. بۆیە ئەو چەمکە زانستییانەی لەو دوو باسەدا خستوومەتەڕوو ئاواتی بێباوەڕانە، چونکە ئەوە دەسەلمێنێت کە هەستەکان لە لاشەوە دەردەچن و بەمەش جیهانی غەیب (خودا - رۆح) بە تەواوی دەسڕێنەوە.

گفتوگۆ گەرم و گوڕەکەمان زۆری خایاند، بە دیداری ڕاستەوخۆ، بە تەلەفۆن و نامە ناردن. خوێنەری ئازیز بێگومان بە ئاسەی بزانی گفتوگۆکەمان چۆن بووە و چۆن کۆتایی هاتووە.

هاوڕێکەم هێرشەکەی دەستپێکرد و گووتی:

گومان لەوە دانیە کە مەحاڵە وێنای پەیوەندییەکی هۆکاری Causal لە نێوان بابەتە لاشەیی و ڕۆحانیەکاندا بکرێت .

ئەگەر چی پەیوەندیەکی کارلێکی Interaction هەیە لە نێوان خوودی مرۆڤایەتی[١] و لاشە، کە لە ڕێیەوە خوودی مرۆڤایەتی هەموو زانیارییە هاتووەکان Input لە ڕوناکی و دەنگ و کیمیا (بۆن) و میکانیك (بەرکەوتن)... هتد وەردەگرێت و لەگەڵیدا کارلێك دەکات، بەڵام بانگەشەکردن بۆ ئەوەی کە ڕووحانیەتەکان / هەستیەکان سەرچاوەکەیان لاشەیە، ئەوا تەنیا قسەی بێ بنەمایە تەنانەت مەحاڵە بە خەیاڵیش بیری لێبکرێتەوە.

هەڵقوڵانی هەستە ڕوحیەکانی مرۆڤ پێویستی بە ویست و هیممەت و پێداگری و کۆششی دەروونی هەیە، سەرەڕای زانینی سیفاتەکانی خودا و، پێویستیەکانی پەروەردگارێتی و بەندایەتی و، هیچ یەك لە کیمیای سیستەمی جینات و کیمیای کارەبایی مێشك ناتوانن بەو کارە هەڵبستن.

بەڵکو سەلمێنراوە کە بۆشاییەکی زۆر گەورە هەیە لە نێوان کیمیای (دی ئێن ئەی) و پێکهاتەی ماددی مێشك و سیفەتە بەرزەکانی مرۆڤ و، مەحاڵە پردێکی پەیوەندی لە نێوانیاندا هەبێت Bridging the gap.

بە هاوڕێکەمم گووت:

لە قسەکانتدا چەند دەستەواژەیەکی یەکلاکەرەوەت بەکارهێنا، وەك(سەلمێنراوە) (مەحاڵە)، سەرەڕای نەبوونی هیچ بەڵگەیەکی زانستی یان ئایینی لە سەر سەلماندن یان مەحاڵی.

تۆ لە چەند زانیارییەکی دانپێنراودا دەستت پێکرد کە پێویستی بە بەڵگە هەیە و، لە ڕێیانەوە هێرشت کردە سەر زانست و زانایان (هەروەك پاش کەمێکی تر دەیبینین).

---

(١) زانایانی دەروونناسی دەستەواژەی(خوودی مرۆڤایەتی) وەك هاوواتای (ڕۆح و نەفس وعەقڵ) بە کاردێنن کە لە ئایینە ئاسمانیەکاندا بەکاردێن.

هەروەها لەو زانیاریانەی لە باسی پێنجەم و شەشەم و حەوتەمی کتێبەکەدا خستومانەتە ڕوو لە قسەی زانایان ئەوەی لێناخوێنرێتەوە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لاشە سەرچاوەی ڕۆحانییەتەکان / هەستەکان بێت، هەموو ئەوەی لەوان وەرمانگرتووە بریتییە لە گەڕان بە دوای پەیوەندی کاردانەوەیی Interaction لە نێوان خوودی مرۆڤایەتی و لاشە، ئەو پەیوەندیەی لە ڕەخنەکەتدا دانت بە بوونیدا ناو، پاشان گەڕایەوە تا بە دڵنیاییەوە بڵێی کە هیچ پەیوەندییەکیان لە نێوانیاندا نییە!

لەبەر ئەوە خاڵێکی جەوهەری هەیە (کە لەوانەیە تەوەرەی هەموو ناکۆکییەکان بێت) و پێویستە ڕوونی بکەینەوە، ئەویش پێگەی لاشەیە بۆ مرۆڤ، لە دیدی ئیسلامدا:

ئایا لاشە شتێکی پیس و پڕ کەم و کوڕییە، کە مرۆڤ ناتوانێت بە بەرزی ڕۆحیی بگات تەنیا بە ریسواکردن و بەکەم سەیرکردنی لاشە نەبێت، یان ئەوەتا بریتیە لە ئاژەڵی سواریی ڕۆح (وەك ئیمامی غەزالی فەرموویەتی)، یان لەوەش زیاتر؟ لاشە ئەم سێ ئاستەی هەیە و پێویستە لە نێوانیاندا یەکێك هەڵبژێرین.

گومان لەوەدا نیە کە زۆر لە دیندارەکان لەگەڵ چەمکی یەکەم و دووەمدان، بەمەش پێویستە ئەو تێگەیشتنەیان راست بکرێتەوە و لە ڕەگ و ڕیشەوە چاك بکرێتەوە، بۆ ئەوەش بیریان دەخەینەوە کە:

١- گەشتی میعراجی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە لاشەو روح بووە.

ئەوەش بە تەنیاو بۆ دەرخستنی توانای خودایی نەبووە، نە بۆ دەرخستنی پێگەی پێغەمبەریش،بەڵکو من وایدەبینم کە ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە حەقیقەتی مرۆڤ لاشەو روح پێکەوەیەو، دەکرێ لاشەش بۆ پێگەکانی ڕۆح بەرز بێتەوەو بچێتە ناو جیهانە نا ماددییەکانییەوە.

٢- نابێت بەوە وەڵامی خاڵی پێشوو بدەینەوە کە ئەمە تایبەتمەندی پێغەمبەری خوایە، چونکە هەر یەکێکمان لە ڕێی سوجدەبردنی لاشەو ڕۆح / نەفس لە

نوێژدا ئەو میعراجە دەکەین: ﴿ وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب ۩ ﴾ العلق: ١٩، واتا: سوجدە ببەو نزیك ببەوە.

٣- کاتێك خودا ویستی پەیمانی (ألستُ بربکم) (ئایا من پەروەردگارتان نیم) لە بەنی ئادەم وەربگرێت، لە ڕێی لاشەوە گفتوگۆی لەگەڵ ڕۆحەکان/ نەفسەکان کرد، دوای ئەوەی هەموو مرۆڤایەتی لەسەر شێوەی لاشەی زۆر ورد لە پشتی ئادەم دەرهێناو پەیمانی لێوەرگرتن، هەروەها دەکرێ ئایەتی پەیمان بەوەش تەفسیر بکرێت کە پەیمانەکە لە سپێرمی هەر مرۆڤێك لەسەردەمی خۆیدا دانراوە . ئەمە واتای ئەوەیە کە فیترەت لە لاشەدا دانراوە، سەرەڕای ئەوەی کە ڕووی گفتوگۆ و پەیمانەکە لە ڕۆح / نەفس بووە.

٤- سەرنجی فەرموودەی خوا بدە لە سورەتی (النحل) کە دەفەرموێت:

﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾ النحل: ٧٨

واتا: خودای گەورە ئێوەی لە سکی دایکتان دەرکردوە لە حاڵێکدا کە هیچتان نەدەزانی. هەروەها هێزی بیستن و بینین و دڵی بۆ دروست کردون بەڵکو شوکرانەبژێریی خودا بکەن.

مرۆڤ بە لاشەو نەفس و ڕۆحی دێتە دنیا و هیچ نازانێت، پاشان دەستدەکات بە وەرگرتنی زانستەکان ئەمەش لە ڕێی هەستەوەرەکانی لاشە، تەنانەت دەربارەی جیهانی غەیبیش شت فێر دەبین:

﴿ وَلِلَّهِ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَآ أَمۡرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمۡحِ ٱلۡبَصَرِ أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ النحل: ٧٧

واتا: هەرچی پەنامەکییەکانی ئاسمانەکان و زەوی هەیە لای خودایەو پێی دەزانێ و ڕوودانی ڕۆژی قیامەت لای خودا وەك چاو بەیەکدادانێك یا لەوەش کەمترە. بەڕاستی خودا توانایە و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

﴿ أَلَمْ يَرَوْا إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ النحل: ٧٩

واتا: ئایا سەیری پەلەوەر ناکەن لە بۆشایی ئاسماندا ڕام کراون و کەس بە ئاسمانەوە ڕاگیریان ناکات خودا نەبێ. لەم دەسەڵاتەدا زۆر نیشانەی گەورەیی و توانایی خودا هەیە بۆ قەومێ کە باوەڕیان بە خودا هەبێ.

نەك تەنیا ئەوە، بەڵکو مرۆڤ لە ڕێی هەستەوەرەکانی لاشەی ئەو پەیمانەی بیر دێتەوە کە خودا لەگەڵ ڕۆح / نەفسی ئەودا بەستویەتی.

٥- لە هەموو پەرستشەکان (نوێژو ڕۆژوو و زەکات و حەج) هەر یەکە لە جەستەو ڕۆح / نەفس بە ڕۆڵی خۆیان هەڵدەستن و، لە ڕووی شەرعییەوە پەرستش درووستە، ئەگەر بە لاشە ئەنجامی بدەین ئەگەر ڕوح و نەفسیش کەمتەرخەم بن، بەڵام بە پێچەوانەوە نابێت.

٦- گومان لەوەدا نیە کە سوودی نێوان نەفس و لاشە سوودێکی ئاڵوگۆڕە ونەفس بە هەوڵ و کۆششێك بەرز دەبێتەوە کە لاشە تێیدا بەشداری دەکات، وەك شەو نوێژ و ڕۆژوو. هەروەها بەرزبوونەوەی نەفس سوودی زۆری بۆ لاشە هەیە، لە ڕێی بەرزکردنەوەی ئاستی بەرگری لەش و کەم کردنەوەی ڕێژەی توشبوون بە جەڵتەی دڵ و مێشك و دواخستنی پیری.

٧- دوای مردنی مرۆڤ و جیابونەوەی رۆح، شەریعەت بۆمان دیاریدەکات کە چۆن مامەڵەی ڕێز لەگەڵ لاشەدا بکەین و بۆ ژیانی ئایندە ئامادەی بکەین، دەشورێت تا لەسەر دەستنوێژ بێت و، لە کفنێکی سپی پاك دەپێچرێت و نوێژی لەسەر دەکرێت و، لە ئامادەبوونی لاشەدا دوعای رەحمەتی بۆ دەکرێت و، رووەو قیبلە دەنێژرێت.

٨- لە کاتی زیندووبوونەوەدا، مرۆڤ بە رۆح و نەفس و لاشەوە حەشر دەکرێت و، لەسەر تاوانەکانی نەفس و ئەندامەکانی لەش لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت و، وەك بوونێکی یەکگرتوو بە پاداشت یان سزا حوکم دەدرێت.

ئەو هەشت خاڵەو، چەندانی دیش، جەخت لەسەر پەیوەندی نێوان لاشەو رۆح دەکەنەوە و، نەك بە تەنیا وەك پەیوەندیەکی هۆکاریی، بەڵکو لەبەر ئەوەی لاشە رووکاری رۆحە، کە هیچ شتێکی دەربارە نازانین:

﴿ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ الإسراء: ٨٥

واتا: ڕوح لەو مەخلوقانەیە کە بە ئەمرو فەرمانی خودای من پەیدابوون و، هەر خودا خۆی ئەزانێ چییە، ئێوە ئەندازەیێکی کەم نەبێ زانیاریتان پێنەدراوە، دیارە عەقڵی ماددیی کەمو کورِی ئێوە پەی بە شتی نا مەحدوود ناباو نایزانێ.

تا ئەو ئاستەی کە دەتوانین بڵێین: هەرچی بەسەر رۆحدا دێت لە لاشەدا دەردەکەوێت [...لِتَقۡرَأَهُۥ...].

﴿ إِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ يَخِرُّونَۤ لِلۡأَذۡقَانِۤ سُجَّدٗا ﴾ الإسراء: ١٠٧

واتا: کاتێ کە قورئانیان بەسەردا بخوێنرێتەوە بە ڕوودا ئەکەون و سوجدە بۆ خوا دەبەن.

﴿ وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ وَيَزِيدُهُمۡ خُشُوعٗا ۩ ﴾ الإسراء: ١٠٩

واتا: بە ڕوودا دەکەون و دەگرین و بیستنی قورئان ترسیان لە خودا زیاد دەکات.

پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگارم!

هەروەها گوتم...

ئەگەر چی قورئانی پیرۆزیش لە هەندێك شوێندا بە شێوەی جیا جیا باسی لاشەو رۆح و نەفس دەکات:

﴿ إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ ﴾ ص: ٧١

واتا: خوای تۆ بە فریشتەکانی وت: من ئینسانێ دروست ئەکەم لە گڵ.

﴿ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴾ الشمس: ٧

واتا: سوێند بە نەفسی ئادەمیزاد و بەو خوایەی وای دروست کردووە کە ئامادەی کردووە بۆ هەموو سیفەت و کردارەکانی.

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ﴾ الإسراء: ٨٥

واتا: لە بارەی ڕۆحەوە لێت ئەپرسن کە چی یە؟

بەڵام خودا کاتێك باسی مرۆڤ دەکات یان گفتوگۆی لەگەڵدا دەکات، وەك بوونەوەرێکی تەواوی یەکگرتوو تەماشای دەکات، هەر لە ڕۆژی پەیمانەکە تا ئەو ڕۆژەی بە دیداری خودا دەگەین و بە نەمری لە ژیانەکەی تردا دەژین:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَـٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَـٰقِيهِ ﴾ الانشقاق: ٦

واتا: تۆ ئەی ئادەمیزاد لەو ڕۆژەدا بە پەلە ئەڕۆی بۆ لای خوای خۆت و پێی ئەگەیت.

﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِى كَبَدٍ ﴾ البلد: ٤

واتا: ئێمە بەڕاستی، ئادەمیزادمان لە هەموو ژیانی لە ماندویەتی و ئەرك دروستکردووە.

جیاکردنەوەی پێکهاتەکانی مرۆڤ لە یەکترو، دانانی هەندێکیان بە جەوهەری (رۆح) هەندێکیان بە لاوەکی(لاشە) و هەندێکیان بە هۆکاری پێوەندی نێوان دووەکەی تر (نەفس)، ئەمەیە سەرچاوەی تێکەڵ بوونەکە. لەبەر ئەوە پێویستە دیدو بۆچوونمان دەربارەی مرۆڤ دووبارە دابیرێژینەوەو وەك بوونێکی یەکگرتوو سەیری بکەین. ئەگەر لەوە تێبگەین دەتوانین وێنای پەیوەندی نێوان بایۆلۆجیای لاشەو رۆحانیەت و هەست و ڕەفتارەکان بە ئاسایی بکەین.

گومان لەوە دانیە کە ئیسلام لەو دیدە تەواو و گشتگیرەیدا تاکە، چونکە ئەو یەهودییەت و مەسیحییەتەی لەبەر دەستمان دایە، بە سوکی سەیری لاشەو ئارەزوەکانی دەکەن و، وایدەبینن کە ڕزگار بوون لە ژیانەکەی تر بۆ ڕۆح بەدی نایەت مەگەر لاشەی تاوانبار بە لاشەیەکی بێتاوان نەگۆڕدرێتەوە.

هەروەها ئایینی هیندۆسی و ئایینەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور وایدەبینن کە حەقیقەتی مرۆڤ تەنیا رۆحەو بەختەوەری گەورە ڕزگاربوونی ڕۆحە لە لاشەی

پیس و پێوەندی کردنیەتی بە ڕۆحی گشتی، هەروەك چۆن دڵۆپی ئاو دەگەڕێتەوە بۆ دەریا.

هاوڕێکەم گووتی:

لە باسی حەوتەم (حەقیقەتی خوودی مرۆڤایەتی) باسی ئەوەت کردووە کە زانا و فەیلەسوفە باوەڕدارەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەو زمانە کارۆ کیمیاییەی خانەکانی مێشك بە هۆیەوە لەگەڵ یەکتردا پەیوەندی دەکەن، ناتوانن هەستە مرۆڤایەتی و ڕۆحییەکان و ڕەفتارەکانمان بۆ بێنێتە بوون، لەوەشەوە ئەوەیان هەڵێنجاوە کە پێویستە هەست و ڕەفتار سەرچاوەیەکی نامادديان هەبێت، چۆن بەوە ڕازی دەبین کە چەند دڵۆپێکی ماددەی کیمیایی وەك (سیرۆتۆنین یان دۆپامین) بەرپرس بن لە هەستە ڕۆحییەکانمان، تەنیا لەبەر ئەوەی چەند بازنەیەکی کارەباییان لە مێشکدا چالاك کردووە؟

وەڵامی هاوڕێکەمم داوە گوتم :

لەوەدا لەگەڵت هاوڕام کە گوێزەرەوە کیمیاییەکان و بازنە کارۆکیمیاییەکانی مێشك سەرچاوەی بەرزی هەست و ڕەفتارەکان نین.

لە ڕاستیدا لێکۆڵینەوەی زانستی بۆ پەیوەندی نێوان بایۆلۆجیاو دینداریی، واتای گەڕان نییە بە دوای سەرچاوەی بەرز (خوودی مرۆڤایەتی)، چونکە ئەوە ڕۆڵی زانستی دەروونناسی و دینداریيە، بەڵام ئێمە بە دوای خاڵی پەیوەندی نێوان خوودی مرۆڤایەتی ( نەفس/ ڕۆح) و لاشەدا دەگەڕێین، واتە هەستە شاراوەکانی ناو خود پێویستە لە ڕێی مێشکەوە وەربگێڕدرێن تا مرۆڤ هەستیان پێبکات.

ئەمە لەو نەخۆشانەدا هەست پێدەکەین کە بە هۆکارێك لە هۆکارەکان تووشی لەهۆشچوون دەبن و، کاتێك دێنەوە هۆش خۆیان نازانن هەستەوەرەکانیان لە کاتی لە هۆشچووندا چیان کردووە.

هاوڕێکەم گوتی:

ئەگەر ئەگەرێك بۆ بوونی دامەزراوەیەكی جینات Genetic Networks لە لای هەندێك مرۆڤ هەبێت، كە لاشەیان وا لێدەكات توانای پەیوەندی كردنی هەبێت لەگەڵ ڕۆحیان، ئەوا تەنیا لە لای پێغەمبەران و ئەولیای خوا بەم شێوەیەیە، چونكە لاشەی ئەوان لە لاشەی خەڵكی ئاسایی جیاوازە! ئەوان ئامادەكراون تا لەگەڵ جیهانی غەیبدا لە پەیوەندی دابن.

بە هاوڕێكەمم گوت:

گومان لەوەدا نییە كە لاشەی پێغەمبەران و ئەولیاكان توانایەكی بەرزتری هەیە لە پەیوەندیكردن بە جیهانی غەیب، لێكۆڵینەوە زانستیەكان كە لەسەر راهیب و خوا پەرستەكان ئەنجام دراون ئەمەیان سەلماندووە، هەروەك چۆن كتێبەكانی سیرەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) باسی ئەوەیان كردووە كە وەحی (پەیوەندی خوودی مرۆڤایەتی بە جیهانی غەیب) چەند لەسەر لاشەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قورس بووە.

بەڵام ئەوە واتای ئەوە ناگەیەنێت كە پەیوەندی لە نێوان (خوودی مرۆڤایەتی نا ماددی) و نێوان لاشەی مرۆڤایەتی لە لای هەموو كەسێك نەبێت.

هاوڕێكەم ڕەخنەی گرت و گوتی:

بۆچی دەبێت بە دوای پەیوەندی نێوان بایۆلۆجیایی ماددی و هەست و رۆحانییەتەكاندا بگەڕێین؟! ئایا خودا بە تەنیا بكەری حەقیقی پشت هۆكارەكان نییە؟! ئایا زانایانی ئوممەت هەموویان كۆڕا نین لەسەر ئەوەی كە خودا هەموو جارێك كردار بە بێ هۆكار دەخولقێنێت، ئەو واتایەشیان بەو دەستەواژەیە دەربڕیوە كە دەڵێن، چەقۆ نابڕێت، بەڵام خودا هەموو جارێك سیفەتی بڕین بەبەر تیژی چەقۆدا دەكات، ئایا ئەمە بیروباوەڕی ئێمە نیە؟!

ئەمە ئەوە دەگەینێت كە بوونی پردێكی پەیوەندی لە نێوان لاشە و رۆح/ نەفس پێویست نییە. چونكە خودا كە توانای ئەوەی هەیە بەبێ یاریدەو ئامراز كردار بخولقێنێت، ئاواش توانای ئەوەی هەیە كە هەست لە مرۆڤدا بەبێ یاریدەو ئامراز هەڵقولێنێت.

پاشان هاوڕێکەم گوتی:

من جارێکیان گوێم لە تۆ بوو کە دەتگوت پەیوەندی نێوان هۆکار و دەرەنجام حەتمییەو، هێرشت دەکردە سەر جیاکردنەوەیان و، دەتگوت کە ئەو کارە دەمانکاتە گاڵتەجاڕی جیهانی پێشکەوتوو، ئەو کات زۆر لێت دڵگران بووم، بۆیە ئەو هەلە دەقۆزمەوەو دڵنیات دەکەمەوە کە ئەو جیهانەی باسی دەکەی بە پێوەری مرۆڤایەتی و ئایینییەکان زۆر دواکەوتووە و، پێویست ناکات گرنگی بە بۆچوونی بدەین، بەڵکو پێویستە خۆمان لەم گرێی کەم و کورتییە ڕزگار بکەین، کە چەند سەدەیەکە پێیەوە دەناڵێنین!

لە هەڵچوونی هاوڕێکەمم کەمکردەوەو پێم گوت:

دوای ئەوەی گوێبیستی هەموو ئەو قسانەت بووم، ئێستا دڵنیام کە هۆکاری نەخۆشی ئوممەتمان پشتگوێ خستنی پەیوەندی نێوان هۆ و ئەنجامە، ئەمە سەرەڕای جەختکردنەوەی ئیسلام لەسەر ڕێزگرتن لە یاسا گەردوونیەکان.

موسڵمانان وازیان لە گرتنەبەری هۆکارەکان هێناوە، بە بیانووی ئەوەی کە خودا بکەری هەموو کردارێکە، ئیتر دەرەنجامەکەی ئەو حاڵە خراپەیە کە جیهانی ئیسلامی پێیگەیشتووە.

کاتێك پێشەوا غەزالی باسی پرسی کاریگەری هۆکارەکان دەکات، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە خودا توانای کرداری لە ناو هۆکارەکاندا داناوە، تا ئەو ئاستەی کە راستەکە ئەوەیە باوەڕمان بەوە هەبێت کە چەقۆ دەبڕێت، سەرەڕای ئەوەی کرداری بڕینەکە بە تواناو ویستی خودا ئەنجام دەدرێت.

سەرەڕای ئەوەش، هەندێك لە زانایانی بیروباوەڕی ئیسلامیی ئەم سەردەمە، دوای ئەوەی ڕای ئیمامی غەزالی باس دەکەن، بە باشیشی دادەنێن و، وایدەبینن کە لەگەڵ عەقڵ و واقیعدا دەگونجێت، بەڵام دیسان دەگەڕێنەوە سەر ئەوەی کە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە، ئەوەیە کە هۆکارەکان کارناکەن!! و چەقۆ نابڕێت، وادەزانن کە جگە لەم قسەیە لە ڕەهایی توانا و کرداری خودایی

کەمدەکاتەوە و، بەمەش لە تەواویی یەکخواپەرستی و تەواوی بە پاك ڕاگرتنی خودا کەم دەبێتەوە!

یەکێك لە نیشانەکانی گرنگیدانی خودا بە هۆکارەکان ئەوەیە، کە کردوویەتی بەئامرازی جێبەجێکردنی فرمانە خوداییەکەی ببە (كُن) بۆ خەلق کردنی هەمو شتێك.

بۆ نموونە ژیان لەسەر هەسارەی زەوی بە وشەی (كُن) دروست بووە، بەڵام پێویستی بە ئامادەکردنی زەوی هەبووە (لە ڕێی یاسا سرووشتیەکان) بۆ پێشوازی کردن لە ژیان بە درێژایی هەشت ملیار ساڵ.

هەروەها خودا هەموو مرۆڤێکی بە وشەی (كُن) خەلق کردووە، بەڵام جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە خوداییە لە ڕێی جوتبوونی دایك و باوکمانەوە و پاشان مانەوەمان بۆ ماوەی نۆ مانگ لە ناو سکی دایکماندا جێبەجێکردووە. تەنانەت خودا خۆیشی پێمان دەفەرموێت کە هۆکارەکان لە بەڕێوەبردنی گەردووندا بەکاردێنێت:

﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُّبَارَكًا فَأَنبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ ﴾ ق: ٩

خودا بە ئاو کشتوکاڵ دێنێتە بوون، سەرەڕای ئەوەی کە دەتوانێت بە بێ هۆکاریش ئەو کارە ئەنجام بدات.

بەردەوام بووم و بە هاوڕێکەمم گوت:

نکوڵیکردن لە کاریگەری هۆکارەکان کە خودا خۆی داینناون، وەك گەورە فەیلەسوفی بێباوەڕ دێڤید هیوم لە هەندێ ڕووەوە دێتە بەرچاوم، چونکە ئەو بێباوەڕە نکۆڵی لەوە دەکات کە گەردوون سیستەمێکی هەبێت و وایدەبینێت کە گەردوون لە ژێر کاریگەری هیچ یاسایەك نییەو، ئەو پەیڕەوی کردنەی گەردوون بۆ سیستەمێکی دیاریکراو بە عادەت دادەنێت! ئەمەش ڕێك ئەو قسەیەیە کە هەندێك لە زانایانی عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلامیی دەیکەن.

قسەکانم دەربارەی ئەو خاڵە بە هەڵوێستێکی پێشەوای باوەڕداران عومەری کوڕی خەتتاب کۆتایی پێدێنم، کاتێك دەربارەی بابەتێك پرسیاری لە پیاوێك

کرد، پیاوەکەش بە تەقوا و خشوعەوە گوتی: خودا دەزانێت.

عومەریش گۆچانێکی پێداکێشاو پێی فەرموو: من دەربارەی زانستی خودا پرسیارت لێناکەم، بەڵکو دەربارەی زانستی خۆت پرسیارت لێدەکەم.

ئا ئەمە بارودۆخی ئێمەیە، کاتێك لە یاساکانی گەردوون دەکۆڵینەوە پێویستە بەو زانستەوە پەیوەست بین کە خودا فێری کردووین و، ویستی خودا و توانای ڕەهای خودا نەکەینە بیانوو بۆ نکۆڵیکردن لە یاسا گەردوونییەکان. هەروەك چۆن پێویست ناکات لە هەوڵدانمان بۆ بە پاکڕاگرتنی خودا نکۆڵی لە هۆکارەکان و یاسا سرووشتیەکان بکەین و، وابزانین کە ئەمە تەواوەتی بە پاك دانانی خودایە، بەڵکو پێویستە سەرچاوەی هەموو پرسە غەیبییەکان قورئانی پیرۆز و سوننەتی دروست بێت.

هاوڕێکەم گوتی:

هەروەها من ئەو قسەیەشت ڕەتدەکەمەوە کە دەڵێی خودا ئامادەیی وەرگرتنی چەمکە ئایینییەکانمان تێدا دادەنێت و ئەو ئامادەییەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە. هەروەها ئەو قسەیەشت ڕەتدەکەمەوە کە دەڵێی ژینگە ڕۆڵی لە وەرگرتنی ئەو چەمکانە هەیە، من دڵنیات دەکەمەوە کە هیچ جیاوازی نییە لە نێوان ئەوەی مرۆڤ لە خێزانێکی ئایین پەروەر گەورە ببێت یان لە خێزانێکی نا پەیوەست، باوەڕ بە خششێکی خوداییەو، خودا بەهەر کەسێکی دەبەخشێت کە ڕووەو حەق و حەقیقەت بڕوات.

ئەم قسەیەی تۆ لە دادگەریی خودایی کەمدەکاتەوەو، کەمو کورییەکی گەورە لە بیروباوەڕدا درووست دەکات!

بە هاوڕێکەمم گوت:

باسی ئەوەمان کرد کە خودا فیترەتی دینداری لە ناخماندا داناوەو، بۆ ئەو قسەیەش بەڵگەی ئایینی و زانستیمان هێنایەوە، هەروەها هیچ کەسێکی دادگەر نکۆڵی لە ڕۆڵی ژینگەو پەروەردە ناکات لە دەستگرتن بە چەمکە ئایینییەکان

و، لەگەڵ دادگەریی خوداییشدا تێکناگیرێت. چونکە خودا لە ئێمە زاناترە بە ئامادەییمان و، گومانیش لەوەدا نییە کە ئەو ئامادەییە لە کاتی حەشر و حیسابیشدا لەبەرچاو دەگیرێت، چونکە دادگەریی خودایی لەوەدا نییە کە هەموو مرۆڤەکان بە یەك پێوەر بپێورێن، بەڵکو لەوەدایە کە هەریەکەمان بەپێی ئەو بارودۆخەی لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت کە خودا تێیدا درووستیکردووە.

دوای ئەوەی هاوڕێکەم لەو ڕەخنانەی تەواو بوو کە تایبەت بوون بە عەقیدە و بیروباوەڕ، چووە سەر هێرش کردنە سەر زانایانی گرنگیدەر بە پەیوەندی نێوان هەستە ڕۆحییەکان و بایۆلۆجیاو، تەنانەت ئەوانەش کە قسەی ئەوان دەگوازنەوە، گوتی:

١- تۆ بە دڵنیاییەوە دەزانی کە زانا بێباوەڕە ماددیگەراکان دان بە هیچ بەهایەکی ڕەوشتیدا نانێن! لەبەر ئەوە لە لێکۆڵینەوەکانیاندا ڕاستی و دەستپاکی و شەرەف پەیرەو ناکەن و پەنا دەبەنە بەر فڕوفێڵ.

٢- ئەو فێڵبازانە لە چەند بنچینەیەکەوە دەست بە لێکۆڵینەوەکانییان دەکەن کە باوەڕیان پێیان هەیە، لەوانە، ئەوەی کە پەرەسەندنی داروینی حەقیقەتەو، مێشکی ماددی بریتییە لە خوودی مرۆڤ، کە دەبوو بە لێکۆڵینەوەکانیاندا بێ هیچ چەمکێکی پێشوەخت دەستپێبکەن.

٣- ئەو ماددیگەرایانە بە دوای بنچینەی ماددی هەست و بیروباوەڕەکاندا دەگەڕێن، ئامانجیان ئەوەیە کە بیسەلمێنن مرۆڤ جگە لە ماددە هیچی تر نیە، هیچ باکیان بەوەش نییە کە ئەو دەرەنجامانەش بشێوێنن کە پێی دەگەین و، لەسەر گەردیلەیەك باڵەخانەیەك لە فڕوفێڵ بنیات بنێن، بۆ ئەوەی بۆچوونە ماددیەکانی پێشوویان بسەلمێنن، پاشان وەك مەڕ سەیری ئێمە دەکەن، لە ڕێی کتێبەکانیان ئەو دەرەنجامانەمان بۆ دەخەنەڕوو وەك ئەوەی ئێمە سەر لە هیچ دەرنەکەین.

٤- مامەڵەکردن لەگەڵ نووسینی ئەوانە، بە شیکردنەوەو، ڕەخنەگرتن نابێت، یان بە هاوڕابوون لەگەڵ ڕاستیەکانیان و ڕەتکردنەوەی ئەوەی بەهەڵەی دەبینین. بەڵکو مامەڵەی درووست بریتییە لە ڕەتکردنەوەی تەواوی بانگەشە ماددیەکانیان،

پاشان بەڵگەهێنانەوە لەسەر ئەو ڕەتکردنەوەیەو، پاشان هەوڵدان بۆ پێشکەشکردنی ڕای ڕاستترین. پێویست ناکات قسەکانیان دابڕێژینەوە یان بۆی زیاد بکەین، تا ڕوویان جوان دەربکەوێت.

٥- پێم وایە کە لەوەدا لەگەڵم هاوڕای کە ڕۆح لاشە بەڕێوە دەبات، لەبەر ئەوە پێویستە لێکۆڵینەوەی زانستی لە ڕۆحەوە دەستپێبکات. بەڵام ئەو فێڵبازانە لە ڕێبازی زانستی لادەدەن و لێکۆڵینەوەکەیان لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەستپێدەکەن، لە مادده (بایۆلۆجیا) بۆ ڕۆح. لەبەر ئەوە ڕاستەکە ئەوەیە کە زانست پرسی هەستە ڕۆحییەکان بۆ ئایین جێبهێڵێت.

وەڵامی هاوڕێکەمم دایەوەو گووتم:

١- ئەو خاڵانەی باست کردن، لەسەرم پێویست دەکەن کە خاڵێکی تەوەرەیی لە ڕێبازی بیرکردنەوەی زانستی ڕوون بکەمەوە، بەڵکو زۆر ناڕوونی ڕوون بکاتەوە: پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان دەرەنجامی ئەرێ و نەرێ بۆ هەندێك چەمکی ژێر لێکۆڵینەوە، لەگەڵ لێکدانەوە بۆ ئەو دەرەنجامانە و دانانیان لە لایەنی فیکری.

ئەمە بە نموونەیەك ڕووندەکەمەوە: زانست سەلماندوویەتی کە پەیوەندی نێوان ناوەندە دەمارە جیاوازەکانی مێشکی ئافرەت بە خوڕترە لە پەیوەندی نێوان ئەو ناوەندانە لە مێشکی پیاودا، ئەمە ڕاستییەکی زانستییە، کە لایەنگرانی ئافرەتان FEMINISTS وەریانگرتووەو ئەو دەرەنجامەیان دەرهێناوە کە پەیوەندی نێوان ناوەندەکانی بڕیاردان و ناوەندە هەستییەکان دا لە ئافرەت وا دەکات لە کاتی بڕیارداندا لایەنی مرۆڤایەتی لەبەرچاو بگرێت، واتە دیدی ئافرەت گشتگیرترە لە دیدی پیاو. هەرچی بانگەشەکەرانی لایەنگرانی پیاوانن MUSCULINISTS لە هەمان ڕاستی زانستی ئەو دەرەنجامەیان دەرهێناوە کە هەست و سۆز و کاردانەوەکان سەر لە ئافرەت تێکدەدەن و وادەکەن بڕیارەکانی درووست نەبن.

سبحان الله! هەمان ڕاستی زانستی بۆ سەلماندنی دوو بۆچوونی دژ یەك بەکارهێنراوە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پرسە سەرەکییەکەمان، دەبینین کە زانست ژمارەیەك چەمك و پەیوەندی لە نێوان ئایین و بایۆلۆجیا سەلماندووە (کە لە هەردوو باسی پێنجەم و شەشەم باسمان کرد) و لێکۆڵەران بەرامبەر ئەو چەمکانە یەکێك لە دوو هەڵوێستە دژ یەکەکەیان گرتۆتە بەر:

- ماددیگەراکان بە بەڵگەی ئەوەی دادەنێن کە مادده بریتییە لە خوودی مرۆڤایەتی و، پێویستمان بە بوونێکی غەیبی (وەك رۆح) نییە بۆ لێکۆڵینەوەی هەستی ڕۆحی مرۆڤی و دامەزراوەی ڕەوشتی، لەو بوارەشدا چەند کتێبیکیان داناوە.

- دیندارەکانیش بە بەڵگەی ئەوەی دادەنێن کە خودا فیترەتی ئایین و ڕەوشتی لە مێشکی مرۆڤ و دی ئێن ئەی داناوە، ئەو چەمکانە بە پردی نێوان ڕۆح و لاشە دەزانن و لەو بوارەشدا چەند کتێبێکیان داناوە.

لەبەر ئەوە پێویست ناکات لێکۆڵەری بابەتیی و دادگەر چەمکە زانستییەکان ڕەت بکاتەوە ئەگەر لەگەڵ بیروباوەڕیدا نەهاتەوە، بەڵکو پێویستە لەو چەمکانە بکۆڵێتەوەو لە شوێنی فیکری گونجاودا دایان بنێت.

٢- ئەگەر هەندێك لە ماددیگەراکانیش لە چەند چەمکی پێشوەخت دەستپێبکەن، بەڵام ئەوە خاسیەتی هەموویان نییە، ئەوەتا ئەنتۆنی فلو شوێنی بەڵگە دەکەوێت جا بۆ هەر کوێی ببات، و بەرەو ئەوەی برد کە خودایەك هەیە.

بە داخەوەم کە دەڵێم دەستپێکردن لە چەمکی پێشوەخت کە لەوانەیە پێچەوانەی ئەوەش بێت کە ئایین و زانست لە سەرین، بۆتە خاسیەتی خوودی زۆر لە دیندارەکان! لەو چەمکانەش، ئەوەی کە دەڵێن مەحاڵە بە خەیاڵیش وێنای پەیوەندییەکی هۆکاری نێوان لاشەو رۆحانییەتەکان بکرێت. هەروەها ئەوەی کە دەڵێن جیاوازی ئامادەیی خەڵك بۆ وەرگرتنی چەمکە ئایینییەکان لەگەڵ دادگەری خوداییدا تێکدەگیرێت.

یەکێکی تر لەو چەمکە پێشوەختانە، هەژمار کردنی هەموو بێباوەڕانە بەوەی کە بێ کەرامەت و درۆزن و فێڵبازن، لەکاتێکدا کە ئێمە هاوڕابووین لەسەر

ئەوەی کە دامەزراوەی ڕەوشتی دامەزراوەیەکی فیترییەو پێش ئایینەکان بوونی هەبووە، بۆیە نابێت وابزانین کە بێباوەڕان لە بۆشاییەکی بێ ڕەوشتیدا دەژین!

٢- لەوەدا لەگەڵت هاوڕام کە خوودی مرۆڤایەتی لاشە ئاڕاستە دەکات، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە لێکۆڵینەوەی زانستی پێویستە بە تەنیا لەوەوە دەستپێبکات. بەڵکو ڕێبازی زانستی ڕێ بەوە دەدات کە لێکۆڵینەوە لەسەرەوە بۆ خوارەوە، یان لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەستپێبکات. ئەو سێ کتێبەی لە ژێر ناوونیشانی (ناوەندەکانی دینداری لە مێشکدا) خستوومانەتەڕوو هەردوو ڕێبازەکەی لێکۆڵینەوەیان تێدایە.

هاوڕێی ئازیزم...

هیوادارم وەڵامەکانم بێزارت نەکەن.

ئەندازەی ڕەتکردنەوەی چەمکەکانی ماددیگەراکانتان دەزانم و، هۆکارەکانیشی دەزانم، بەڵام پێویستە نەخلیسکێین بۆ تۆمەت و ناو زڕاندنی تایبەتی، بە تایبەتی کە ئەو شێوازە زۆر لە هێزی بەڵگەکانمان کەمدەکاتەوە، بۆیە پێویستە دەست بەو شێوازەوە بگرین کە قورئانی پیرۆز بۆی دیاری کردوین.

﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴾ النحل: ١٢٥

واتا: خەڵك بانگ بکە بۆ ڕێگای خوداو بۆ ئیسلام بوون بە شێوەیێ کە موافیقی عەقڵ و هۆشی ساغ بێت، واتە بۆ زانا بە دەلیلێ کە قەناعەتی پێ بکا و بۆ نەزان بە شێوەیێ کە لێی حاڵی ببێ و بچێتە دڵیەوە. هەروەها ئامۆژگارییەك کە جوان بێ و دڵیان نەرم بکات و ڕایان بکێشێ بۆ ئیسلام نەك دڵیان بریندار بکات و لە حەق دوور بکەونەوە. باش قسەی لەگەڵ بکەی، ڕایبکێشی بۆ چاکەو دووری بخەیتەوە لە خراپە. بێ گومان خودای تۆ زاناترە کە کێ لە ڕێی ڕاست لائەداو کێ ڕێگای ڕاست ئەگرێتە بەر.

ئەو ماوەیەی سەردەمی زانست هەلێکی زێڕینە بۆ ناساندنی خودا بە خەڵك، چونکە ئێستا هەموو جیهان گرنگی بە زانست دەدات، ئەوەتا کتێبێکی وەك (مێژوویەکی کورتی کات) ی ستیڤن هۆکینگ، کە باسی درووستبوونی گەردوون دەکات، پڕفرۆشترین کتێبی مێژووە بە ڕێژەی دانەیەك بۆ هەر ٥٠٠ مرۆڤێکی سەر زەوی. هەروەها بەرنامەی تەلەفزیۆنی (گەردوون) کە کارل ساگان ئامادەی دەکرد بە پڕبینەرترین بەرنامەی مێژوو دادەنرێت. هەروەها ئەو کتێبانەی باسی پەیوەندی نێوان ئایین و جینات و مێشك دەکەن لە پڕفرۆشترین کتێبەکانن THE BEST SELLERS.

زانست ئەو زمانەیە کە مرۆڤی سەدەی بیست و یەك لە هەموو وڵاتانی جیهان تێیدەگەن، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی پێش چواردە سەدە ئەوەی پێ ڕاگەیاندووین.

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ فصلت: ٥٣

واتا: ئێمە لەمەوپاش بەڵگەو نیشانەکانی خۆمانیان لە جیهان و لە نەفسی خۆیانا پیشان ئەدەین تا بۆیان دەرکەوێ قورئان ڕاستەو کەلامی خوایەو لە خواوە هاتووەتە خوار بۆ پێغەمبەر. ئاخۆ بەس نیە بۆ ئادەمیزاد بۆ گێڕانەوەی لە گوناهو لە بێ فەرمانیی خوا ئەمە کە خوای تۆ ئاگای لە هەموو شتێ هەیە؟

دەکرێ ئەوەی باسمان کرد، کە لە گۆڤاری (تایم)ی ئەمریکی نوسراوە، دەربارەی گۆڕانی هەڵوێستی ئەنتۆنی فلو وەڵامی ڕاستەخۆ بێت بۆ ئەو ئایەتە. گۆڤارەکە نووسیویەتی: (لەسەرووی دۆزینەوە سەرسوڕهێنەرەکان کە زانستی نوێ پێیگەیشتووە، ئەوەیە کە خودایەك هەیە).

هاوڕێکەم...

پێویست ناکات هەڵوێستی دیندارەکان بەرامبەر ئەوەی زانست پێی دەگات ڕەتکردنەوە بێت، ڕەتکردنەوەی هەرچی پێچەوانەی تێگەیشتنیانە، بەتایبەت کە

ئێمە لەم قۆناغە ژیارستانییەدا لە بەدەستهێنانی زانست و زانیاریدا کەمتەرخەمین. موسڵمانان کە دەقی پیرۆز و پارێزراویان هەیە ( قورئانی پیرۆز و سوونەتی پێغەمبەر)، ئەوە بەرپرسیارییەتێکی گەورەیە لە گەردنیاندا، کە لەسەریان پێویست دەکات عەقڵیان بەکار بێنن بۆ تێگەیشتنی دەقە خوداییەکان کە مەبەست لێیان ئەوەیە لەگەڵ دەرەنجامە زانستی و ژیارستانیەکاندا بێنەوە، تا مرۆڤایەتی لە رێی ئەوەوە بزانن کە خودا حەقە.

ئەگەر ئێمە لەم سەردەمە هاوچەرخەدا، سەرەڕای توانامان بێتواناین لەوەی کە سەرکردایەتی مرۆڤایەتی بکەین لە رێگای زانستدا، ئەوە بەلایەنی کەمەوە با لە دۆزینەوەکان سودمەند بین، چونکە دانایی ونبوی باوەڕداره و لە هەر کوێ دۆزییەوە لە هەموو کەس زیاتر شایەنیەتی.

لە ڕاستیدا ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز وەك شیلەی گوڵ وان، پێویستە هەنگ هەوڵێکی زۆر بدات تا دەیکاتە هەنگوینێکی پاك و شیفابەخش. بەڵام بانگەشەکردنی ئەوەی کە زانست تایبەتە بە خۆمان، تەنیا لەبەر ئەوەی دەقی پیرۆزمان هەیەو بە بێ هەوڵدان بۆ تێگەیشتن و گونجاندنی ژیارستانیانەی ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە. هەروەها داخستنی دەرگا لەسەر عەقڵ بەوەی کە هەرچی دەیڵێین لە خانەی بیروباوەڕدایەو ناکرێ قسەی لەسەر بکرێت و کە لە ڕاستیشدا وا نیە، ئەوە هەڵەیەکی گەورەترە.

نابێت لەو سەردەمەدا پیرۆزی بدەینە ئەوەی موسڵمانانی سەردەمانی پێشو گوتوویانە، هەروەك چۆن لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کڵێسا کردی و، وابزانین قسەی ئەوان حەقیقەتی ڕەهایەو، لە کۆڕ و دانیشتنەکانماندا بە شانازییەوە باسی قسەگەلێك بکرێت کە پێویستی بە سەرنج و تێگەیشتنی دووبارە هەیە.

ئێمە بەم شێوازە گفتوگۆ لەگەڵ خۆمان دەکەین و بە قسەکانی خۆمان مەست دەبین، لە کاتێکدا کە جیهان و زانست بە جێمان دێڵن و هیچ گرنگی بە زانیارییەکانمان نادەن. ئەو زانیاریانەی مرۆڤ وەك خواردن و خواردنەوە پێویستی پێیان هەیە، بەڵام کانییەکەمان شلوێ کردووە و ئاوەکەمان پیس کردووە، ولا حول ولا قوه الا بالله.

## باسی نۆیەم : بوونی مرۆڤ



## سەرچاوە-ڕێگا-کۆتایی

دەروازە...

بیرمەندە گەورەکە کە زۆر شانازی بە بیروڕاکانی دەکەم، دوای ئەوەی پێداچوونەوەی بۆ بەشەکانی کتێبەکە کرد و دوای پێداهەڵگووتنی، پێی گووتم: دەبینم لە خستنەڕووی بیروڕاکانی (گەشتی عەقڵ) لە لووتکەی فەلسەفەدا خۆت دەبینییەوە، پاشان دەیانبەستییەوە بە چەمکە ئایینییەکان، لەو کاتەدا بیرم لە شێوازی وتاربێژیی هەندێ لە وتاربێژانی مزگەوتەکان دەکردەوە، کاتێك باس لە هەندێك بابەتی گشتیی و زانستی دەکەن و بە هەندێك ئایەت و فەرموودە دەیسەلمێنن و، زۆرجار زانست و بەدیهییە عەقڵییەکان ڕەتدەکەنەوە، ئەم شێوازە زۆر کەسی تووشی بێزاریی کردووە و بۆتە هۆی ئەوەی کە لە ئایین دوور بکەونەوە.

ئەم جۆرە خستنەڕووە بە تەنیا لەلای ئامۆژگاریکارانی مزگەوتەکان و ڕاگەیاندنەکاندا نەوەستاوە، ئایا زانیوتە کە یەکێك لە باشترین سی بابەت و وتاری زانستیی جیهانیی کە لە ساڵی ٢٠٠٧ هەڵبژێردرا، وتارێك بوو بەناوونیشانی: (زانست و ئیسلام لە ململانێ دان) Science and Islam in Conflict .

لە پێشەکی وتارەکەدا کە لە Discover Magazine بڵاوکراوەتەوە هاتووە:

((لە هەموو وڵاتانی جیهان، بە جیاوازی کلتوور و زمانیان، زانست لەسەر چەمك و بنەمای زانستیی گەشە دەکات، جگە لە جیهانی ئیسلامیی، لەوێدا قورئان زانست هەڵدەسوڕێنێت)).

گرنگی بە ئیعجاز دەدەن لە قورئانی پیرۆزدا و، بە نموونەی ئاشکرا دەیسەلمێنێت کە چۆن راستییە زانستییەکان بەلارێدا دەبەن تا لەگەڵ بۆچوونە رووکەشەکانی ئاییندا بگوونجێت. تەنانەت هیچ رێگایەکیش نییە لەبەردەمیان کە دەستکاری بیردۆزە زانستییەکان بکەن یان رەتیان بکەنەوە لە رێی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەوە. کاتێك نوێنەری گۆڤارە زانستییەکە پرسیاری لە یەکێك لە زاناکانی ئەو بوارە کرد دەربارەی سەرچاوەی یەکێك لە بۆچوونە زانستییەکانی، لە وەڵامدا گووتی: قورئان.

ئەم شێوازە زۆرێك لە بیرمەندی گەورە و ئەوانەی بەدوای حەقدا دەگەڕێن وایلێکردوون کە متمانە بە هزری ئایینی نەکەن و هەر بەڵگەیەکی ئایینی بەلاوە دەنێن، هەتا ئەگەر لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی یان فەلسەفیی قووڵیش بێت، وا بیردەکەنەوە کە نووسەرەکە فێڵیان لێدەکات و تێگەیشتنی رووکەشی خۆی دەربارەی ئایین بە وان دەفرۆشێتەوە.

من دژی ئەوە نیم کە لە ئیعجازی زانستیی لە قورئاندا بکۆڵینەوە، بەڵام داواکارم ئەوانەی ئەو کارە دەکەن لەلایەنی زانستیی و ئایینیدا ورد بن. من لەوە دەترسم کارەساتی کڵێسای سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا و ئەوەی فرانسیس(خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لە پزیشکیدا ) کردی، کاتێك هەڤدژییەکی لەنێوان تەورات و راستییە زانستییەکاندا بەدیکرد و زانستی هەڵبژارد و بوو بە بێباوەڕ دووبارە بکەینەوە.

من لە هەموو قسەکانی لەگەڵ بیرمەندە گەورەکەدا هاوڕابووم، چونکە منیش لە هەمان کێشەدا دەژیم، کە ئەو خستنەڕووە پڕ کەموکوڕییەی ئایین بۆی درووستکردووین..بەڵام..ئایا ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە ئیتر لاپەڕەی ئایین بسڕینەوە و بیخەینەلاوە، هەروەك چۆن ئەوانەی متمانەیان بە هزری ئایینی نەماوە دەیکەن!

ئەگەر ئایین خۆشییەکی هزری یان پرسێکی فەلسەفیی تیۆریی بوایە ئەوا ئەو رێگاچارەیە کێشەیەکی نەبوو تا پشوو بدەینە دەماغمان، بەڵام ئەگەر خوایەتی حەقیقەت و راستیی بێت و، ئایین رێبازی ژیان بێت و، لە ژیانەکەی

تر لەژێر سایەی ئەودا لێپێچینەوەمان لەگەڵدا بکرێت، ئەوا بابەتەکە جیاوازە.
بیرمەندە گەورەکە قسەی پێبڕیم و گووتی:

تۆ داوا لە خەڵك دەکەی کە ئایین بکەنە رێبازی ژیانیان چونکە دوای مردن زیندوو دەکرێنەوە و لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت.

کێشەکە لەوەدایە کە زۆرێك لە بیرمەندان باوەڕیان بە پرسە غەیبییەکان نییە، بەلایەنی کەم دەیانخەنە لاوە، ئەگەر گرنگیان پێدابا ئەوە بابەتەکە کۆتایی دەهات، لە ڕاستیدا باوەڕبوون بە غەیب پێویستە پێش پابەندبوون بێت، تۆ بەم کارەت کورتان بەر لە کەر دەکری.

بە هاودەمە بەڕێزەکەمم گوت، ئەوان هیچ بژاردەیەکی تریان لە بەردەمدا نییە، چونکە بەربەستەکانی نێوان زانستی هاوچەرخ و پرسی خوایەتی و ئایین لاچووە، تا ئەو ئاستەی زانای فیزیایی گەورە نیلزبۆر بە بوێری ڕایگەیاند[1]:
(( فیزیای هاوچەرخ لە ئێستادا لە سنووری میتافیزیکا دەژی)).

زانایانی گەردوونناسی ڕایانگەیاندووە کە زانستەکەیان لە تەقینەوە گەورەکەی گەردوونەوە دەستپێدەکات، بەڵام پێش ئەوە ئەوا لە دەرەوەی بواری ئەوانە.
هەروەها زانایانی بایۆلۆجی رایانگەیاندووە کە زانستی ئەوان لە لێکۆڵینەوە لە پێکهاتە ئەندامیەکان و کارلێکە کیمیاییە زیندووەکان دەستپێدەکات، هەرچی ڕاستی ژیان و چۆن ژیان بەبەر ماددەی نازیندوودا کراوە ئەوە لە دەرەوەی بازنەی زانستی ئەوانە.

ئایا بە لێکدانەوەی بێباوەڕان ڕازی بین بەوەی کە گەردوون لە نەبوونەوە پەیدا بووە و یەکێکە لەو ڕووداوە دەگمەنانەی کە دەکرێ لە خۆڕا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر ڕووبدات! ئایا بەوە ڕازی بین کە ژیان ئەو کاتە دەرکەوت کە لە ناکاو لە ناو دی ئێن ئەی جادوویی دەرکەوت! ئایا بە ڕاکردنی ڕیچارد دۆکنز ڕازی بین کاتێك دەربارەی عەقڵی مرۆڤ پرسیاریان لێکرد؟ گوتی نازانم،

---

(١) یەکێکە لە دامەزرێنەرانی فیزیای چەندیی و خەڵاتی نۆبڵی بەدەستهێناوە.

تۆپەکە بخەنە یاریگای کەسێکی ترەوە! ئایا عەقڵی ئێمە بەو لێکدانەوانە تێر دەبێت و دواتریش بانگەشەی زانست بکەین؟

زانا دادگەرەکانمان ئێمە ڕێنموونی دەکەن بۆ فەلسەفە و ئایین تا لە دەرگایان بدەین و بگەینە ئەو ڕاستییانە و، هەروەها بۆ گەیشتن بە لێکدانەوەی ئامانجدارێتی بوون، دوای ئەوەی زانایانی زانستە سرووشتییەکان کەمتەرخەم بوون لە لێکدانەوەی ئەو دیاردانە.

بیرمەندە گەورەکە وەڵامی دامەوە: ئەگەر بابەتەکە لە نێوان فەلسەفەو ئاییندا بێت، ئەوا زۆرێك لە توێژەرەوان ڕێگای فەلسەفە هەڵدەبژێرن، چونکە متمانەیان بە بەڵگەکانی هەیە و، لە ئایین دوور دەکەونەوە کە وایدەبینین بەڵگەکانی وەك جلی دڕاو وایە و لە بەر زۆری بەکارهێنانی هەمووی پینەو پەڕۆیە، هەروەها وەك ئەو ئاوازە ناخۆشەی ئەو مۆسیقاڕانە دەیژەنن کە لێی نازانن.

بە هاودەمە گەورەکەمم گووت:

ئەگەر دان بەوەدا بنێین کە ئەو چەمکە غەیبییانە بە حوکمی عەقڵ ڕاستین و، لە هەمان کاتدا لە سەرووی توانای فەلسەفەوەن، ئەوا هیچ ڕێگایەکی تر نییە جگە لەوەی خەڵکی عاقڵ بەدوای کەسێکدا بگەڕێن کە ڕێگای ئەو جیهانە غەیبییەیان نیشان بدات کە بۆی دەچن، بۆ ئەو کارەش جگە لە ئایین هیچ ڕێگایەکی تریان نییە، ئەمە حوکمی عەقڵە.

لەبەر ئەوە ئەوانەی توانایان هەیە ئەو لێڵییە لەسەر ئایین لابەرن لە نەزانی و دەمارگیری پێویست ناکات لەو کارە ڕابکەن. لەسەر دیندارە ڕۆشنبیرەکان پێویستە بەتایبەت ئەوانەی گرنگی بە زانست و فەلسەفە دەدەن کە بێنە مەیدان و تەواوی بەرپرسیاریەت بخەنە سەر شانیان لە شۆڕش بەرپاکردن بە مەبەستی ((نوێگەری گوتاری ئایینی)) دا. ئەمەش ناکرێ تەنیا بەوە نەبێت کە ئایین لە شوێنی خۆیی و زانستیش لە شوێنی خۆیدا و عەقڵ لە شوێنی خۆیدا دابنرێن و، لەهەر کوێ بەیەکگەیشتن هەبوو بخرێتە ڕوو.

بەرێزم.. لەو چوارچێوەیەدا، بەڵگە هێنانەوەمان بە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەو کتێبەدا وەك تەواوکەرێکە بۆ ( گەشتی عەقڵ ) نەك بەڵگەهێنانەوەیەکی جیاواز بێت یان نامۆ.

**بەڵگەهێنانەوەکانمان لە دوو تەوەردا خۆی دەبینێتەوە:**

**تەوەری یەکەم:** ئاگادار بوون لەوەی کە عەقڵ دەرگای ( ناسینی خودا )یە، بە چوونەلای فیترەت و ئایین بۆ تەواوکردنی ناسینەکە.

**تەوەری دووەم:** ((زانینی سەرەتاو ڕێگاو کۆتایی مرۆڤ) کە ئەمە بابەتێکە سەرچاوەکانی تەنیا ئایینین و فەلسەفە قسەیەکی لە سەر نییە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش قۆناغێکە تەواوکەری گەشتی عەقڵە؛ چونکە دەکرێ لە ڕێی ڕێبازی زانستی لە هەموو ڕووداوەکان دڵنیا ببینەوە.

## مرۆڤ لە سەر شانۆی بووندا :

ئەنتۆنی فلو (و ئەوانی دی لە لایەنگرانی ئایینی سرووشتیی) لە ڕێی بەڵگەی عەقڵی (زانستی و فەلسەفی) گەیشتوونەتە بوونی خودای بەدیهێنەری بوون و هەندێك لە سیفاتەکانی و، ئەوەی کە خودا یاساکانی بەڕێوەبردنی گەردوونی دارِشتووە.

ئایا ئەوانەی بەدوای راستیی و حەقیقەتدا دەگەڕێن و بەو ڕێنماییە فەلسەفییە وازدێنن و، قبووڵی ئەوە دەکەن کە خودا لە بوون دابراوە و، بۆ یاسا سرووشتییەکانی بەجێهێشتووە و، پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤدا ناکات؟ پێت وانییە ئەوە تێڕوانینێکی پێچەوانەی لۆژیکە؟

ئەگەر ئەوانە گەیشتنە ئەوەی کە بەدیهێنەری بوون خودایەکی حەکیم و کاربەجێیە، چ حیکمەت و کارزانییەك لەوە دایە بوونەوەرێکی زیرەکی وا درووست بکات کە پرسیارەکان پرژەی لێ بڕیون، لە هەمان کاتدا نەتوانێت پەیوەندی لەگەڵ بەدیهێنەری ببەستێت، تا ئامانجی درووستکردنەکەی پێ بناسێنێت؟

ئایا خودای کارزان بۆ خۆشی و رابواردن درووستی کردووە، هەروەکو (زەیوس)ی خواوەند کردی؟

ئەگەر ئەوانە هەموو خاسیەت و سیفاتەکانی کەماڵ و تەواوی دەدەنە پاڵ خودا، لەوانە عەدل و دادگەری، ئایا پێویست نییە لێپێچینەوە لە ستەمکار بکرێت لەسەر ئەوەی دەرهەقی ستەملێکراو کردوویەتی؟ ئەگەر سزادان لە زۆربەی کاتەکان لەم ژیانەدا ناکرێت، ئایا ئەمە ناخوازێت ژیانێکی تر لە دوای مردن هەبێت تا لەوێدا حساب و سزا هەبێت؟

هەموو ئایینەکان گرنگیان بەو پرسە غەیبییانە داوە، ئیسلام تاکە ئایینە لەنێو ئایینە یەکخوا پەرست و ئایینەکانی تر کە بە وردی و درێژی گرنگی بە پرسی بوونی مرۆیی داوە لە: (سەرچاوە و، رێگا و، کۆتایی)[1].

ئەم گرنگیپێدانە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە ئیسلام ئایینی حەق و راستە، چونکە ئامانجی ئامانجەکان لە ئاییندا ئەوەیە کە ئامانج و مەبەستی خودا لە بوونەوەرەکانیدا روون بکاتەوە.

جا ئەگەر پرسی بوونی مرۆیی پرسێکی غەیبی بێت، دەکرێ لە میانی پەیڕەو و رێبازی زانستیدا بەدوای راستی و درووستی ئەو پرسەدا بگەڕێین، چونکە زۆربەی بەشەکانی ئەو چیرۆکە دەکەونە ژێر تیڕامانی هەستەوەری ناڕاستەوخۆی مرۆڤ، بەڵام بەشە غەیبییەکەی چیرۆکەکە دەکرێ لەمیانی دەرەنجامی عەقڵیدا بەدوای راستییەکەیدا بگەڕێین، واتا تەواوی چیرۆکەکە ملکەچی تێبینیکردن و لێکۆڵینەوەیە، ئەمەش لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی دەسەلمێنین.

---

(١) لە کتێبی ئەندازیار د. محمد حوسەینی ئیسماعیل: الدین والعلم وقصور الفکر البشری. کە لەساڵی ١٩٩٩ - چاپکراوە.

**چیرۆکی بوونی مرۆییمان، لە تێڕامانی ئیسلامدا، بەم شێوەیەی خوارەوە دەڕوات:**

**١- جێنشینیی لەسەر زەویدا**

چیرۆکی بوونی مرۆڤایەتی بەوە دەستپێدەکات کە پەروەردگار بە فریشتەکانی راگەیاند، کە یەکێك لە بوونەوەرەکان دەکاتە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی. بەو مانایەی کە ئەو بوونەوەرە بەئازادی و توانایەك کە خودا بۆی دیاریدەکات لەسەر زەویدا رەفتار دەکات:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ﴾ البقرة: ٣٠

ئەوانیش عەرزیان کرد: جۆرە مەخلووقی وەهات بۆچییە کە لەوێ ئاژاوە بنێتەوەو خراپەکاری بکات و خوێن برێژێ، لە حالێکدا کە ئێمە سوپاس و ستایشت ئەکەین تەقدیست ئەکەین بەگەورەت ئەزانین[1]؟

فریشتەکان جگە لە بوونەوەرێکی سەرەتایی کە لەسەر زەویدا خراپەکاریی بڵاودەکاتەوە هیچی تریان لەو بوونەوەرەدا بەدینەدەکرد و، ئاواتیشیان بە پێگەکەی دەخواست بۆیە بەسەرسوڕمانەوە گووتیان:

﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ﴾ خودا وەڵامی فریشتەکانی دایەوە

﴿قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ البقرة: ٣٠ خوا لە وەڵامیاندا فەرمووی: ئەوەی من ئەیزانم ئێوە نایزانن.

هەروەها خودا پێمان دەفەرمووێت کە مرۆڤ بە ویستی خۆی جێنشینیی قەبووڵ کردووە:

---

(١) راڤەی ئایەتەکان لە تەفسیری (نامی) مامۆستا مەلا عبدالکریمی مودەڕریس (رەحمەتی خوای لێبێت) وەرگیراون.

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ ﴾ الأحزاب: ٧٢

ئێمە ئەمانەتی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خۆمانمان خستە بەردەمی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان تا بزانین ئاخۆ ئامادەن لە ئەستۆی خۆیانی بگرن، نکوڵیان لە لەئەستۆگرتنی کردو هەڵیان نەگرت و لەو بەرپرسییە ترسان کە دێتە بەریان، پاشان ئادەمیزاد هەڵیگرت و لە ئەستۆی خۆیی گرت. بەڕاستی ئادەمیزاد ستەمی لە خۆی کردو نەیزانی چ ئەرکێکی گەورەی لە ئەستۆی خۆی گرتووە.

مرۆڤ ئەمانەتەکەی قەبووڵ کرد (جێنشینیی- گرتنە ئەستۆی فەرمان و قەدەغەکراوەکانی خودا- ئازادی هەڵبژاردن...)، بەڵام نەزان بوو چونکە گرنگی تەواو و پێویستی بەو پرسە نەدا، هەروەها ستەمی لە خۆی کرد بەوەی کە ڕێنموونیی و هاوکاری خودایی قەبووڵ نەکرد.

باشترین بەڵگەی ماددیش لەسەر هەڵسانی مرۆڤ بە جێنشینیی لەسەر زەویدا بریتییە لە پێشوازیکردنی لە ئەنجامدانی کارەکانی بە ئازادیی و بەپێی توانا.

**٢- مرۆڤ بوونەوەرێکی تەواو و، دوو پێکهاتەیە**

**لاشەیەکی ماددی و ڕووحێکی نوورانی**

﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾ ص: ٧١ - ٧٢

ئەم ئایەتە ئەگەڕێتەوە بۆ ئایەتی ٦٩ و باسی ئەو دەمەقاڵێیە ئەکا لەناو فریشتەکانا ڕوویدا. ئەفەرموێ: ئەوە بوو خوای تۆ بە فریشتەکانی وت: من ئینسانێ دروست ئەکەم لە گڵ، جا کاتێ دروستم کردو بە فووی ئەو فریشتەیەی ئەم کارەی پێ سپێرراوە لە گیانی خۆمم کرد بە بەرا، ڕوو لەسەر زەوی بکەون و سوجدەی بۆ بەرن.

گومانیش لەوەدا نییە کە سرووشتی ڕووح و ناوەڕۆکی لە هەستپێکردنی عەقڵ دووره، لەبەر ئەوە خودا زانیارییەکانی دەربارەی ڕووحی لەلای خۆی هێشتۆتەوە:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ الإسراء: ٨٥

لە بارەی ڕۆحەوە لێت ئەپرسن کە چییە. بڵێ: ڕۆح لەو مەخلوقانەیە کە بەئەمر و فەرمانەکانی خودای من پەیدابوون و، هەر خودا خۆی ئەزانێ چییە؟ ئێوە ئەندازەیێکی کەم نەبێ زانیاریتان پێ نەدراوە، دیارە عەقڵی ماددیی کەموکوڕی ئێوە پەی بە شتی نامەحدوود ناباو نایزانێ.

دووانەیی ڕووح و لاشە واتای ئەوە نییە کە ڕووح جەوهەری مرۆڤ بێت و لاشەش زیادە بێت. بەڵکو خوودی مرۆڤایەتی بریتییە لە هەردوو لای بە یەکەوە. لە باسی پێشوودا بەڵگەی زانستی و عەقڵی و ئایینیمان لەسەر ئەو پرسە هێنایەوە.

**٣- بوونەوەرێکە بە زانست و بیرکردنەوە جیادەکرێتەوە**

گەشتی ئەم بوونەوەرە سەرەتاییە بۆ ئامادەکردنی بۆ جێنشینیی بە فێرکردن دەستپێدەکات، کە خودا بە هۆیەوە مرۆڤی لە فریشتەکان جیاکردەوە:

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ سُبْحَـٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ ﴾ البقرة: ٣١ - ٣٢

جا لەبەر ئەوە کە خودای گەورە ئادەمی هەڵبژارد بوو بۆ جێنشینیی خۆی، ناوی هەموو شتە پێویستیەکانی فێرکردو تێی گەیاند. پاش ئەوە وێنەی ئەو شتانەی پیشانی فریشتەکان داو پێی فەرموون: ئادەی ئەگەر ڕاست ئەکەن ئێوە شایانی جێنشینیی منن، یا ئەگەر ڕاست ئەکەن دروست کردنی ئادەم و ئادەمزاد کە ئەمە حاڵیان بێ بۆ شانی خودای گەورە ناشێ، ناوی ئەم شتانەم پێ بڵێن، کە فریشتەکان ناوی شتەکانیان نەزانی و دامان وتیان: خودایا تۆ پاك و بێخەوشی و ئێمە هیچ نازانین ئەوە نەبێ کە تۆ فێرت کردووین، هەر تۆ خۆت زانای بە هەموو

شتێك و هەر خۆت لە هەموو کارێکدا خاوەن حیکمەتیت و هەر خۆت ئەزانی چی ئەکەیت. ئەنجا خوای گەورە فەرمووی: ئادەی ئادەم ناوی ئەو شتانەیان پێ بڵێ و حاڵییان بکە. کە ئادەم تێی گەیاندن خودا فەرمووی: ئەی پێم نەوتن من پەنامەکییەکانی زەوی و ئاسمان ئەزانم و هیچم لێ ون نابێ و، ئەوەی دەری ئەبڕن و ئەوەی ئەیشارنەوە هەمووی پێ ئەزانم؟

دەکرێ ئادەم لەم ئایەتەدا ئاماژە بێت بۆ هەموو مرۆڤایەتی، فێربوونی ناوەکانیش ئاماژەیە بۆ ناسینی هەموو شتەکان.

پاشان قۆناغێکی تری فێرکردن دێت:

﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ ۝٣ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ۝٤ ﴾ الرحمن: ٣ - ٤

ئادەمیزادی دروست کرد. نیشانی دا کە چۆن بتوانێ ئەوەی لە دڵیایە بیڵێ و دەری ببڕێ.

(البیان) واتا دەربڕین بە زانینی پەیوەندی شتەکان بە یەکترەوە، ئەوەش بریتییە لە بیرکردنەوە.

**٤- بوونەوەرێك کە هۆشیارییەکی فیترِی بە بوونی خودا هەیە**

خودا خۆی هەستکردنی فیترِی بە پەروەردگاریتی خۆی لە مرۆڤدا چاندووە، کە پێویستی بە هیچ میانگیرییەکی فریشتەیەکی پیرۆز یان پەیامبەرێکی نێردراو نییە:

﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ۝١٧٢ ﴾
الأعراف: ١٧٢

ئەی پێغەمبەر! بیری ئەوە بکەرەوە کە خودای گەورە لە پێش لە دایکبوونی هەر ئینسانێ لەو کاتەدا کە تۆو بووە لە پشتی باوکیدا ئەو تۆوەی هۆشیار کردووەتەوەو قسەی لە گەڵ کردووە: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش

وتوویانە: بەڵێ پەروەردگاری ئێمەی و، کردوونی بە شاهید لەسەر خۆیان بۆ ئەم پەیمانە نەبادا لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن ئێمە ئاگامان لەم پەیمانە نەبووە. یا لە عالەمی ئەرواحدا قسەی لەگەڵ کردوون و پەیمانی ئیعتراف بە خودایەتی خۆی لێ وەرگرتوون و کردوونی بە شاهید لەسەر خۆیان.

جا یەکسانە ئەگەر ئەو کارە لەو کاتەدا روو بدات کە مرۆڤ لە قۆناغی تۆو (سپێرم) و هێلکەدابێت یان ئەوکاتەی خودا هەموو نەوەی ئادەمی بەر لە درووستکردنی بوونەوەر لە پشتی ئادەم دەرهێناو شایەتی خوایەتی لێوەرگرتن، چونکە هۆشیاری فیتری بە بوونی خودا بۆتە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ.

### ٥- کۆشش بەرەو پەرستن

پەرومردگار مرۆڤی بۆ پەرستن ئامادەکرد و، ویستیی پەرستنی کردە ویستێکی فیتری تێیدا:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦

من جنۆکەو ئادەمیزادم بۆ هیچ دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێ کە بمپەرستن. بەڵام مرۆڤ نازانێت چی دەپەرستێت، یان چۆن پەرستن بکات، لەبەر ئەوە وێنەی پەرستشەکان زۆر لە یەك جیاوازن، ئەوەتا ئەوان بت و درەخت و ئاژەڵ و مرۆڤەکانی پێش خۆیان دەپەرستن و، ئەوانی تریش خودا دەپەرستن بەڵام لەسەر شێوەیەکی گۆڕاو و شێوێنراو، تا مرۆڤ بە جێبەجێکردنی ئایینی ئیسلام دەگاتە پەرستنی راست و درووست.

### ٦- بوونەوەرێك کە فیترەتی رەوشتی هەیە

بۆ ئەوەی خودا یارمەتیمان بدات لەسەر ئەنجامدانی چاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپە ئەو کارە بۆ بیرکردنەوەی ئێمە لێنەگەڕاوە، بەڵکو چاکەو خراپەی بۆ مرۆڤ روونکردۆتەوە.

﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ ﴾ الشمس: ٧ - ٨

سوێند بەنەفسی ئادەمیزاد و بەو خوایەی وای دروست کردووە کە ئامادەی کردووە بۆ هەموو سیفەت و کردارەکانی. جا نیشانی داوە لە فەرمانەکانی خوا دەرچوونی کامەیە و لە خوا ترسانی کامەیە.

**٧- هەروەها لە فیترەتی مرۆڤدا (یاسای رزگاربوون)ی داناوە**

﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾ الشمس: ٩ - ١٠

سوێند بە هەموو ئەوانە، ئەو کەسەی نەفسی خۆی پاك کاتەوە لە سیفاتی خراپ و ناشیرین ڕزگاری ئەبێ و! ئەوەی پەردەی نەفامی و نەزانی و بێ شەرمیی بدا بەسەرا نائومێد و بێ بەش ئەبێ.

یاسای رزگاربوون بە دەوری (ئازادی هەڵبژاردن)دا دەخولێتەوە کە بنەمایەکی بنچینەیی ئیسلامە و، زۆرێك لە بەلاڕێدابەران نکۆڵی لێدەکەن و، بەرپرسیارییەتی مرۆڤ بەرامبەر کردەوەکانی لەبەر مرۆڤدا دادەماڵن.

**٨- سرووشتی ژیانی لەسەر ئەم گەردوونە ماددیە فێری مرۆڤ کرد**

خودا مرۆڤی لەم ژیانەدا رووبەڕووی مەینەتی و ماندووبوون کردۆتەوە:

﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ﴿٤﴾ ﴾ البلد: ٤

ئێمە بەڕاستی، ئادەمیزادمان لە هەموو ژیانیا لە ماندوویەتی و ئەرکا دروست کردووە. گومانیش لەوەدا نییە کە ماندووبوون و مەینەتی لە خاسییەتەکانی مرۆڤە بە گشتی و، باوەڕدار و بێباوەڕ رووبەڕووی دەبنەوە:

﴿ وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ ﴾ النساء: ١٠٤

سست مەبن لە کەوتنە دوای دوژمن و بەگژداچوونیان، ئەگەر ئێوە ئازارتان پێ ئەگات، ئەوانیش وەك ئێوە ئازایان پێ ئەگات، زیاد لەوەیش ئێوە بە تەمای

لوتف و سەرکەوتنن لە لایەن خوداوەو ئەوان ئەو هیوایەشیان نییە و لە رێی شەیتاندا ئەجەنگن.

رێگای سوککردنی ئەو کۆژانانە و بەدیهێنانی بەختەوەری، بریتییە لە شوێنکەوتنی رێنموونی خودا:

﴿ ...فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَٰلِكَ الْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ ﴾ طه: ١٢٣ - ١٢٦

جا کاتێ کە لە منەوە رێپیشاندانێکتان بۆ دێ هەر کەسێ شوێنی ئەو رێپیشاندانەی من بکەوێ رێ گوم ناکا و نارەحەت و کلۆڵ نابێ. هەر کەسێکیش پشت لە یادکردنەوەی من هەڵکا ژیانێکی تەنگ و ناخۆش ئەژی لە دنیادا چونکە هەموو قورسایی کارو بیری خۆی خستووتە سەر کۆکردنەوەی ماڵی دنیاو هیچ رەحەتییەکی دڵی نابێ و، لە رۆژی قیامەتیشا بە کوێری حەشری ئەکەین ئەویش ئەڵێ: خوایە بۆ بە کوێری حەشرت کردم لە کاتێکا من لە دنیادا چاوساغ و بینا بووم؟. خوا فەرمووی: وامان پێ کردی چونکە لە دنیادا ئایەتی ئێمەت بۆ هات کەچی فەرامۆشت کردو گوێت نەدایێ، تۆیش هەروا ئەمرۆ لە بەرچاو ئەکەوی و فەرامۆش ئەکرێی.

گومانیش لەوەدا نییە کە هەندێك کارەسات هەن قەدەرین، لەبەر ئەوە پێویستە لە کاردانەوەکانماندا وریابین و، رێگا نەدەین کە خەمەکانی ژیان چۆکمان پێدا بدەن:

﴿ مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ الحديد: ٢٢ - ٢٣

هیچ دەردو بەڵاو موسیبەتێ نادا لە شوێنی خۆی، وەك وشكەساڵی و سن و كوللە و شتی وا لە زەویداو، وەك نەخۆشی و برینداری و شتی وا لە خودی خۆتانا، ئیللا بەر لەوەی كە ئەو مسیبەتە دروست بكەین لە كتێبێكدا نووسراوە و بڕیار دراوە كە (اللوح المحفوظ)ە، ئەمەیش كارێكی ئاسانە بۆ خوا. باسی نووسرانی ئەو مسیبەتانەمان كرد كە لە موقەددەرنامەدا نووسراون، بەر لەوەی ڕوو بدەن، بێن بەسەرتانا، تا بزانن ئەوانە قەزاو قەدەری خوان و ئیتر نە خەفەت بخۆن بۆ ئەو شتانەی لە دەستان چوون و نە شادمانیش ببن بەوەی خوا پێی داون و، خوا خۆشی نایەت لە هیچ كەسێ خۆی بە زل بزانێ و فیز بكا بەسەر خەڵكی ترا.

ئایا ئەو تێگەیشتنە سادە و ڕوونەی سرووشتی بوونی مرۆڤ لەسەر ئەم گەردوونە ماددییە وەڵامی كێشەی خراپە و ئازار نییە، كە زۆرێك لە فەیلەسووفەكانی بەرەو بێباوەڕیی برد؟

### ٩- فـــەزڵی نییە

گومان لەوەدا نییە كە بەهێزیی و ڕوونی پاڵنەرە فیترییەكانی پێشوو بەسن بۆ ئەوەی وا لە مرۆڤ بكەن كە هەر ئایینێك وەربگرێت كە لەسەری پەروەردە بووە! مادام ئەو پێداویستییەی بۆ پڕدەكاتەوە، تەنانەت ئەگەر دەقەكانیشی پڕبن لە بتپەرستی فیكری و ئەفسانە!

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە مرۆڤ ئامادەیە عەقڵ و لۆژیكی خۆی بكاتە قوربانی، نەك ئەو ئایینەی لەسەری گەورەبووە و، كاری شوشتنەوەی مێشكی لەلایەن پیاوانی ئایین و كاهینەكان بۆ كراوە.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە كە زۆربەی زانایانی ئایین و دەروون و مرۆڤناسیی نكۆڵی لەو فیترەتانەی پێشوو دەكەن، پاشان پەنا دەبەنە بەر دانانی گریمانەی هەڵە دەربارەی پاڵنەرە خودییەكانی مرۆڤ بۆ وەرگرتنی بیروباوەڕە ئایینییەكان و ئەنجامدانی پەرستشەكان بەجۆرێك یان بەجۆرێكی تر!

**١٠- ئامانجی ئامانجەکان لە بوونەوەردا**

بەڵام فیترەت بە تەنیا بەس نییە بۆ ئەوەی مرۆڤ هەموو ئامانجەکانی پشت دروستبوونی بزانێت، لێرەدا رۆڵی ئەو عەقڵە دەردەکەوێت کە خودا دەیدوێنێت تا مەبەست و ئامانجەکانی بەدیهێنانی دیاری بکات و، لەو فەرموودەیەی پەروەردگاردا کورتکراوەتەوە، کە دەفەرموێت:

﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ... ﴾ الاسراء ٢٣

خودای پەروەردگار فەرمانی داوە هەر ئەو بپەرستن و، عیبادەت بۆ کەس مەکەن بۆ ئەو نەبێ.

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦

من جنۆکەو ئادەمزادم بۆ هیچ دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێ کە بمپەرستن.

مەبەستی بەرزی پەرستنیش بریتییە لەناسینی تەواوەتیی خودا.

خودا لەڕێی پێغەمبەرانەوە ئامانجی دروستبوون بە مرۆڤ دەگەیەنێت.

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾ النساء: ١٦٥

ئەم پێغەمبەرانە کە خودای گەورە ناردوونی هەموویان موژدەیان داوە بە خاوەن باوەڕان کە پاداشتیان باش ئەبێ و، هەڕەشەیان کردووە لە بێ باوەڕان و ترساندوونیان بە سزای توند و تیژ لە ڕۆژی قیامەتدا. ئەم پێغەمبەرانە بۆیە بەم حاڵەوە نێرران بۆ لای خەڵك تا لە ڕۆژی داددا کە حیساب و کیتابیان لە گەڵ ئەکرێ قسەیان لەسەر خودا نەمێنێ و بەهانەیان ببڕێ و نەڵێن ئێمە لە دنیادا کەس ئاگاداری نەکردووین. خودا بەهێزەو کارەکانی پڕ حیکمەتن.

**١١- تەكلیف و تاقیكردنەوە لەچوارچێوەی توانای مرۆڤدان**

﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْۚ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴿٢٨﴾ ﴾ النساء: ٢٨

خودا ئەیەوێ باری سەرشانتان سووك بكا، بەڕاستی ئینسان بە بێهێز و كەم توانا دروست كراوە، ئەگەر حوكمەكان سووك نەبن پێی هەڵناگیرێن.

تەنانەت كاتێك هەندێك لە مسوڵمانان هەستییان بە قورسی تەكلیفەكان كرد، خودا حوكمی سوككردنی ناردەخوارەوە:

﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ ﴾ البقرە: ٢٨٦

خودا لە هەر نەفسێك هەر ئەوە داوا ئەكات كە لە توانایا هەیە.

**١٢- تاقیكردنەوەیەك كە بە مردن كۆتایی دێت و، لە یەك خول دایە**

تاقیكردنەوە واتا رووبەڕوو كردنەوەی مرۆڤە بە چاكە و خراپە لەژیانی دنیادا تا دەری خەین ئاخۆ كامەیان دەگرینە بەر:

﴿ كُلُّ نَفۡسٍ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةًۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الأنبياء: ٣٥

هەموو گیانلەبەرێ مەرگ ئەچێژێ و، ئێمە بە خراپە و بە چاكە تاقیتان ئەكەینەوە بۆ دەركەوتنی هەڵوێستتان لە خۆشی و لە ناخۆشیداو، سەرەنجامیش ئەگەڕێنرێنەوە بۆ لای خۆمان و، هەر كەس پاداشی شایانی خۆی وەرئەگرێ.

﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ ﴾ الملك: ٢

ئەو خوایەی مردن و ژیانی درووستكردووە تا ببینێت كامەتان باشترین كردار ئەنجام دەدەن.

بواری دەرفەتێكی تریش نییە.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ المؤمنون: ٩٩ - ١٠٠

هەر کام لەم کافرانە هەر لەسەر پێودانە ئەڕوا تا کاتێ کە مەرگ لەپڕ دێتە سەر یەکێکیان پەشیمان ئەبێتەوە لە کردارو گوفتاری بەدی خۆی و ئەڵێ: خوایە بمگێڕەوە بۆ ژیان...بە هیوای ئەوەی کردەوەیەکی چاك بکەم لەگەڵ ئەو باوەڕەدا کە کاتی خۆی تەرکم کردبوو، واتە باوەڕ بە خوای تەنیاو بێ هاوبەش بکەم و کردەوەی چاکیش لەگەڵ باوەڕەکەم بکەم. نەخێر ئەمە نابێ و، ئەم قسەیەی ئێستە ئەیکا قسەیەکی ڕووتە ئەیڵێ و بەدەمیا دێ و بەڕاستی نییە و ئەگەر بگێڕرێتەوە بۆ ژیان هەر لەسەر پێودانەکەی جارانی ئەڕوا و، ئەمانە عالەمێکی بەرزەخی نێوان مەرگ و زیندووکردنەوەیان لە پێشە، تا ئەو ڕۆژەی لە قیامەتا زیندوو ئەکرێنەوە درێژە ئەکێشێ.

جارێکی تر ئەوە دڵێین کە زانینی مەبەستەکانی پشت درووستبوونی مرۆڤ و تاقیکردنەوەی، کێشەی خراپە و ئازار چارەسەر دەکات کە فەیلەسووفەکانی تووشی سەرلێشێوان کردووە و، زۆریانی تووشی بێباوەڕیی کردووە.

**١٣- رزگاربوونی مرۆڤایەتی**

ژیانی مرۆڤ بوونێکی بەیەکەوەبەستراوی نەمرە، چونکە مردنێك بە مانا باوەکەی لە گوڕێدا نییە، بەڵکو گواستنەوەیە لە بوونێکەوە بۆ بوونێکی تر، کە ساتی مردن لە نێوانیان دایە. ئەمەش هەستێکی فیترِی ترە! کە ئایینەکان لەسەری کۆکن و لەوەدا خۆیدەنوێنێت کە دەروونی مرۆڤایەتیی ئەوە رەتدەکاتەوە کە سەرەنجامی بەرەو نەبوونی بڕوات.

﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ

ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ ﴾ الواقعه: ٨٣ - ٩٤

دەی بۆچی لەو کاتەدا کە گیانی نەخۆشی حاڵی سەرەمەرگ ئەگاتە قورگی و ئەوەندەی نەماوە دەرچێ. ئێوەش لەو کاتەدا بە دەوری کابرادان سەیر ئەکەن وا خەریکە گیانی دەرئەچێ. ئێمەش لەو کاتەدا لە ئێوە نزیکترین لە کابرای حاڵی سەرەمەرگەوە، بەڵام ئێوە چاوتان لێ نییە. بۆ ئێوە ئەگەر لە ژێر دەسەڵاتی خوادا نین و ئینکارکردنەکەیتان ڕاست و بەجێیە، بۆ گیانی کابرای حاڵی سەرەمەرگ ناگێڕنەوە بۆ جێی خۆی و مەنعی مردنی لێ ناکەن و چاکی ناکەنەوە، ئەگەر ڕاست ئەکەن؟ بەڵام وا نییە کە ئێوە ئیدديعا ئەکەن و نەخۆشی حاڵی سەرەمەرگ، ئەو جارە بێ یا جارێکی تر بێ، هەر ئەمرێ. جا کە مرد ئەگەر لەوانە بوو کە بە کرداری چاکی دنیایان لە خواوە نزیکن. ئەوە ئەنجامی حەسانەوەو ڕزق و ڕۆزیی پاك و خۆشی و بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتە. ئەگەریش لەوانە بێ کە دەفتەری کرداریان ئەدرێتە دەستی ڕاستیان، ئەوە پێی ئەوترێ: ئەی ئەو کەسەی دەفتەری کردارت دراوەتە دەستی ڕاستت، سەڵامی خوات لێ بێ لە هەموو ئەو برادەرانەتەوە کە دەفتەری کرداریان دراوەتە ڕاستیان. خۆ ئەگەر لەوانەیش بێ کە خواو پێغەمبەران و قورئان و ڕۆژی قیامەت بە درۆ ئەخەنەوەو بە درۆیان دائەنێن و ڕێی ڕاستیان ون کردووە. ئەوە خۆراکی بۆ ئامادەکراوی پێشوازی لێ کردنی ئاوی کوڵ بە کوڵە. لەگەڵ فڕێدانە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

## ١٤- کۆتـــــایی

مرۆڤ کۆشش دەکات بۆ رۆیشتن بەرەو خودا، بە کردنی چاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپە، چونکە ئەمە ڕێگای رزگاربوون و گەیشتنە بە خودا و، ئەوەیە ئەنجامی حەتمی قۆناغەکانی گەشتی رابروو.

﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ ﴾ النجم: ٤٢

ئەنجامی کاریش بۆ لای خوای خۆت ئەگەڕێتەوەو،

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ٦ ﴾ الانشقاق: ٦

**تۆ ئەی ئادەمزاد لەو ڕۆژەدا بە پەلە ئەڕۆی بۆ لای خوای خۆت و پێی ئەگەی.**

خودا ئەوە دووپات دەکاتەوە کە لە گۆڕانکارییەکانی و خۆشیی و ناخۆشییەکانیدا بەرەو لای ئەو دەڕوات، خۆی هەستی پێبکات یان نا، ئەوەی هەستی پێناکات وا تێدەگات چاکەکارییەکانی تەنیا بەپێروەچوونی فیترەتی ئەخلاقییە.

ئەمەیە چیرۆکی بوونی مرۆڤایەتیی بەو شێوەیەی قورئانی پیرۆز دەیخاتەڕوو، بە لایەنە بینراو و غەیبییەکانییەوە دەگاتە پێگەی راستی زانستی رەها. کە پێشتر بەڵگەی ماددی و عەقڵیمان لەسەر هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی خستەڕوو.

**خـــوێنەری بەڕێز...**

گفتوگۆکەمان لەسەر دیدی ئیسلامە لەبەرامبەر پەیوەندی نێوان مرۆڤ و ئایین لە هەمبەر فیترییەتی هەست کردن بە بوونی خودا، پاشان وەحی دێت عەقڵ دەدوێنێت تا سەرەتا ئەو راستییە دووپات بکاتەوە، پاشان رۆڵی مرۆڤ لە بووندا روون بکاتەوە.

**لەگەڵ سوورەتی (النور):**

لەوانەیە باشترین قسە کە لە بارەی بەیەکگەیشتنی وەحی و فیترەت کراوە، ئەوە بێت کە دکتۆر فاروق دسوقی لە کتێبەکەیدا (القضاء والقدر في الإسلام) دا باسی کردووە و، هەندێك لەقسەکانی لێرە دەخەینەڕوو لەبارەی واتای ئایەتی ٣٥ی سورەتی (النور):

﴿ ۞ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ٣٥ ﴾ النور: ٣٥

خوا ڕووناکیی ئاسمان و زەوییە. نموونەی ڕوناکیی ئەو وەك ڕووناکیی تاقێکی بێ کەلێنە چرایەکی داگیرساوی تیا بێ و، چراکە لە بلوورێکا بی و بلوورەکە وەك ئەستێرەیەکی درەخشان وابێ، چراکە لە ڕۆنی دارێکی پیرۆز داگیرسا بێ کە دار زەیتوونێ بێ نە ڕۆژهەڵاتی بێ و نە ڕۆژئاوایی بێ کە هەرگیز خۆر لێی نەدا، بەڵکو بە درێژایی ڕۆژ خۆر لێی بدا، لەوانە بێ ڕۆنەکە هەڵبگیرسێ با ئاگریشی لێ نەکەوێ، پرتەوی چراکە لەسەر پرتەوی بلوورەکە بێ. خوایش ئارەزووی لە ڕێپیشاندانی هەر کەسێ بێ ڕێی پیشان ئەدا بۆ لای ڕووناکی خۆی. خوا نموونە ئەهێنێتەوە بۆ خەڵك تا لە شت حاڵی ببن و، زانایە بە هەموو شتێ.

دکتۆر دسوقی قسەی ئوبەی کوری کەعب[1] دێنێتەوە کە گووتوویەتی: خودا نووری بە خوودی خۆی دەستپێکردووە، پاشان ئەو نوورەی خستوویەتییە دڵی باوەڕدارەوە و، چوواندوویەتی بەو گڵۆپەی لە ناو شووشەیەکی روون و پاکدایە.

دکتۆر فاروق دسوقی دەڵێت: ئەو نوورە لە دەرەوە نایەت، چونکە ڕۆنە درەوشاوەکە لە زەیتوونێکی دەرەوەی جیهانی ئێمەیە (لا شرقية ولا غربية)، ئەویش نووری فیترەتە کە خودا خستوویەتیە دڵی مرۆڤەوە. نووری فیترەت بە تەنیا بەسە بۆ ڕێنموونی کردنی مرۆڤ بەرەو خودا (يكاد زيتها يضيىء) هەتا ئەگەر پەیامە ئاسمانییەکانیشی پێ نەگات (ولو لم تمسسه نار). خۆ ئەگەر وەحی پێ بگات، کە نوور لەسەر نوورە (نور على نور)ئەوا یەقینێکی وا لەدەروونda درووست دەبێت کە هیچ یەقینێکی پێناگاتەوە.

**لەگەڵ باوکی پێغەمبەراندا...**

لەژێر ڕۆشنایی ئەم چەمکەدا، د.فاروق دسوقی لە هەڵوێستی باوکی پێغەمبەران ئیبراهیم - سەلامی خوای لەسەربێت - رادەمێنێت هەروەك لە سوورەتی (الانعام)دا هاتووە:

---

(١) ابن القيم الجوزية: مختصر الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة ص٣٦٦.

﴿ ۞ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾ الأنعام: ٧٤ - ٧٩

ئەوەیان بۆ باس بکە کە چۆن وەختی خۆی ئیبراهیم بە ئازەری باوکی وت: ئەوە بۆچی ئەو بتانە ئەپەرستی و بە خودایان حیساب ئەکەی؟! کاری وەها کەی ڕەوایە؟ بە ڕاستی من وا ئەزانم و دڵنیام کە تۆش و قەومەکەیشت ڕێگاتان لێ تێکچووەو لە گومڕاهییەکی ئاشکرادان.

ئا وەها دەلیلی خودایەتیی خوداو پەروەردگاریی ئەو بە ئیبراهیم پیشان ئەدەین، کە خودا خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە. تا بە تەواوی یەقین پەیدا بکات بەوەی باوەڕی پێیەتی و خەڵکی بۆ بانگ ئەکات، چونکە ئینسان تا باوەڕو یەقینی بە شتێ نەبێ ناتوانێ خەڵکی بۆ بانگ بکات. کە باوکی بەجێهێشت و نەفرەتی لە بتەکانی ئەکرد و بەدوای ڕاستیدا ئەگەڕاو شەوی بەسەردا دەهات، ئەستێرەیێکی گەشی جوانی دی، وتی: ئەمەیە پەروەردگاری من، بەرزەو دەس پێ نەگەییوەو، ڕووناك و ورشەدارە! کە ئەستێرەکە ئاوا بوو و شوێنەواری نەما وتی: من شتی ئاوابووم خۆش ناوێ، شتێکم خۆش ئەوێ هەمیشەیی بێ.

جا کە مانگی دی هەڵهات و ڕووناکی پەخش کردەوە وتی: ئەمەیە خودای من و پەروەردگاری من . کە ئەمیش ئاوا بوو وتی: ئەمە چییە؟ بەڕاستی ئەگەر خودا نەمخاتە سەر ڕێگای ڕاست و بەرچاوم ڕوون نەکاتەوە ئەچمە ریزی گومڕایانەوە. ئەمجارە کە خۆری پڕتەوداری دی هەڵهات و جیهانی پڕکرد لە

تین و ڕووناکی، وتی: ئا ئەمەیە خودای من ئەمە لەوانی تر گەورەترە. کە ئەمیشی دی ئاوا بوو و، لەبەر چاو ون بوو، وتی: ئەی خێڵەکەم ! من دوورم لەو شتانەی کە ئێوە کردووتانن بە هاوبەشی خودا. بێ گومان وا من ڕووم کردە ئەو پەروەردگارە بێ وێنەیە کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووەو، لە نەبوونەوە هێناونیەتە بوون. من لەوانە نیم هاوبەش بۆ خودا دائەنێن، خودا تاك و تەنیایە.

ئیبراهیم - سەلامی خوای لێبێت - دژی بتەکان بوو و باوەڕی بە فیترەتی خۆی هەبوو (بەبێ هیچ بەڵگەیەك) لەسەر بوونی بەدیهێنەرێکی گەورەی ئەم گەردوونە، پاشان دەستیکرد بەگەڕان بە دوای ناسینی و، هەر کاتێك عەقڵی بۆلای ئەوەی دەبرد کە شتێك بکاتە خودا، بە فیترەت و عەقڵ ڕەتیدەکردەوە، هەسارەکان و مانگ و خۆری ڕەتکردەوە. تا لە کۆتاییدا بە باوەڕبوون بە خودای بەدیهێنەری گەردوون و بوونەوەر کۆتایی هات.

ئا لەو کاتەدا ئیبراهیم - سەلامی خوای لێبێت - بەرەو خودا دەڕوات و دەفەرمووێت (ئەگەر خودا ڕێنموونیم نەکات ئەوا لە سەرلێشێواوان دەبم) هەروەها ڕایگەیاند (ئەی گەلەکەم من بەریم لەوەی بۆ خوداتان کردۆتە هاوبەش). بێتوانا بوو لەوەی بگاتە تەواوەتیی ناسینی خودا لە ڕێی عەقڵەوە، بۆیە هەستی بەوە کرد کە پێویستی بە یارمەتی خودایی هەیە بۆ ئەوەی ناوو سیفاتەکانی بزانێت و، بگاتە ڕاستییەکانی گەردوون و حیکمەت لە درووستکردنی خەلق و، ڕاستییەکانی غەیب و، چۆنیەتی نزیکبوونەوە لە خودا و پەرستنی.

## گەشتەکە تەواو دەکەین: پەیڕەو...

ئەگەر باوکی پێغەمبەران، ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێت، زۆری چەشتبێت لە گەشتەکەیدا بەرەو خودا، ئەوا ئێمە لەو شوێنەوە دەستپێدەکەین کە ئەو لێی کۆتایی هاتووە.

خودا وای ویستووە کە لە کاتێکدا هاتووینەتە دنیا کە ڕووناکی وەحی بۆ داگیرساندووین، ئێستا ڕۆڵی ئێمە تەنیا بەکارهێنانی عەقڵە بۆ بەڵگە و ئایەتەکانی ئایین:

ئایەتە خوێنراوەکانی خودا: قورئانی پیرۆز.

ئایەتە بینراوەکانی خودا: ئاسۆکان و دەروون و گیانەکان.

لە باسی هەشتەمدا، لەژێر ناونیشانی (بێباوەڕیی لەخراپترین دۆخیدا-دەیەم) ئەو ڕێبازەمان ڕوونکردووەتەوە کە دەتوانین لە ڕێیەوە بگەین بە خودا، ئەو خودایەی چاوەکان دەرکی پێناکەن و، هیچ شتێك وەك ئەو نییە.

سێ وشە هەن کە ڕێگای ڕزگاریمانن: فیترەت - عەقڵ - وەحی.

پاکیی و بێگەردیی بۆ ئەو خودایەی بۆ نووری خۆی ڕێنموونیی کردین... ئیتر نوور لەسەر نوور...لەسەر نوورە.

## باسی دەیەم : لەنێوان دوو وەحیدا حەیی کوڕی یەقزان



چیرۆکی حەیی کوڕی یەقزان بە یەکێك لە بەناوبانگترین ئەو چیرۆکانە دادەندرێت کە عەقڵی عەرەبی مسوڵمانی پێوە سەر قاڵ دەبێت، چونکە ئەو چیرۆکە ڕەواجێکی گەورەی هەیە لە نێوان فەیلەسووفەکان و ئەهلی تەسەووف و عاشقانی ئەدەبی عەرەبی[1].

چیرۆکی حەیی کوڕی یەقزان کە فەیلەسووفی ئەندەلووسی ئیبن تو‌فەیل نووسیویەتی[2]، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دەیەمی زایینی، واتە هەشت سەدە پێش ئەنتۆنی فلو.

ئەگەر ئەنتۆنی فلو گەشتەکەی لە بێباوەڕیەوە بۆ بوونی خودا بە (گەشتی عەقڵ) وەسف بکات، ئەوا چیرۆکی (حەیی کوڕی یەقزان)یش بە هەمان شێوە بوو، چونکە لە چیرۆکەکەدا ئیبن توفەیل ئەوە دەخاتە ڕوو کە چۆن عەقڵی فەلسەفی موسوڵمان گەیشتۆتە بوونی خودای بەدیهێنەر و هەندێك لە سیفاتەکانی خودا. تەنانەت ئەوەشی لە گەشتی ئەنتۆنی فلو زیاتر بوو کە پەیوەندی نێوان خودا و مرۆڤیشی دیاری کردووە. هەروەك چۆن چیرۆکەکە بەراوردێك دەکات لە نێوان ئەوەی عەقڵی داماڵراو لە ئارەزوو پێیگەیشتووە لەگەڵ وەحی ئاسمانیدا.

---

(١) چیرۆکەکە (بەشێوەی جیا جیا) چوار جار نوسراوە. یەکەمیان لەلایەن ئیبن سینا، پاشان لەلایەن شەهابەدین سەهرودی. پاشان دوای نزیکەی سەدەیەك لەلایەن ئیبن نەفیس. جاری چوارەمیش (کە بەناوبانگترین

(٢) ئەبوبەکر محەمەدی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی محەمەد کوری توفەیل، فەیلەسووفی ئەندەلووسی (٥٠٤ - ٥٨١ك) = (١١٠٥ - ١١٨٥ز) .

لێرەدا بە کورتی و سادەیی لە کتێبی (داستانی ئیمان)[1] ی شێخی فەیلەسووف نەدیم ئەلجیسر موفتی تەڕابلووسی لوبنان وەردەگرین، کە کتێبەکە لەسەر شێوەی گفتوگۆ لە نێوان شێخ (مەوزون) کە لە ڕاستیدا ئاماژەیە بۆ نووسەری کتێبەکە لەگەڵ قوتابیەکەی کە بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێت بەناوی (حەیران کوڕی ئەزعەف) نووسراوە.

شێخ مەوزون بە حەیرانی قوتابی دەڵێت:

لە چیرۆکی (حەیی کوڕی یەقزان) جگە لە ناوی پاڵەوانەکەو شانۆی ڕووداوەکان هیچی خەیاڵی بوونی نییە، ئەگەر ناوونیشانی چیرۆکەکە بگۆڕین بۆ (عەقڵ) و ئەو دوورگە دوورەی ئەو ڕووداوانەی تێدا گوزەراون بگۆڕین بۆ ئەو جیهانەمان، ئەوا چیرۆکەکە دەبێتە واقیعی و هیچ شتێکی خەیاڵی تێدا نامێنێت.

حەیران: ئەمە چۆن گەورەم؟

شێخ: لە ڕاستیدا چیرۆکەکە (گەشتی عەقڵ)ە لە هەر کات و شوێنێکدا، کاتێك لە ڕێگاکانی زانست و قۆناغەکانی فەلسەفەدا بەرزدەبێتەوە، تا خوداو حەق و چاکە و جوانی دەناسێت.

پێش ئەوەی باسی چیرۆکەکەت بۆ بکەم حەیران، گرنگترین ئەو چەمکانەت بۆ ڕوون دەکەمەوە کە ئیبن توفەیل ویستوویەتی لە ناو چیرۆکەکەیدا بیانگەیەنێت. ئیبن توفەیل لە چیرۆکەکەیدا ویستوویەتی ئەم چەمکانە ڕوون بکاتەوە.

ا- عەقڵی مرۆڤ، لە پلیکانەکانی زانیاریدا سەردەکەوێت، لە (شتە بەرجەستە بچووکەکانی دەوروبەرمان) تا دەگاتە (بیرۆکە گشتیەکان). وەك ئەوەی لە ڕێی ئەو هەڵوێستە جۆراوجۆرانەی لە ژیاندا دێنە پێشەوە، بگەینە ئەوەی کە خودایەك هەیە.

ب- عەقڵی مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە، کە بەبێ فێربوون و بەبێ ڕێنموونی بگاتە بوونی خودا، لە ڕێی شوێنەواری خودا لە بووندا، توانای ئەوەی هەیە، کە بەڵگەی ڕاستەقینەش لەسەر ئەوە بێنێتەوە.

---

(١) کتێبی داستانی ئیمان کراوەتە کوردی و لەلایەن نووسینگەی تەفسیر چاپ کراوەو بڵاوکراوەتەوە.

ج- ئەم عەقڵە، قابیلی ئەوەیە کە لە بەرامبەر وێناکردنی هەندێك چەمکدا بێتوانا بێت، وەك ئەزەلیەتی ڕەهاو، نەبوونی ڕەها و، بێ کۆتایی و، کات و، قەدیمی و، داهێنراو. هەرچەندە عەقڵ دەتوانێت لەڕێی بەڵگەی لۆژیکی لەو چەمکانە تێبگات. ئەمەیە کە فەیلەسووفەکان ناوی دەنێن بە: جیاوازی نێوان وێناکردن( تصور) و عەقڵ پێشکان ( تعقل) و دەرك پێکردن (ادراك).

د- جیاوازی نییە ئەگەر لەلای عەقڵ قەدیمی جیهان (کە ئەزەلییەو سەرەتای نییە) ڕاست بێت یان درووستبوونی (کە سەرەتایەکی هەبێت)، ئەوا بە هەر دوو باردا ئاماژەیە بۆ بوونی خودا.

هـ- مرۆڤ بەعەقڵی توانای دەرککردنی هەیە بە بنەماکانی چاکەو بنچینەکانی ڕەوشتی کردەیی و کۆمەڵایەتی، بە هەمان شێوە توانای ئەوەی هەیە کە ئارەزووکانی لاشەی بخاتە ژێر کۆنترۆڵی عەقڵییەوە، بەبێ پشتگوێ خستنی مافی لاشە یان زێدەڕۆیی تێدا کردن.

و- ئەوەی عەقڵی ساغ دەرکی پێدەکات ( بەبێ وەحی ئاسمان) لەگەڵ مەنهەجی ئیسلامدا بە یەك دەگەن لەچەند خاڵێکی وەك یەك بەبێ جیاوازی.

پاشان شێخ مەوزون دەستدەکات بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە بۆ حەیرانی قوتابی: ئیبن توفەیل، منداڵێکمان بۆ وێنادەکات کە شیرەخۆرەیە و ناوی (حەیی کوڕی یەقزان)ە، کە فڕێدەدرێتە دوورگەیەك کە کەسی تێدا ناژی، لەو کاتەدا ئاسکێك کە بەچکەکەی لەدەستداوە بەزەیی پێدا دێتەوەو، شیری پێدەدات و بەخێوی دەکات، تا گەورە دەبێت و دەنگ و زمانی گیانداران فێر دەبێت.

منداڵەکە دەبینی ئاسکەکە داپۆشراوە و ئامرازی خۆپاراستنی هەیە، ئەویش ڕووت و بێ ئامرازە، بۆیە لە گەڵاو پەڕ پۆشاکێکی بۆ خۆی درووستکرد و گۆچانێکیشی کردە ئامرازی خۆپاراستن.

پاشان ئاسکەکە مرد، بێدەنگیەکەی و بێ جووڵەییەکەی منداڵەکەی تووشی ترس کرد و، هەوڵیدەدا بزانێت هۆکارەکەی چییە. چەندی لێی وردبووەوە هیچ

گۆڕانکارییەکی لەشێوەیدا بەدی نەکرد، بۆیە گومانی کرد کە دەردەکە لە ئەندامێکی شاراوەدا بێت. بۆیە سنگی لەت کرد تا گەیشتە دڵی، لەوێشدا هیچ نەخۆشییەکی بەدی نەکرد، بەڵام هەستی کرد کە بەشی لای چەپی دڵ بەتاڵە، بۆیە گومانی برد کە ئەو شتەی پێشتر لەو شوێنەدا بووە نەماوە، هۆکاری گیان لەدەستدانی ئاسکەکەیە، بۆیە گەیشتە ئەوەی کە ڕاستی ئاسکەکە شتە ڕۆشتووەکەیە و لاشە جگە لە ئامرازێك هیچی تر نییە و، دوای ئەوەی هەستی دەکرد کە لاشەکەی وردە وردە خەریکە بۆگەن دەبێت زیاتر لەوە دڵنیا بووەوە. پاشان قەلەڕەشێکی دی کە خەریکە برا مردووەکەی دەشارێتەوە، ئەویش لەوەوە فێر بوو و ئاسکە مردووەکەی شاردەوە.

پاشان ئاگری دۆزیەوە و بۆ ڕووناکی و خۆگەرمکردنەوەو و گۆشت برژاندن بە کاری هێنا. تا دەهات زیاتر بەتوانا سەرسوڕهێنەرەکانی ئاگر سەرسام دەبوو. ئەوەی بەبیردا هات کە دەکرێ ئەوەی لە دڵی ئاسکەکەدا نەماوە و بۆتە هۆی مردنی شتێك بێت لە ڕەگەزی ئاگربێت، بۆیە دەستی کرد بە تاقیکردنەوەی شوێنەوارەکانی ئاگر بە شیکردنەوەی لاشەی ئاژەڵان و، بەمەش شارەزاییەکی باشی لە فەرمانی ئەندامە جیاوازەکانی ئاژەڵان پەیداکرد.

کاتێك گەیشتە تەمەنی بیست و یەك ساڵی، دەستیکرد بە بیرکردنەوە لە گەردوون و، ئەو ئاژەڵ و ڕووەك و شتە بێ گیانانەی تێیدا دەژین و، شارەزایی دەربارەی خاسیەت و کردار پەیدا کرد و، بیرۆکەی (زۆریی) لە هزردا درووست بوو.

پاشان بۆی دەرکەوت کە هەرسێ بونەوەرەکە (زیندەوەر - ڕووەك - بێ گیان) لە سیفەتی (بوون) و (لاشە)دا هاوشێوەن ئەگەر چی لە (وێنە) شدا جیاوازبن.

بۆیە بۆی دەرکەوت کە هەمویان یەك شتن ئەگەرچی زۆر و جیاوازیش بن.

هەروەها بیرۆکەی ( حەقیقەتی شتێك و وێنەکەی )شی لە هزردا درووست بوو.

پاشان گەڕایەوە بۆ لای تەنە سادەکان، بینی کە وێنەکانیان دەگۆڕێت. بۆ نموونە ئاو دەکرێ وەکو شلە بێت، یان ببێتە هەڵم، یان ببێتە سەهۆڵ و پاشان

ببێتەوە بە ئاو، لەمەوە جیاوازی وێنە لە شتێکی دیاریکراودا فێر بوو. بەمەش چووە ناو سنووری جیهانی عەقڵ.

هەروەها سەرنجی ئەوەی دا کە گیانی زیندەوەران شتێکی جیاوازە لە لاشەیان، کە بەهۆیەوە لە ڕووەك و بێ گیان جیا دەکرێتەوە و، ئەو گیانەیە کە ئاڕاستەی دەکات و دەبێتە هۆی تێگەیشتن لە ناخی زیندەوەر و دەوروبەری، بەمەش پێگەی (روح)ی لەلا گەورە بوو و، بۆی دەرکەوت کە گەورەترو بەرزترە لە لاشەی فانی و لە ناوچوو.

پاشان دەستیکرد بەبیرکردنەوە لە سادەترین شتەکان، تێبینی کرد کە سادەترینیان خۆڵ و ئاو و هەوا و ئاگرە و، ئەو چوار ڕەگەزە سەرچاوەی بوونن.

هەروەها ئەوەش تێگەیشت کە هەر ڕووداوێك کە بەسەریدا هاتووە هێزێکی لە پشتەوەیەو، دانە پاڵی کردارەکان بۆلای شتەکان ڕاستەقینە نییە، بەڵکو بکەرێك هەیە کە ئەم کردارانەیان پێدەکات.

ئیتر ئارەزووی ئەوەی دەکرد کە ئەو بکەرە بناسێت، بۆیە سەرەتا لەناوشتە بەرجەستەکاندا بەدوایدا گەڕا، بۆی دەرکەوت کە هەموویان دروستکراون و پێویستیان بە دروستکەر هەیە، بۆیە هەموویانی پشتگوێ خست.

پاشان چووە سەر گەلەستێرەکان بیری لێکردەوە و پرسی: ئایا هیچ کام لەم گەلەستێرانە تا ئەندازەی بێ کۆتا درێژ دەبێتەوە، بەدرێژایی کات و شوێن؟ پاشان سەرنجی دا کە لە ڕۆژدا دیار نامێنێت و شوێنیان سنووردارە، بۆیە زانی کە تەنی بێ کۆتا لە ڕووی کات و شوێن شتێکی مەحاڵە .

پاشان بیری لە جیهان بە گشتی کردەوە، ئایا ئەم جیهانە دروستکراوە، ئایا لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون، یاخود هەر لە ئەزەلەوە هەبووە و نەبوون نەبووە؟ بەڵام هیچ کام لەو بڕیارانەی لەلا یەکلا نەبووەوە. قەدیم بوون دوورە چونکە مەحاڵە بوونەوەرێك هەبێت سەرەتای نەبێت.

بە هەمان شێوە دروستکراویش دووردەخرێتەوە، چونکە دروستبوونی بوون دوای ئەوەی نەبوون بوو پێویستی بە کاتێك هەیە کە لە پێش ئەودا هەبووبێت،

کاتیش بەشێکە لە بوون و ناکرێ پێشی بکەوێت. یەکلاکردنەوەی دروستبوون پرسیارێکی قورس دێنێتە کایەوە: بۆچی بەدیهێنەر ئێستا بوونی هێنایە بوون و پێشتر ئەو کارەی نەکرد؟ ئایا بەهۆی شتێکەوە کە بەسەر بەدیهێنەردا هاتووە؟ ئەمە چۆن لە کاتێکدا هیچ شتێك نەبوو کە بکرێ بەسەریدا بێت.

(حەیی) بیری دەکردەوە، هەریەك لەو بیرو باوەڕە چی پێویستە؟ بینی کە دروستبوونی جیهان پێویستی بە بکەرێك هەیە کە لە نەبوونەوە بیهێنێتە بوون و ناکرێ بکەرەکە تەن بێت، چونکە ئەگەر ئەویش تەن بێت ئەوا پێویستی بە بەدیهێنەرێك دەبێت، دیسان ئەگەر بکەری دووەمیش تەن بێت ئەویش پێویستی بە بەدیهێنەری سێیەم هەیە و سێیەمیش بە چوارەم و تا کۆتایی بەردەوام دەبێت و ئەمەش مەحاڵە.

ئەگەر قەدیمی جیهانیش وەربگرین، ئەمە واتای ئەوەیە کە جووڵەکەی کۆنە و، هەر جووڵەیەکیش پێویستە هێزێك هەبێت کە ئەنجامی بدات، هێزیش تێپەڕ دەبێت (یان لە دوورەوە) کار لە تەنەکان دەکات، هەروەها پێویستە پێشتر بوونی هەبوویێت و پێویستی بە بەدیهێنەر نەبێت.

دیدی (حەیی کوڕی یەقزان) بەوە کۆتایی هات کە جیهان قەدیم بێت یان دروستکراو، لە هەردوو باردا پێویستی بە بەدیهێنەرێك یان جووڵێنەرێکی قەدیم و ئەزەلی هەیە و، لەڕووی عەقڵەوە وا پێویست دەکات کە ئەو بەدیهێنەرە گەورەیە هەموو سیفەتێکی تەواوەتی هەبێت، لە زانست و تواناو ویست و هەڵبژاردن و بەزەیی و دانایی.

کاتێك ئەو ناسینەی بەدیهێنەرە گەورەکەی بەدەستهێنا، ویستی بزانێت کە چۆن ناسیویەتی، بەڵام نەیتوانی لە ڕێی هەستەوەرەکانەوە بیناسێت، چونکە هەستەوەرەکان هەست بە تەنەکان دەکەن، بەڵام بەدیهێنەر داماڵراوە لە سیفەتی بوونەوەر، بۆیە بۆی دەرکەوت کە ئەو زاتەی بە هۆیەوە خودای پێناسیوە تەن نییە..

پاشان وا تێگەیشت کە ئەو خوودە دوور لە لاشەیە لە ناو ناچێت و، تا ئەبەد دەژی، یان خۆشگوزەرانی یان سزا، بەپێی چاودێری کردنی بەدیهێنەرەکەی و

گوێڕایەڵیکردنی بەر لە مردن، بۆیە دەستیکرد بە گەڕان بە دوای ڕێگایەك کە ژیانی ڕێکبخات و بیر لەو بەدیهێنەرە گەورەیە بکاتەوە.

کاتێك سەرنجی خۆی دا، بینی کە هەندێك سیفەتی ئاژەڵیی تێدا هەیە، لاشەی ماددییەکەی، کە داوای ئارەزووە هەستییەکانی لێ دەکات. هەروەها زانی کە ئەو لاشەیە بێهوودە دروست نەکراوە، بەڵکو پێویستە لە سەری کە پەروەردەی بکات. هەروەها بینی کە لەلایەکی ترەوە لە ئەستێرەکان دەچێت، بەو پێیەی کە تەنەو لاشەی هەیەو، وای هەستکرد کە لە ئاسماندا لە بەدیهێنەرەوە نزیکە. لەلایەکی تریشەوە بەشە پاکەکەیشی، کە بەهۆیەوە (بەدیهێنەری واجب الوجود )ی ناسیوە لەو بەدیهێنەرە دەچێت، کەواتە لە (ئاژەڵ - ئەستێرە - خودا ) دەچێت.

بۆیە لە بەدەستهێنانی هۆکاری لاشەپارێزی و پێویستی مانەوەیدا خۆی بە ئاژەڵ چواند و، تەنیا ڕووەکی دەخوارد و، ئەگەر ڕووەکیش نەبوایە لە ئاژەڵان خواردنەکەی دابین دەکرد، بەو مەرجەی کە پارێزگاری لە مانەوەی تۆوی ڕووەك بکات و لە ئاژەڵانیش ئەوانەی هەڵدەبژارد کە ژمارەیان لە هەمووان زیاترە تا لە ریشەوە لەناویان نەبات.

هەروەها لە ڕوونی و ڕووناکی و پاکیدا و لە بەخشینی ڕووناکی و گەرمیدا خۆی دەچواند بە خولگە و ئەستێرەکانی ئاسمان، بەو پێیەش کە لە( واجب الوجود ) نزیکە و، بە دانایی ئەو و بەویستی ئەو دەجوڵێت. بۆیە لەسەر خۆی پێویست کرد کە خۆی پاك ڕابگرێت لە ڕووی لاشەیی و، لە ڕووی دەروونیش هەر خاوەن پێداویستییەك یان نەخۆشییەك لە ئاژەڵ و ڕووەك ببینێت هەوڵ بدات یارمەتی بدات، هەر چاوی کەوتە سەر ڕووەکێك کە خۆری لێنەدات، یان ڕووەکێکی تری پێوە نووسابێت و ئازاری بدات، یان تینوو بێت و خەریك بێت لە ناو بچێت، چارەسەری کرد. یان چاوی کەوتبایە سەر ئاژەڵێك کە دڕندەیەك ئازاری بدات یان دڕکێکی پێوە نوسابێت یان تینوو یان برسی بێت، یارمەتی دەدا. یان بینیبای ئاوێك کە بۆ ڕووەك یان ئاژەڵ دەچوو و ڕێی گیرابا لایدەدا. هەروەها خۆی ناچارکرد کە وەك ئەستێرەکان بە شێوەی بازنەیی بجووڵێت و، لە

دوورگەو کەنارەکان و ماڵەکەیدا بە ڕۆشتن یان ڕاکردن بڕوات. لەو کاتەشدا هەر بیری لە( واجب الوجود ) دەکردەوە و هەوڵی دەدا کە خۆی لە جیهانی هەستەکان داببڕێت، بۆ ئەوەی بتوانێت (واجب الوجود ) ببینێت.

بۆ پرسی لە خودا چوونیش، حەیی کوڕی یەقزان وای دەبینی کە پێویستە زانست لە سیفاتی خودا وەربگرێت، کە بەرزترین ئاستی زانستیش ناسینی خودایەو هاوەڵی بۆ دانەنێت. هەروەها پێویستە خۆی لە تەن و لاشەیی پاك بکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستەش خۆی لە خواردن و خواردنەوە دەگرتەوە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ و، لەو ماوەیەدا خۆی تەرخان دەکرد بۆ بیرکردنەوە لە خودا، ئیدی چەند رۆژێك تێپەڕبوون ئەو لەو حاڵەتە دابوو کە وەك بێهۆش کەوتن وابوو.

پاشان ئیبن توفەیل لە چیرۆکەکەیدا دەچێتە سەر وەسفکردنی دوورگەیەکی نزیك لە دوورگەی حەیی کوڕی یەقزان، کە گەلێکی تێدا هەبووە هەندێکیان مسوڵمان بوون و گەنجێکیان تێدا هەبووە بە ناوی (ئەبسال) .

ئەبسال چوو بۆ ئەو دوورگەیەی کە حەیی کوڕی یەقزانی لێبوو، تا لە خەڵك دوور بکەوێتەوەو خۆی بۆ پەرستن تەرخان بکات، کاتێك حەیی گوێی لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و نوێژ و ویرد و دوعاکانی بوو زانی کە خواناسە، ئەگەرچی لەوەش تێنەدەگەیشت کە دەیگووت.

ئەبسال حەیی فێری قسەکردن کرد و، حەیی بەسەرهاتی خۆی بۆ هاوڕێ نوێکەی گێڕایەوە، کە چۆن بیرکردنەوەی خۆی بەرزکردۆتەوە تا گەیشتۆتە ناسینی خودای مەزن، بۆیە کاتێك ئەبسال لە زاری حەیی گوێی لە وەسفی خودا بوو، هیچ گومانی لەوە نەما کە هەموو ئەوەی لە بیروباوەڕیدا هاتووە، حەیی بە عەقڵ و کۆششکردن پێی گەشتووە، بۆیە کاتێك ( ئەبسال) ئەوەی لە بیروباوەڕیدا هاتووە بە حەیی ڕاگەیاند، حەیی بینی کە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەوەی کە خۆی پێی گەشتووە، بۆیە بۆی دەرکەوت کە ئەوەی ئەم ئایینەو ئەو پێغەمبەرە هێناویەتی لەلای خوداوەیە، بۆیە باوەڕی پێهێناو پاشان فێری ئایین بوو و پێیەوە پابەند بوو.

حەیی لەگەڵ ئەبسالی هاوڕێیدا لە دوورگە دابڕاوەکەدا مانەوە و خەریکی خواپەرستی بوون تا کاتی مردنیان.

**خــوێنەری بەڕێز..**

بەم جۆرە حەیی کوڕی یەقزان بە فیترەت و عەقڵی گەیشتە بوونی خودا و، بۆی دەرکەوت کە بەدیهێنەری گەردوونە و، لە ڕووی - عەقڵییەوە - پێویستە هەموو سیفەتێکی تەواوەتی هەبێت و - بە پێی توانا - فێربوو کە چۆن لە خودا نزیك بێتەوە..

پاشان حەیی ئەوەی پێگەیشتبوو لە پەیامی پێغەمبەردا دۆزییەوە، بەمەش عەقڵ و نەقڵ لەلای ئەو بە یەك گەیشتن و بووە خاوەنی هەردوو وەحیەکە؛ وەحی عەقڵ و وەحی ئاسمان.

بەم شێوەیە گەشتی (حەیی) بەرەو خودا کۆتایی هات و، باوەڕی بە پەیامەکان و حەشر و حیساب هێنا، ئا ئەمەیانە کە ئەنتۆنی فلو و لایەنگرانی ئایینی سرووشتی نەیانتوانیوە پێی بگەن.

بە ڕاستی نوور لەسەر نوورە: وەحی و عەقڵ لە چیرۆکی ئیبراهیم (سەلامی خودای لێبێت).

**نوور لە سەر نوورە: وەحی و فیترەت.**

**لەم سەردەمەشدا خودا نوری زانستی پێبەخشیوین تا گەشتی ئیمان لە تەواوەتیدا نوور لە سەر نوور لە سەر نوور بێت.**

**بەرهەمی گەشتەکە :**

گومان لەوەدا نییە کە (گەشتی عەقڵ) لەگەڵ بێباوەڕی و خوایەتی و ئایینەکاندا، لەگەڵ فیترەت و وەحی و بەڵگەکاندا، گەشتی هەموو مرۆڤێکە کە کار بە مێشکی بکات، هەر مرۆڤێك کە بیر لە سەرچاوە و ژیان و سەرەنجامی خۆی بکاتەوە.

هەموو خاوەن عەقڵێك زۆرێك لەو پرسانەی باسمان کردن بە بیریدا دێن، جا پاشخانێکی ئایینی هەبێت یان بێباوەڕیی، جا یان ئەوەتا مرۆڤ بە خێرایی بەڕەی ئەو پرسانە هەڵدەداتەوە، یان ئەوەتا بە بیرکردنەوەو تێڕامانەوە لە سەریان دەوەستێت، یان ویستێکی گەرمی بێ بەرگە پاڵی پێوە دەنێت بۆ گەیشتن بە حەقیقەت، نەك تەنیا بۆ تێرکردنی ویستی زانستی، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە پرسی بوونی خودا و، ئامانج لە بوونمان و، رزگاربوون لە دەروونماندا چەسپاوە و، پێویستە ببێتە ئامانجی ئامانجەکانمان.

کاتێك دەستم بەم گەشتە کرد و لە کاتی بیرکردنەوەم لە هەر بیرو ڕایەك لەو بیرو ڕایانەی خستوومەتە ڕوو ئامادەیی تەواوم تێدا هەبووە کە بیروڕای بەرامبەرم پەسەند بکەم. چونکە نابێت لە ئەنتۆنی فلو کەمتر بین لە گەڕان بە دوای حەقیقەتدا، کاتێك شوێن یاسای سوقرات دەکەوت: (شوێنی بەڵگە دەکەوین جا بۆ هەر کوێمان ببات). من وایدەبینم کە بەڵگە بەرەو دڵنیایی تەواوی بردین.

**لەگەڵ ئەنتۆنی فلو :**

لەبەشی یەکەمی (گەشتی عەقڵ)دا، گەشتی مامۆستای فەلسەفەی بەریتانی (سێر ئەنتۆنی فلو)مان خستەڕوو، تا گەیشتە ئەوەی کە (خودایەك هەیە)، کە پێشتر یەکێك بوو لە توندترین بێباوەڕی سەدەی بیستەم.

**لە گەشتە عەقڵییەکەی ئەنتۆنی فلو ئەم دەرەنجامانەی خوارەوە دەخەینە ڕوو:**

**یەکەم:** بێباوەڕێکی بچووك لە ماڵێکی دینداردا، بەبێ هیچ پاڵنەرێکی ڕوون.

فەیلەسوفەکەمان لە باوکیەوە خۆشەویستی دانایی و ویستی عەقڵی و ڕێبازی شیکاری ورد فێر بوو بە میرات بۆی مابووەوە. پاشان ڕۆڵی ئەو پیاوانە هات کە بە ئازادی بیر ناسرابوون، تا ئەو چەمکانەی لە هزردا بچەسپێنن، لەناویاندا هەندێك مامۆستاکانی لە قوتابخانەو زانکۆدا. هەروەها بارودۆخی هزری ئازاد کە یانەی سوقرات لە ئۆکسفۆرددا فەراهەمی کردبوو، ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لەسەر چوونی بەرەو پسپۆڕی لە فەلسەفەدا.

ئەنتۆنی فلو خۆی پێمان دەڵێت کە ئەم گەشەسەندنەی پاڵنەری ئەوەی بووە کە گرنگی بە جیهانی هزر بدات، بەڵام پاڵنەری ڕۆیشتن بەرەوبێباوەڕی نا بۆیە دەڵێت: من هێشتا نازانم کە بۆچی چەمکی خودایەتیم ڕەتکردۆتەوە!

لەوانەیە (گرفتی خراپە و ئازار) لە تەمەنی پازدەساڵیدا، لە هەموو پرسەکان زیاتر کاریگەری لەسەر ئاڕاستەکەی بەرەو بێباوەڕی هەبوو بێت، بەو پێیەی کە نەیدەتوانی ئەوە لە هزریدا ڕێکبخات کە بەسەر مرۆڤدا دێت لە خراپەو ئازار و لە بەرامبەریشدا خۆشەویستی خودای بە بەزەیی بۆیان وێنا بکات.

**دووەم:** بەرگێکی جوانی بەبەر فەلسەفەدا کرد کە شایەنی نەبوو، فلو لە تەمەنی بیست و حەوت ساڵیدا، لێکۆڵینەوەکەی (ساختەیی زانستی لاهوت)ی بڵاوکردەوە کە تێیدا بەڵگە بێباوەڕییەکانی خۆی خستبووەڕوو و لە هەمان کاتدا بانگەوازی بۆ گفتوگۆی بەردەوام دەکرد لە نێوان فەیلەسووفەکان و باوەڕدارەکان.

پاشان لە کتێبەکانیدا بانگەوازی بۆ ڕێبازی زانستی دەکرد، بۆ تێکشکاندنی چەمکەکانی ئایین و خوایەتی. هەروەك چۆن داوای لە دیندارەکان دەکرد کە بەڵگە لەسەر بوونی خودا بخەنە ڕوو، کە پێشتر بەرپرسیاریەتی سەرشانی بێباوەڕان بوو کە بەڵگە لەسەر نەبوونی خودا بخەنە ڕوو.

**سێیەم: گۆڵپارێزی بێباوەڕیی**

ئەنتۆنی فلو بوو بە گۆڵپارێزی بێباوەڕیی لە ڕۆژئاوادا، چونکە زۆر بانگهێشت دەکرا، چ بۆ پێشکەشکردنی کۆڕو وتار یان بۆ دیمانەی تەلەفزیۆنی. هەزاران کەس لە گفتوگۆکانی لەگەڵ باوەڕداراندا ئامادە دەبوون، کە لە ڕێی دەزگاکانی ڕاگەیاندنیشەوە پەخش دەکران.

کتێب و لێکۆڵینەوە و بەڵگەکانی بووبوون بە کارنامەی بێباوەڕان لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا.

**چوارەم: هەنگاوەکانی لە بێباوەڕییەوە بەرەو گومان**

هێڵێکی یەکلاکەرەوەی ڕوون نییە لە گەشتی ئەنتۆنی فلو دا، لە نێوان بێباوەڕی و باوەڕبوون بە خودا.

ئەنتۆنی فلو پێمان دەڵێت، کە ئەو گۆڕانە پاشخانێکی زانستی گەورەی لە پشتە، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا ڕوویانداوە. ئەو دۆزینەوانە دووپاتیان کردۆتەوە کە گەردوون و ژیان و ئەو ئاڵۆزییەی تێیاندا هەیە، ناکرێ بۆ ڕێکەوت بگێڕدرێتەوە، بەڵکو پێویستە خودایەکی دانا و بە توانایان لە پشت بێت، ئەمانەش ئەو چەمکانەن کە (بزووتنەوەی دیزاینی زیرەك) هەڵیان گرتووە و باوەڕی بەوە هەیە کە (گەورەترین و سەرسوڕهێنەرترین دۆزینەوەی زانستی سەردەم ئەوەیە کە خودایەك هەیە).

**پێنجەم: لە گومانەوە بەرەو دڵنیایی.**

ئەنتۆنی فلو جیهانی تووشی سەرسوڕمان کرد، کاتێك لە بەیاننامەیەکدا کە تۆڕی هەواڵی ئەسۆشێتد پرێس لە دیسەمبەری ٢٠٠٤ بڵاوی کردەوە کە تێیدا ڕایگەیاند کە باوەڕی بە خوای بەدیهێنەری گەردوون هەیە و، لە ساڵی ٢٠٠٧ کتێبێکی دەرکرد بە ناونیشانی (خودایەك هەیە) کە تێیدا بە درێژی باسی گەشتەکەی دەکات و هۆکارەکانی باوەڕهێنانی باس دەکات.

لە کتێبەکەدا هاتووە:

((ئێستا باوەڕی تەواوم هەیە کە گەردوون لە سەر دەستی بەدیهێنەرێکی زیرەك هاتۆتە بوون و، ئەو یاسا نەگۆڕ و گونجاوانەی لە بووندا هەن ڕەنگدانەوەی ئەوەن کە دەکرێ ناوی بنێین (هزری خودا)).

هەروەها باوەڕم هەیە کە درووستبوونی ژیان و جۆراوجۆری زیندەوەرەکان لە سەرچاوەیەکی ئاسمانییەوە نەبێت درووست نابێت.

بۆچی ئێستا بیروڕام وایە؟ دوای ئەوەی بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدە بێباوەڕ بووم؟

**زانستی هاوچەرخ پێنج دووریمان نیشان دەدات کە ئاماژەن بۆ خودای بەدیهێنەر:**

١- گەردوون سەرەتایەکی هەیەو، لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون.

گەیشتنی زانست بەوەی کە گەردوون سەرەتایەکی هەیە (کە دەگەڕێتەوە بۆ ١٣،٧ ملیار ساڵ) و، هەروەها کە گەردوون لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون، ئەو گەیشتنە پاشخانێکی فەلسەفی و ئایینی هەیە کە زانا ماددیگەراکان لە گەیشتن بەو ڕایە نەیانزانیبوو.

یەکەم دەرەنجامی ئەو ڕایەش دانپێدانانە بە خودای بەدیهێنەری گەردوون، دوای ئەوەی زاناو فەیلەسوفە ماددیگەراکان نەیانتوانی بگەنە بیردۆزێکی گونجاو کە درووستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە لێکبداتەوە، بەبێ یاریدەی خودای بەدیهێنەر.

٢- سرووشت لە سەر یاسای نەگۆڕ و بە یەکەوە بەستراو دەڕوات

گومان لەوەدا نییە کە ڕێکخراوی و گونجان لە سرووشتدا (کە بە یاساکانی سرووشت ناسراون) پێویستی بە داننانە بە دانەری ئەم یاسایانە، بەڵام ئەوەی زیاتر ئاماژەیە بۆ خودای بەدیهێنەر ئەوەیە کە ئەم یاسایانە هەموو بوونەوەریان گرتۆتەوە و، لەگەڵ یەکتردا بەیەکەوە بەستراون و، دەکرێ بە دارشتەی بیرکاری ورد گوزارشتیان لێبکرێت، کە ڕەنگە لەلاپەڕەیەك زیاتر نەگرێت.

٣- درووستبوونی ژیان، بە هەموو ئەو وردی و ئامانجدارێتییەی تێیدایە، لە ماددەی نازیندوو.

هەموو زیندەوەران لە بوونی ئامانجێکدا هاوشێوەن، ئەویش پارێزگاریکردنە لە بوونیان، هەر فەرمانێك لە فەرمانەکانیشیان (وەك جووڵە و هەناسەدان) ئامانجێکیان هەیە کە خزمەتی ئەم ئامانجە گشتییە دەکەن. چۆن ماددەی نازیندوو ئەم ئامانجدارێتییەی وەرگرتووە؟

بە هەمان شێوە هەموو زیندەوەران لە بوونی سیستەمی (دی ئێن ئەی و ئار ئێن ئەی) هاوشێوەن. ئەم سیستەمە هەموو سیفەتە بنەڕەتی و فەرمانیەکانی هەڵگرتووین و بۆ نەوەکانی دواترمان دەگوازێتەوە، هەروەك چۆن هەموو کردارە کیمیاییە پێویستەکانی بۆ ژیانی خانە ئاڕاستە دەکات و ئەو سیستەمەش لە ئاستێکی زۆر ئاڵۆزدایە، چ لە بنیاتدا چ لە کرداردا.

ژیانیش هیچ نییە جگە لە چەند زانیارییەك و چەند کارلێکێکی کیمیایی ئاڵۆز کە سیستەمی دی ئێن ئەی ئاڕاستەی دەکات، بەڵام قورستر کێشەی پێکهاتنە. ئاخر چۆن دەکرێ ئەو وشانەی لەسەر لاپەڕەیەك دەیاننوسین و تێیاندا وەسفی مرۆڤ دەکەین (جا هەر چەند بە وردیش بێت) دەکرێ ببێتە مرۆڤێکی ڕاستەقینە (لە گۆشت و خوێن)!

ڕێکەوتی هەڕەمەکی و هەموو ئەو یاسا سرووشتیانەی دەیانزانین، هەموویان بە یەکەوە ناتوانن لێکدانەوە بۆ ژیان لە ماددەی نازیندوو بکەن.

٤- گەردوون و هەموو ئەوەی تێیدا هەیە، بارودۆخی نموونەیی بۆ دەرکەوتنی ژیانی مرۆڤ دەڕەخسێنن، کە بە بنەمای مرۆیی ناسراوە.

هەرچەند زانیاریمان لە سەر وردی بنچینەی گەردوون زیاتر ببێت، زیاتر بۆمان دەردەکەوێت کە پێداویستییەکانی مرۆڤ گونجاوە. ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئەم گەردوونە بۆ پێشوازی کردنمان ئامادەکراوە.

ئەوەی زانا و فەیلەسوفە ماددیگەراکان دایانناوە لە لێکدانەوە بۆ ئەم گونجانە جێگای گاڵتەجاڕییە و، داننان بە خودای بەدیهێنەری ئەم گەردوونە لە ڕووی زانستییەوە ڕەواترە!!

٥- عەقڵ، تایبەتمەندی مرۆڤ

توانای عەقڵی مرۆڤ لە بیرکردنەوەی لۆژیکی لە پرسە ماددییەکان و چەمکە ڕووتەکان و هەستکردن بەوەی لە دەوروبەرمانە و ئەوەی لە ناخماندایە و، هەستکردن بە خورد، ناکرێ لە ماددەی نازیندوو دروست بووبن، چونکە ئەوەی هیچی نەبێت هیچیش نابەخشێت، هەروەها ناکرێ سەرچاوەی ئەو توانایانە مێشکی مرۆڤ بێت! چونکە زمانی کارۆکیمیایی مێشك، کە لە خانە زیندووەکانی تر چالاکتر نییە، ناتوانێت بە هەموو ئەو ئەرکانە هەڵبستێت و هەموو ئەو داهێنانانەی ژیارستانیەتی مرۆڤایەتی دایهێناون دابهێنێت. هیچ ڕێگاچارەیەك نەماوە جگە لە پەنابردنە بەر جیهانی دواوەی سرووشت بۆ لێکدانەوەی توانا سەرسوڕهێنەرەکانی عەقڵ.

زۆربەی چەمکە هەڵەکان دەربارەی عەقڵی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ چواندنی بە کۆمپیوتەر، بەڵام سێ جیاوازی جەوهەری هەیە لە نێوان ڕۆڵی ئێمەو کۆمپیوتەر: ئێمە هەر کارێك دەکەین بە مەبەست دەیکەین - ئاگامان لەوەیە چی دەکەین - و تێدەگەین خەریکی چین. بانگەشەکردن بۆ ئەوەی کە کۆمپیوتەر تێدەگات کە چی دەکات وەك ئەوە وایە بڵێین ئامێری DVD تێبگات و چێژ لەو گۆرانی و مۆسیقایانە وەربگرێت کە پەخشی دەکات!.

ئەنتۆنی فلو بەڵگە باوەڕپێکراوەکانی بەوە تەواو دەکات کە:

بە تەنیا بەرهەمی زانستی هاوچەرخ نەبوو کە بووە هۆی گۆڕینی بیروڕاکانم، بەڵکو دووبارە بەو بەڵگە فەلسەفیە کلاسیکیانەدا چوومەوە کە پێشتر بەرەو بێباوەڕییان بردم، پاشان هەمان یاساکەی سوقراتم جێبەجێ کرد کە بە درێژایی ژیانی فەلسەفیم لە سەری ژیابووم:

(شوێنی بەڵگە بکەوین جا بۆ هەرکوێمان ببات)، ئەم جارەیان بەڵگە بەرەو باوەڕی بردم.

**شەشەم: کۆتایی ڕێگا**

ئەنتۆنی فلو پێمان دەڵێت، کە ئەگەرچی باوەڕی بە خودای بەدیهێنەری گەردوون هەیە، بەڵام دوو دەستەواژە هەن کە هەر لە سەردەمی بێباوەڕییەوە وەری گرتوون و هێشتا ڕای نەگۆڕیوە:

**یەکەم:** فلو بیرۆکەی بەرجەستەبوونی خودای ڕەها لە شێوەی مرۆڤ (مسیح)دا ڕەتدەکاتەوە، لە کاتێکدا کە مەسیحییەکان باوەڕیان بەوە هەیە.

**دووەم:** فلو نەگەیشتۆتە بەڵگەی عەقڵی و زانستی لەسەر پەیوەندی نێوان خوداو مرۆڤ لەڕێی وەحییەوە.

پاشان، ئەنتۆنی فلو باوەڕی بە خودای بەدیهێنەر هەیە، بەڵام باوەڕی بە ئایینە ئاسمانییەکان نییە، بۆیە بەلایەنگری ئایینی سرووشتی هەژماردەکرێت، ئەگەرچی ئامادەیی تێدا هەیە کە باوەڕ بە ئایین بهێنێت ئەگەر بەڵگەی لەسە دەستبکەوێت.

لە کۆتایی بەرهەمی بەشی یەکەم (شیکردنەوەی کتێبی خودایەك هەیە) ئەو قسەیە بۆ ئەنتۆنی فلو تۆمار دەکەین کە دەڵێت:

من ئێستا باوەڕم بەخودای تاك و تەنیا هەیە

واجب الوجود

نامادی، هیچ گۆڕانی بەسەردا نایەت

توانای ڕەها و زانستی ڕەهای هەیە.

تەواوی چاکە لەوەوەیە[1]

---

(١) گومان لەوەدا نیە کەم ئەم جۆرە وەسفەی خودا تا ڕادەیەکی زۆر لەگەڵ بیروباوەڕی ئایینە ئاسمانییە یەکخوا پەرستەکان یەکدەگرێتەوە.

پاشان فلو دەڵێت: فەلسەفە ئەرکە سەرەکییەکەی خۆی زۆر بە سەرکەوتوویی جێبەجێ کرد کاتێك گەیشتە لێکدانەوەی دروستبوونی بوون بەبوونی خودایەکی بەدیهێنەر، کە گەردوونی دروستکردووە بەجۆرێك کە گونجاو بێت بۆ پێشوازیکردن لە بوونەوەرێکی عاقڵ و دانا، کە مرۆڤە.

من لەرێی عەقڵ بەوە گەیشتم، بەبێ هیچ دەستێوەردانێکی غەیبی سنوورشکێن، لە وەحی و موعجیزە (هەروەك چۆن لە ئایینە ئاسمانییەکاندا هەیە)، گەشتی من گەشتی عەقڵ بوو نەك گەشتی باوەڕ.

## گەشتەکە تەواو دەکەین :

وەك تەواوکەرێك بۆ گەشتەکەی ئەنتۆنی فلو، کە لەسەر ئایینە ئاسمانییەکان وەستا بەشی دووەمی کتێبی (گەشتی عەقڵ)مان نووسی، کە تێیدا بەڵگەی زانستی و لۆژیکیمان خستەڕوو لەسەر پەیوەندی نێوان زەوی و ئاسمان و ڕاستی ئایینی حەق.

**لەم بەشەشدا ئەم بەرهەمانەمان دەستکەوتووە :**

**یەکەم: بەڵگەی گەردوونی حەق Cosmic Argument**

زانست سەلماندوویەتی کە گەردوونەکەمان سەرەتایەکی هەیە و، لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون، کە بە تەقینەوە گەورەکەی گەردوون ناسراوە، کەواتە پێویستە بەدیهێنەری یەکەمی هەبێت. هەروەها ئەو وردەکارییە سەرسوڕهێنەرەی لە بنیاتی گەردووندا هەیە، دڵنیامان دەکاتەوە کە دیزاینەرێکی زیرەکی لە پشتەوە هەیە.

سەرەڕای ڕاستی و دروستی ئەم بەڵگە لۆژیکییە و پشتبەستنی بەزەمینێکی ڕەقی زانست و فەلسەفە، بەڵام هێشتا زۆرن ئەوانەی لە داننان بەدیزاینەرێکی زیرەکی بە توانا ڕادەکەن کە گەردوونی دروستکردووە و، نکۆڵیکردنیان لەم چەند خاڵە خۆی دەبینێتەوە:

١- خستنەڕووی هەندێك بۆچوون لەسەر بەڵگەی ئەوەی کە گەردوون سەرەتایەکی هەیە لەگەڵ بەڵگەی ئەوەی کە پێویستی بە بەدیهێنەری یەکەم هەیە.

لە گرنگترین ئەو بۆچوونانەش بیردۆزی (گەردوونی ناجێگیر) و بیردۆزی (گەردوونی دایك)ە، کە پسپۆڕان پێیان وایە لە خەیاڵی زانستی نزیکە نەك زانست، چونکە هیچ بەڵگەیەکی زانستی پشتگیری ناکات.

٢- دوای ئەوەی بێباوەڕان نەیانتوانی بگەنە بنچینەیەکی ماددی بۆ گەردوونەکەمان، هیچیان لە بەردەستدا نەما جگە لەوەی بڵێن دەکرێ گەردوون لە نەبوونەوە بێتە بوون، بەبێ هۆکار بەڵام هەڵەیی هەموو بەڵگەکانیان دەرکەوت.

هەروەها ئەم قسەیە زانست لە بنچینەدا دەڕووخێنێت، چونکە زانست هەڵدەستێت بە گەڕان بەدوای پەیوەندی نێوان ڕووداو و بکەرەکەی، کە بە یاسای هۆ و ئەنجام The law of couse and Effect ناسراوە و، یەکێکە لە دانپێدانراوە عەقڵییەکان.

٣- دوای ئەوەی بێباوەڕان بێتوانا بوون لە پێشکەشکردنی لێکدانەوەیەکی ماددی بۆ درووستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە، بایاندایە سەر هێرشکردنە سەر چەمکی خودایەتی و گوتیان:

- ئەگەر هەردەبێ دان بە بەدیهێنەری یەکەمدا بنێین، ئایە هەر دەبێ خودا بێت؟

زانیمان ئەو سیفەتانە چین کە پێویستە لە بەدیهێنەری یەکەمدا هەبن لە (ئەزەلیەت و، زانست و، دانایی و، توانا و، توانای بڕیاردان و ....) کە بەرزی بکاتەوە بۆ پلەی خوایەتی، هەتا ئەگەر بێباوەڕانیش ناوی بنێن (سرووشت).

- ئەگەر بەدیهێنەری یەکەم خودا بێت، کێ درووستی کردووە؟

ئەوەی ئێمە بەدوایدا دەگەڕێین بەدیهێنەری هەموو بوونەوەرە، کەواتە نابێت خۆیشی بەدیهێنەری هەبێت، کەواتە پرسیارەکە لە ڕووی عەقڵی واقیعییەوە هەڵەیە.

- هەر کاتێك دیندارەکان لە پێشکەشکردنی لێکدانەوەیەکی زانستی بۆ دیاردەیەك بێ توانا بوون پەنا دەبەنە بەر خودای پڕکردنەوەی بۆشاییەکان God of Gaps و،

گومان لەوەدا نییە کە زانست لە ئاییندەدا لێکدانەوەی ماددی بۆ درووستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە دەخاتەڕوو.

سەلماندمان کە داننان بە بوونی خودا بۆ پڕکردنەوەی کەمووکورتییەکی کاتیی زانست نییە، بەڵکو بۆ چەند پرسێکە کە خۆیان دەڵێن لە دەرەوەی پسپۆڕی ئەوان دایە، وەك ئەوەی کە چی لە پێش تەقینەوە گەورەکە هەبووە؟ و چۆن ژیان بەبەر ماددەی نازیندوودا کراوە.

تەنانەت دەتوانین بڵێین: کە ماددیگەراکان خۆیان وەك (خودای پڕکردنەوەی بۆشاییەکان پەنا دەبەنە بەر زانست! بەو پێیەی کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە زانست دەگاتە پێشکەشکردنی لێکدانەوەی ماددی بۆ هەموو پرسە غەیبییەکان کە فیکری ماددی لە بەرامبەریدا بێتوانایە.

گومان لەوەدا نییە کە ئەوەی ئێستا خستمانەڕوو لە وەڵامدانەوەی سێ نکۆڵییەکە دەچێتە سەر بەڵگە گەردوونییەکە لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر و تا پلەی یەقین بەرزی دەکاتەوە.

**دووەم: بنەمای مرۆیی حەق Anthropic Princ**

ئەوەی لە بنەمای گەردوون و ئەو یاسایانەی بەڕێوەی دەبەن وردببێتەوە، بە تەواوی لەوە تێدەگات کە گەردوون بە جۆرێك بنیاتنراوە کە بۆ گەشەکردنی ژیان و مرۆڤ گونجاو بێت.

بوونی گەردوون لەسەر ئەم شێوەیە، پێویستی بە کۆنترۆڵێکی وردی دەیان سەلمێنراوی فیزیایی هەیە. وەك بارستایی زۆر لە تەنۆلکەکانی ژێر گەردیلەیی و بارگە و خێراییان، هەروەها هێزی کێشکردن و دوورکەوتنەوەی نێوان گەلەستێرەکان و نێوان تەنۆلکە وردەکان و، خێرایی ڕووناکی و، چەندانی تر.

هەر کەموکوڕییەك لە نرخی ئەم سەلمێنراوانەدا ڕوویدات، ئەوا جێگیری گەردوون و ژیان دەشێوێت.

بە هەمان شێوە خاسیەتە سرووشتییەکانی هەسارەی زەوی (قەبارەی - هێزی کێشکردنی - دووری لە خۆر - خێرایی خولانەوەی - ئەستووری توێکڵی زەوی - تایبەتمەندییەکانی ئاو...) زۆر بە وردی ڕێکخراوە، کە لەگەڵ درووستبوونی ژیان و بەردەوامبوونی و دەرکەوتنی مرۆڤ بگونجێت.

بنیاتی گەردوون و هەسارەی زەوی لەم شێوەیە کە گونجاوە بۆ درووستبوونی ژیان و مرۆڤ، کە بە لێکدانەوەی ئامانجی گەردوون (Why?) ناسراوە، لەگەڵ بوونی هیچ لێکدانەوەیەکی فیزیایی (ئامرازی) بۆ دیاردە سرووشتیەکان (How?) تێکناگیرێت. چونکە هەرچی لە دەوروبەرمانە ئامراز و ئامانج بەرێوەی دەبەن، ئێمە بە ناو دەرمانەکەمان قوت دەدەین تا شیفامان بۆ بێت.

ئەوەی بەهێزیی بەڵگەی بنەمای مرۆیی زیاتر دەکات، ئەوەیە کە جیهان بە تەنیا ئامادە نەبووە بۆ ژیان و بەس، بەڵکو بۆ دەرکەوتنی زیندەوەری ژیر و زیرەکی وەك (مرۆڤ)یش ئامادەکراوە، بەوەی پێداویستییە دەروونی و عەقڵییە تایبەتییەکانی بۆ ئامادەکراوە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەندازەیەکی کەمتر لەوەش بەس بوو بۆ درووستبوونی ژیان.

**سێیەم: پەیوەندی مرۆڤ بە خودا پەیوەندییەکی فیترِی سۆزدارییە**

چەمکە ئاینییە عەقڵییەکان، دەکرێ بابەتیانە بپێورێن.

یەك عەقیدە و بیروباوەڕە، بەڵام لە زیاتر لە سەد قۆناغدا پێمان گەیشتووە.

مرۆڤی سەرەتایی پەنای بردە بەر ئەفسانەکان، پاشان بۆ فەلسەفە، ئەویش بۆ لێکدانەوەی دیاردە سرووشتییەکانی دەوروبەری، پاشان بۆ وەڵامدانەوەی پرسە زانستییە گشتگیرەکانی.

سێ فیترەتیش لە دوای گەڕان بە دوای ئەو دیاردە سرووشتی و پرسانە هەبوون.

١- هۆشیاری فیترِی بەبوونی خودا.

٢- هەستکردن بە خواست لەسەر وەرگرتنی ئایینێك، کە لە ژیاندا پشتگیری لە مرۆڤ بکات و ڕێگاو سەرەنجامی بۆ دیاری بکات.

٣- دامەزراوەی ڕەووشتیی، ئەمەش بە پێچەوانەی ئەوەیە کە هەندێ کەس بانگەشەی بۆ دەکەن لەوەی کە چەمکە ڕەوشتییەکان ڕێژەیین و، هەموو ئایینەکان لەسەر چەمکێك کۆکن کە ئەو لایەنە فیترییەی مرۆڤ پڕ دەکەنەوە. بەڵگەش لەسەر ئەوە دەستگرتنی شوێنکەوتووانی ئایینێکە بە ئایینەکەیانەوە، ئەگەر زۆر شتی دژە عەقڵیشی تێدا بێت.

سەرەڕای ئەوەش، ئایین بە شێوەیەکی گشتی دامەزراوەیەکە کە دەکرێ بە تەنیا لایەنێکی هەڵبسەنگێنرێت، ئەویش لە ڕێی هەڵسەنگاندنی سێ پێکهاتە سەرەکیەکەی (پێکهاتەی پەیامەکە - پێغەمبەر - خودا). پاشان دەکرێ بابەتیانە بڕیار لەسەر ڕاستی و هەڵەیی ئایینی ژێر لێکۆڵینەوە بدرێت.

**چوارەم: ئایینی سرووشتی: د. جیکڵ و مستەر هاید**

لایەنگرانی ئایینی سرووشتی وایدەبینن کە خودا گەردوونی درووستکردووە و، یاساکانی دارشتووە کە بەشێوەیەکی خۆکرد بەڕێوە بچێت، واتا گەردوون تەنیا خۆی بەسە و، پێویستی بە دەستێوەردانی دەرەکی نییە (گەردوونێکی داخراوە).

ئەم تێڕوانینە، ئەگەرچی دان بە خودای بەدیهێنەردا دەنێت، بەڵام غەیب و هەرچی پەیوەندداره بە گەردوون و بوونەوە دووری دەخاتەوە، پاشان پیرۆزی لەبەر هەموو دیاردەکان دادەماڵێت بە مرۆڤیشەوە. لەم لایەنە ئایینی سرووشتی هاوشێوەی چەمکی سیکۆلاریزمە، کە ئەمیان چەمکێکی سیاسی کۆمەڵایەتی ئایینییە.

بیری سیکۆلار مرۆڤ وەك بەشێك لە سرووشت سەیر دەکات، لەبەر ئەوەی سیکۆلارەکان ئایین وەك سەرچاوەی زانست و ڕەوشت و یاسا ڕەتدەکەنەوە و، ئەوانە لە ئەزموونی مرۆڤ وەردەگرن و، لە کۆتاییدا مرۆڤ لە جیاتی خودا بە ڕەها دەزانن.

هەروەها سیکۆلارەکان وەك کوشتنی بەردەوامی عەقڵی مرۆڤ سەیری باوەڕبوون بە ئایین دەکەن، لەوە بێئاگان کە نیچە کاتێك ئەو دەستەواژەی گووتووە ئاماژەی بۆ ئایینی مەسیحی کردووە.

هەروەها سیکۆلارەکان ئەوەی دیندارەکان ئاماژەی بۆ دەکەن بەوەی کە فیترەتە (هەستی خودایی و ئایینی و ڕەووشتی) وایدەبینن کە بۆماوەیین و بەدرێژایی مێژوو بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی مرۆڤ دانراون.

لە کۆتاییدا سیکۆلارەکان وایدەبینن کە مرۆڤ چەمکی خودای داهێناوە، تا لە کاتی پێویستیدا پەنای بۆ ببات و، ئەوەش مەبەستی نیچەیە کە گوتوویەتی: مرۆڤ خودای درووستکردووە.

**پێنجەم: خوایەتی و هەستی ئایینی و دامەزراوەی ڕەوشتی لە جیناتماندا چەسپاوە و ناوەندی دەماری خۆیشی لە مێشکماندا هەیە**

ئەگەر زانایانی دەروونناسی مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی سۆزدار دەبینن کە مەیلێکی سرووشتی هەیە بۆ وەرگرتنی چەمکە ڕەوشتییەکان و وەڵامدانەوەی هەست و سۆزە ئایینییەکان، ئەوا بۆ زانایانی بایۆلۆجی سەلمێنراوە کە ئەو فیترەتانە لە جیناتماندا چەسپاون.

بیردۆزی میزاج و ڕەووشت Entertainment and character inventory کە لە ناوەندە دەروونییەکان پێشوازییەکی گەرمی لێکرا ئەو واتایە دووپات دەکەنەوە، چونکە بیردۆزەکە کۆمەڵێك ئامادەیی دیاریدەکات کە لە باوانەوە بۆ منداڵەکان دەمێنێتەوە، لەوانە ئامادەیی بۆ تێپەڕاندنی سنووری خود Self - Transcendence کە مەیلی ئایینی و ڕۆحییەکانیش دەگرێتەوە.

دوای بیست ساڵ لە خستنەڕووی بیردۆزەکە، دین هامەر کۆمەڵێك جینی دیاریکرد کە وا لە مرۆڤ دەکات چەمکەکانی خوایەتی و دینداری وەربگرێت و ناوی نا جینی خوایەتی یان جینی باوەڕ.

لە سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەم هوارد گاردنەر (زیرەکی ڕۆحی - بوونگەرایی) وەك یەكێك لە جۆرەکانی زیرەکی ناساند کە مرۆڤ هەیەتی.

لێکۆڵەران گەیشتونەتە ناوەندە مێشکییەکان کە بەرپرسن لە هەست و سۆزە ڕۆحی و ئایینییەکانمان و، لە دەزگای حووفی بوونیان هەیە، کە بەرپرسە لە

کاردانەوە و هەست و سۆز و، هەروەها لە توێکڵی مێشکیشدا لە شوێنی بە یەکگەیشتنی بەشەکانی مێشك: دیوار و ناوك و دواوە بوونیان هەیە.

ئەو زانیارییە زۆرانە بوونە هۆی دەرکەوتنی زانستێکی نوێ کە لە بنچینە مێشکییەکان و دەمارییەکانی دینداری دەکۆڵێتەوە و ناوی نرا Neuro - Theology.

**شەشەم: دڵ تەنیا ترومپای خوێن نییە**

دڵ کاریگەری لەسەر فەرمانە عەقڵی و هەستییەکانی مێشك هەیە، تا چارەگی سەدەی ڕابردوو، زانستەکانی شیکاری فسیۆلۆجی تەنیا وەك ترومپایەك سەیری دڵیان دەکرد، لەکاتێکدا ئایینەکان و شارستانیەتە کۆنەکان و کلتووری گەلان بیرکردنەوە و هەست و سۆزیان بە دڵ بەستۆتەوە.

هەندێك زانا هەستان بە لێکۆڵینەوە لەو هەڤدژییە و، گەیشتن بە چەند دەرئەنجامێك کە تێڕوانینمان بەرامبەر بە دڵ لە ڕەگ و ڕیشەوە دەگۆڕێت، لەوانە:

١- دڵ وەك موگناتیسێکی بەهێز و بەرهەمهێنەرێکی کارەبایی چالاك کاردەکات و، بواری کارۆموگناتیسی دڵ کار دەکاتە سەر چالاکی کارەبایی مێشك و، ئەو کاریگەرییە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە قەدی مێشك (ناوەندی بەڕێوەبردنی لە کۆئەندامی دەماری خۆنەویست) و، لە وزەی مێشك (ناوەندی فرمانە کاردانەوەییەکان) و میهاد (وێستگەی یەکەمی هەست و سۆزەکان). و لە کۆتاییشدا بۆ توێکڵی مێشك کە بەرپرسە لە چالاکییە فکرییەکانمان و هەست و سۆز و ڕەفتارەکانمان و، لە ڕێی ئەو پەیوەندییەوە دڵ کاردەکاتە سەر فەرمانە جۆراوجۆرەکانی مێشك.

هەروەك چۆن پێوەرە وردەکان سەلماندوویانە، کە کارلێك لە نێوان بوارە کارۆموگناتیسییەکانی دڵی ئەو کەسانەدا ڕوودەدات کە تا سێ مەتر لە یەکەوە دوورن!!

ئەو شەپۆلە کارۆموگناتیسیانە زۆر زانیاری هەڵدەگرن، هاوشێوەی شەپۆلەکانی تەلەفۆن و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و کەناڵە ئاسمانییەکان و ئینتەرنێت، لێکۆڵەرە

کارۆموگناتیسییەکان وای بۆ دەچن کە ڕوودانی ئاڵوگۆڕی ئەو هەست و سۆزە بەشێوەیەکی باش یان خراپ لە ڕێی ئەو کارلێك و تێکەڵبوونە ڕوودەدات.

٢- دڵ مێشکێکی بچووکی هەیە! کە دوور لە ناوەندەکانی مێشکی (گەورە) توانای ڕێکخستنی کارەکانی خۆی هەیە، بەڵکو ئەو مێشکە بچووکە بەشداری ئاڕاستەکردنی چالاکی کارەبایی مێشکەکانمانی هەیە.

٣- دڵ وەك غوددەیەك کاردەکات، کە کۆمەڵێك هۆڕمۆن دەردەدات کە بەشدارن لە ئاڕاستەکردنی کاری مێشك (سەرەڕای فەرمانەکانی تری) و، گرنگترینیان هۆڕمۆنی سۆزدارییە (ئەکسیتۆسین).

دۆزینەوەی ئەو فەرمانانە ئاماژەن بۆ ئەوەی کە دڵ ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە هەست و سۆز و بیرکردنەوە، بەڵام نامانەوێت بۆ دەرەنجامی کۆتایی باز بدەین، ئەگەرچی دڵنیاین کە لێکۆڵینەوە بایۆلۆجییە نوێیەکان لە ئایندەدا پەردە لەسەر ئەوە لادەدەن کە چۆن مرۆڤ وەك دامەزراوەیەکی تەواو لە (ڕۆح - دەروون - عەقڵ - لاشە) وەك چۆن دی ئێن ئەی و مێشك ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە ئاڕاستەکردنیدا، دڵیش هەمان ڕۆڵ دەبینێت.

**حەوتەم: ئەی مرۆڤ. تۆ کێی؟**

**تۆ تەنیا چەند ماددەیەکی کیمیایی و بازنەی کارەبایی نیت.**

کاتێك زانا بایۆلۆجییە ماددیگەراکان بەرپەرچی کێشەی (خوودی مرۆڤایەتی) یان دایەوە، ڕێبازی وردکردنەوە (اختزالي)یان بەکارهێنا، کە مرۆڤ ورد دەکاتەوە بۆ ئەندامەکان پاشان شانەکان پاشان خانەکان پاشان تەنۆلکە پاشان گەردیلە پاشان بۆ پێکهاتەی ژێر گەردیلەیی، تا ئەو ئاستەی کە تەنیا بوارەکانی وزە دەمێننەوە. بێگومان ئەمەش بۆتە هۆی داتاشینی ژیان (بایۆلۆجیا) بۆ ماددە (فیزیا) و پێش ئەم قۆناغەش خودی مرۆڤایەتی بوونی نەمایەوە و جگە لە ماددە هیچی تر نادۆزنەوە.

ئەگەر زانایانی بایۆلۆجی گەیشتبنە بنەمای دی ئێن ئەی و میکانیزمی کارکردنی سەرسوڕهێنەری، ئەوا پێویستە بزانین کە دی ئێن ئەی بریتی نییە لە ژیان. دی ئێن ئەی هیچ نییە جگە لەو وەسفەی کە پێویستە بنچینەی مرۆڤی لەسەر بێت، بەڵام چۆن ئەو وەسفە مرۆڤێکمان لە گۆشت و خوێن بۆ دێنێتە بوون، کە بە درووستکردن Morphogenesis، ناسراوە ؟ نازانین!

هەروەها ئەگەر ترپە کارۆ کیمیاییەکانی مێشك شێوازی کاری ماددی مێشك بن، ئەوا ئەو هەست و سۆزانەی هەستی پێدەکەین و چۆن بیر لە چەمکە ڕووتەکان (وەك ئازادی و نکۆڵیکردن لە خود ) دەکەینەوە، ئەوا ئەو ترپانە ناتوانن لێکدانەوەی بۆ بکەن، لە پاشان ڕاستیەکە ئەوەیە کە بەو شێوەیە سەیری مرۆڤ بکەین کە خودێکی ناماددی هەیە کە چالاکییە عەقڵییە جیاوازەکان ئەنجام دەدات و مێشك وەك ئامرازێك بەکار دەهێنێت.

لێکۆڵینەوە زانستییەکان و هزری فەلسەفی لەم ساڵانەی دواییدا گرنگییان بە خودی مرۆڤ داوە، کە چالاکییەکانی مێشك لە ڕووی عەقڵی و هەستی و ئاییینیەوە ئاڕاستە دەکات و، بە هەمان شێوە بە دوای بەڵگەی مانەوەی ئەو خودە لە دوای مردنی جەستە (ڕۆح لە دیدێکی ئایینیدا) دەگەڕێت و دەکۆڵێتەوە.

وادیارە گەیشتووینەتە دووڕیانێك و، لەسەرمان پێویستە یان دان بەوەدا بنێین کە خودی مرۆڤ مەحاڵە لە کیمیا و فیزیا دابتاشرێت و، لەسەرمان پێویستە لە دەرگای زانستە ئایینیەکان بدەین تا ئەو مەتەڵەمان بۆ بدۆزێتەوە، یان ئەوەتا زانست بگۆڕێت بۆ هۆکارێك بۆ سەلماندنی هزرە ماددییەکانی پێشوەختە، لە جیاتی ئەوەی ئامانجی گەڕان بێت بە دوای حەقیقەتدا.

واتە زانست بۆ گەڕانە بەدوای حەقیقەت، نەك بیکەینە ئامڕازێك بۆ سەلماندنی ئەو هزرە ماددییانەی پێشتر بڕیارمان لەسەر داوە.

**هەشتەم: زانست ئامرازی بێباوەڕان و جێی تۆمەتباری توندڕەوەکان**

لە فیکری مرۆڤدا لە بەرامبەر چەمکە دۆزراوەکانی زانستدا دوو ئاڕاستەی دژیەك دروستبوون، ئاڕاستەیەکی بێباوەڕ کە زانستی کردە داردەستی سەلماندنی چەمکەکانی خۆی و، ئاڕاستەیەکی دیندارانە کە وایدەبینێت خودی مرۆڤ بوونێکی غەیبی هەیە و لەگەڵ بوونی ماددی جەستە پەیوەندی نییە. ئەو ئاڕاستەیە وایدەبینێت کە پەیوەندی نێوان جینات و مێشك و دڵ و نێوان هەست و سۆزە ئایینی و ڕۆحیەکان بەڵگەی نکۆڵیکردن لە دیدی غەیبی بۆ خودی مرۆڤایەتی (ڕۆح) دەداتە دەستی بێباوەڕان.

گومانیش لەوەدا نییە کە پێویستە هەر یەك لە شتە ماددییەکان و شتە غەیبییەکان لە شوێنی خۆیاندا دابنرێن، پاشان بە یەکەوە ببەسترێنەوە، لەلایەنی فێڵکردن و هەڵبەستن نا، بەڵکو لەلایەنی دانان بە حەقیقەتدا.

**زانستی ئامراز...**

بێباوەڕان دۆزینەوە زانستییەکانیان لە بواری گەردوون و ژیان بە هەل زانی تا بانگەشەی ئەوە بکەن کە پێویستیمان بە خودا نییە، چ بۆ دروستبوونی ئەو دیاردانە یان بۆ بەردەوام بوونیان.

وەڵامەکانی (گەشتی عەقڵ) لە دەوری بەڵگەکانی بێباوەڕان دەخولێتەوە لەسەر ئەوەی کە چاوەڕوانی زانست ناکرێ تا دەگاتە لێکدانەوەیەکی ماددی بۆ ئەو کێشانەی فەیلەسووفەکان و زانا مسوڵمانەکان وروژاندوویانن (وەك دروستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە و، سەرچاوەی وردی ڕێکخراوی یاسا فیزیاییەکان و، دروستبوونی ژیان لە مادده و، ئەو توانا سەرسوڕهێنەرانەی عەقڵی مرۆڤ هەیەتی)، لەبەر ئەوە داننانمان بە خودایەکی دانای بەدیهێنەر لە نەزانیی زانستی سەرچاوەی نەگرتووە تا دواتر بڕەوێتەوە، بەڵکو لە بێتوانایی کۆتایی زانا ماددیگەراکان سەرچاوەی گرتووە، کە دادگەرەکانی خۆیان لەو پرسانەدا داوا دەکەن بۆ ئایین و فەلسەفە جێبهێڵدرێت.

**زانست لە ناو قەفەسی تۆمەتدا...**

وەڵامەکانی (گەشتی عەقڵ) بۆ دیندارەکان و توندڕەوەکان کە زانست تۆمەتبار دەکەن، لە دەوری ئەم چەند خاڵەی خوارەوەدا دەخولێتەوە:

١- پەیوەندی هۆکاری لە نێوان خودی مرۆڤ (ڕۆح/ نەفس/ عەقڵ) و لاشە لە ڕووی ئاینییەوە سەلمێنراوە، بە ئایەتی قورئانی پیرۆز:

﴿يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا﴾ الإسراء: ١٠٧

واتە: خێرا سەری ڕێز و نەوازش دادەنەوێنن.

﴿تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ﴾ المائدة: ٨٣.

واتە: دەبینی چاوەکانیان ئەسرینی خۆشیی هەڵدەڕێژێت.

هەروەها زانستیانەش سەلمێنراوە، (هەر یەکێکیش لە ئێمە ئەگەر سەرنجی کەسانی دەوروبەری بدات تێبینی دەکات) کە هۆکارە بۆماوەییەکان کاریگەرییان لەسەر ئاڕاستە ئایینی و ڕەوشتییەکانمان هەیە.

٢- پەیوەندی نێوان خودی مرۆڤ و لاشە ئەوە تێدەپەڕێنێت وڵاخی سواریی ڕۆح بێت، یاخود لاشە شتێکی کەم بێت کە مرۆڤ تەنیا بە سوککردن و بەجێهێشتنی بتوانێت ڕۆحی بەرزبێتەوە. چونکە خودا وەك بوونێکی تەواو و گشتگیر سەیری مرۆڤ دەکات.

قۆناغەکانی کردنە شاهێد و تەکلیف و فەرمان بە چاکە و قەدەغەکردنی خراپە و، حەشر و حیساب و، پاشان ژیانی ئەبەدی لە بەهەشت یان دۆزەخ، هەموو ئەوانە بۆ ڕۆح و جەستەن و بە یەکەوە بەستراون و هەر یەکەیان عاقیبەت و ئەنجامەکانی ئەوە هەڵدەگرێت کە پێکهاتەکەی تر کردوویەتی.

لەبەر ئەوە پێویستە دید و بۆچوونمان دەربارەی مرۆڤ بەو پێیەی گشتگیر و تەواوە دووبارە دابڕێژینەوە، ئەو کاتە توانای ئەوەمان دەبێت کە وێنای پەیوەندی

بایۆلۆجی نێوان لاشە و ڕۆحانەتییەکان و هەست و سۆزەکان و ڕەفتارەکان بە ئاسانی بکەین.

٣- دەردی گەلەکەمان لە پشتگوێخستنی هۆکار و دەرەنجامەکانە، بە بیانووی ئەوەی کە خودا هەرچی بیەوێت دەیکات، تەنانەت زۆرێك هەن کە جیاکردنەوەی هۆکار و دەرەنجامەکان بە مەرجی تەندرووستی بیروباوەڕ دەزانن! ئەو بابەتەش کاریگەری لەسەر هەموو ژیانمان داناوە، بەو بابەتەش کە ئێمە خەریکین قسەی لەسەر دەکەین.

٤- پێویستە لە بیرکردنەوەی زانستیدا جیاوازی بکەین لەنێوان زانیاری زانستی و تەئویل و لێکدانەوەکانی. ئەگەر بێباوەڕان بوونی پاشخانێکی بایۆلۆجی بۆ هەست و سۆزەکان دەکەنە بەڵگە لەسەر ماددییەتی مرۆڤ و هەڵەیی چەمکە ئایینییەکان، ئەوا هەمان زانیاری (پاشخانی بایۆلۆجی هەستەکان) وەك بەڵگە بۆ فیترەتی ئایینی و ڕەوشتی بەکاردێت، کە دینداره‌کان دەڵێن لە جینەکانماندا هەیە و لە مێشکماندا بەرنامەڕێژ کراوە.

٥- لەسەر ئەو دیندارانەی گرنگی بە زانست و فەلسەفە دەدەن پێویستە کە بەرپرسیاریەتەکەیان لە (نوێکردنەوەی گوتاری ئایینی) بگرنە ئەستۆ، دوای ئەوەی خستنەڕووی خراپ و ڕووکەشی هزری ئایینی بووە هۆی دوورکەوتنەوەی زۆر لە مسوڵمانان و نا مسوڵمانان لە ئایین.

٦- لەو سێ دەیەی کۆتاییدا جیهان گرنگی زۆری بە پەیوەندی نێوان بایۆلۆجیا و ئایین دەدات و، ئەمەش هەلێکی زێڕینە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بێباوەڕیی. ئەمەش بە نکۆڵیکردن لە زانست و دەستکەوتەکانی نابێت، بەڵکو جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کە زانست بۆتە دەروازەی ڕاست و فراوانی بیروباوەڕ بۆ هەموو مرۆڤایەتی لەم قۆناغەی ئێستادا.

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت: ٥٣

**نۆیەم: مرۆڤ بۆ ئامانجێك بەدیهێنراوە**

**سەرچاوە .. ڕێگا .. كۆتا**

ئیسلام جیا لە ئایینە یەكخوا پەرستەكانی تر و ئایینەكانی تر تاكە ئایینە لە گرنگیدان بە وردەكاری پرسی بوونی مرۆڤایەتی: سەرچاوە .. ڕێگا - كۆتا. گرنگیدانی ئیسلام بەم پرسە، جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە ئیسلام ئایینی حەقە؛ بەو پێیەی ئامانجی ئامانجەكان لە ئاییندا ئەوەیە كە مەبەستی خودا لە بوونەوەرەكانیدا ڕوون بكاتەوە.

ئەوە دڵنیا دەكەینەوە كە گەشتی مرۆڤ لە بووندا (دیار و غەیبی) وەك ئەوەی ئیسلام دەیخاتەڕوو لە هەموو قۆناغەكانیدا لەبەردەم بێژینگی عەقڵدا دەچەسپێن و پاشان وەك حەقیقەتێكی زانستی ڕەها دەردەكەوێت.

**ئەو ڕێبازەی ئیسلام بۆ مرۆڤی دیاریكردووە تا لە پەیوەندیدا بێت لەگەڵ خودا (كە ئەوە ئامانجی بوونی مرۆڤە)، لەسەر ئەم چەمكانەی خوارەوە وەستاوە:**

١- فیترەتی ئایینی مرۆڤ وای لێدەكات هەست بە بوونی خودا بكات و، پاڵنەریەتی بۆ پەیوەندیكردنی بە خوداوە. پاشان ئایینی حەق دێت تا عەقڵی مرۆڤ بدوێنێت و ڕێگای باوەڕ تەواو بكات، (نوور لەسەر نوور).

٢- عەقڵ بە تەنیا (بە بێ هیدایەتی خودایی، كە لە ڕێبازی ڕاست خۆی دەنوێنێت) مرۆڤ بەرەو هاوەڵ دانان دەبات (واتە داننان بە خودای تر).

٣- لە كاتێكدا كە هەستەوەرە ماددییەكان (بیستن - بینین - بەركەوتن...) بێ توانان لە دەرك كردنی خودا، ئەوا پێویستە لە ڕێی بیركردنەوە لە بەڵگەكانی خودا هەست بە خودا بكەین، لە ڕێی:

كتێبی خوێنراوی خودا: قورئانی پیرۆز

كتێبی بینراوی خودا: ئاسۆكان و دەروونی زیندووەكان.

لەبەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز ڕێبازی گەیشتن بە خودای لە سێ وشەدا کۆکردۆتەوە: (فیترەت - عەقڵ - وەحی)

**دەیەم: ئەوەی کە عەقڵی ساغ دەرکی پێدەکات لە یەك خاڵدا لەگەڵ ڕێبازی ئیسلام بە یەك دەگات**

ئیبن توفەیل (فەیلەسووفی ئەندەلوسی کە لە سەدەی دەی زاینی ژیاوە) لە چیرۆکی (حەیی کوڕی یەقزان) ئەوەمان بۆ دەخاتەڕوو کە چۆن عەقڵی فەلسەفی توانی بگاتە خودای بەدیهێنەر و، هەندێك لە سیفەتەکانی و زیاتر لە ئەنتۆنی فلو، بەوەی کە لە ڕێی عەقڵەوە ئەوەی دیاری کردووە کە پەیوەندی نێوان خودا و مرۆڤ چۆن بێت.

هەروەك چۆن ئیبن توفەیل ئەوەی دووپاتکردۆتەوە، کە ئەوەی ڕێبازی ئیسلام دەیخاتەڕوو و، ئەوەی عەقڵی ساغ (بە بێ وەحی ئاسمانی) پێی دەگات لە چەمکەکانی حەق و چاکە و جوانی، ڕاجیایی لە خاڵێکدا بە یەك دەگەن.

**خـــوێنەری بەڕێز...**

لە ئێستادا کە گەیشتی بە کۆتایی لەوانەیە دەرەنجامەکان و کۆتایی کتێبەکە بۆت دەرکەوتبێت کە (گەشتی عەقڵ) گفتوگۆ لەگەڵ پێنج جۆر عەقڵ دەکات، کە بێگومان تۆ لە خانەی یەکێك لەو پێنجانە دای:

١- دیندارێك کە دەیەوێت باوەڕەکەی بەرز بکاتەوە، لە باوەڕی سەر ناسنامە بۆ باوەڕی دڵنیایی، تا دڵی پڕ ببێت لە هەستکردن بەوەی کە خودا حەقە:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣

لەوانەشە مرۆڤ لە پلەی ترس نزیکبێتەوە:

﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَـٰٓؤُا۟ ﴾ فاطر: ٢٨

٢- دیندارێك کە حەقیقەتی مرۆڤی لەلا ونە، وەك بوونەوەرێکی تەواو و گشتگیر لە لاشە و نامادی (ڕۆح نەفس عەقڵ). و پاشان دیدێکی کوێرانەی کەم

ڕێزی بەرامبەر لاشە هەیە و، لە مرۆڤدا (وەك بوونەوەرێکی ڕاستەقینە) جگە لە خودی نامادی هیچی تر نابینێت.

٣- دیندارێك کە وایدەبینێت بیرکردنەوەی بەرامبەر ئایین کە لەسەری پەروەردە بووە ((تەواوی تەواوە))! بۆیە حەقی بە عەقڵ و زانست نەداوە بۆ پتەوکردنی دامەزراوەی باوەڕ. بەمەش زۆر شتی لێ ونبووە و لەوانەیە کار گەیشتبێتە ئەوەی ببێتە یەکێك لەو کۆمەڵانەی دوای ئەمە.

٤- دیندارێك کە بە قسە (گەورەکانی) بێباوەڕان دەربارەی بەشداری زانست لە دڵنیاکردنەوەی چەمکە بێباوەڕیەکان سەرسامە، تەنانەت ئەو قسانەش کە دەڵێن ((خودا وەهمێکی گەورەیە و، ئاین تلیاکی گەلانە))؛ بۆیە هەستێکی شاراوە بە کەم و کورتی لە دەروونیدا درووستدەبێت لە بەرامبەر ئەوەی کە تاکێکە لەو کۆمەڵە دواکەوتووە ( دیندارەکان) لە جیاتی ئەوەی هەست بە شانازی بکات.

٥- بێباوەڕێك کە بە زانست بارگاوی بووە، چ لە خۆ بە گەورە زانی بێت یان نەزانیی، و لە زانستدا بەڵگەی بێباوەڕی دەبینێت نەك بەڵگەی باوەڕ، بۆیە لەسەرمان پێویست بوو کە حەقیقەتەکەی بۆ ڕوون بکەینەوە تا لە نەفسی خۆی ڕزگاری بکەین.

هیوادارم خوێنەری ئەزیزم لە (گەشتی عەقڵ)ی ئەنتۆنی فلو و گەشتی مندا شتێکی وای دەستکەوتبێت کە لە گەشتی خۆیدا یارمەتی بدات.

لە کۆتاییدا بە یەقین و ئەزموونەوە دەڵێم:

فەلسەفە دەریایەکە جیاواز لە دەریاکانی تر، لە کەنارەکانیدا دەفەوتێی، بەڵام لە قوڵاییدا هەست بە ئارامی دەکەی.

## ئایا گەیشتینە کۆتایی گەشتی عەقڵ؟

بەڕاستی قسەیەکی جادوویی بوو، کە لە کاتی گەشتەکەمدا (گەشتی عەقڵ) دانایەك پێی گوتم: کاتێك سەرنجی دەوروبەرت دەدەی، بەجۆرێك سەرنجی بدە وەك ئەوەی یەکەمین جار بێت بیبینی، ڕاهاتن بە شتەکانی دەوروبەرمان بۆتە پەردەیەك لەبەردەم ئێمە و ڕاستییەکان، کە پێی دەڵێن (پەردەی ڕاهاتن).

ئامۆژگارییەکەم وەرگرت، دوای ئەوەی وام هەست دەکرد کە لە جیهانێکی تر دام، هەموو شتێکی دەوروبەرم بە نوێ دەهاتە بەرچاو و بە لێشاو پرسیار بە بیرمدا دەهات، لەو کاتەدا وتەی ئەرستۆم بیردەکەوتەوە کە دەڵێت (بە سەرسامبوون فەلسەفە دەستپێدەکات).

ئەگەرچی گەشتی عەقڵ لەو پرسانەی خستومانەتەڕوو یەقینی پێبەخشیوم، لە هەمان کاتدا گڕکانێك لە ئارەزووی زانستیشی لە ناخدا دروستکردووە، ڕێك وەك ئەوەی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) ئاماژەی کردووە: (دوو جۆر کەس قەت تێر نابن: داواکاری زانست و داواکاری پارە).

تێڕوانینە سەرسوڕهێنەرە منداڵانەییەکە منی دایە دەستی کێشەگەلێك کە زۆر گەورەتر بوون لەوەی وەڵامیان دایەوە، بەمەش بە وەڵامدانەوەی ئەو کێشانە تامی (سەرسامی یەقین)م کرد، ئەوەی کە ئەبوبەکری سددیق (ڕەزای خوای لەسەر بێت) لە دووعاکانیدا دەیفەرموو: (خودایا زیاتر بە خۆتەوە سەرسامم بکە)!!

**بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەش، نموونەیەك دێنمەوە:**

قورئانی پیرۆزم دەخوێندەوە، لەوێ سەرنجی نیعمەتەکانی خودای بەدیهێنەری کاریەجێم دەدا، لەوانە نیعمەتی (بینین)، جا کاتێك بە (دیدە نوێکە) دۆزینەوەی زانستی نوێ دەربارەی ئەو هەستە تووشی سەرسوڕمانی کردم:

ڕووبەری تۆڕی چاو سەنتیمەترێك دەبێت و، ئەستوورییەکەی نیو مللیمەترە و، ئەو بەشە تەنکە بچووکە سەد ملیۆن دەمارەخانەی تێدایە کە لە پێنچ چین ڕیز

بوون! جا کاتێك تەنیا فۆتۆنێك لە رووناکی بکەوێتە سەر، ئەوا کۆمەڵێك کارلێك دەستپێدەکات کە سەد هەزار بەشی کیمیایی لەخۆ دەگرێت!

ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە هەر چرکەیەکدا دە وێنە بکەونە سەر تۆڕی چاو، کە هەر یەکێکیان لە ملیۆنێك خاڵ پێکدێت، ئەگەر ئەو کردارە بە چاوێکی ئەلیکترۆنی بچوێنین دەبینین کە پێویستە ئەو کۆمپیوتەرەی چاوە ئەلیکترۆنییەکە کۆنترۆڵ دەکات لە یەك چرکەدا ملیارێك کردار ئەنجام بدات تا بگاتە ئەنجامێکی نزیك لەو ئەنجامە.

چۆن چاو سیفەتە فیزیاییەکانی رووناکی ناسین تا سیفەتە بایۆلۆجییەکانی پێکبێنێت تا بتوانێت تەواو ببێت و لەگەڵیدا خۆی بگونجێنێت؟ چۆن ئەو گونجانەی نێوان فۆتۆن و دەمارەخانەکان پەیدابوو؟ بۆچی لاشەی مرۆڤ لە شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان تەنیا رووناکی هەست پێدەکات؟

چاو بە تەواویی و بێ کەموکوڕی لەگەڵ تەقینەوە گەورەکەی زیندەزانیی کۆمپری، بەر لە پێنج سەد ملیۆن ساڵ درووستبووە، هەروەها سەلمێنراوە کە یەك جینی لە پشتەوەیە کە بە ناوی (pax-6) ناسراوە و لە هەموو چاڵەکاندا بە جیاوازی جۆرەکان بەم جۆرەیە. ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە چاو بە پەرەسەندنیی هەڕەمەکیی درووستنەبووە، وەك داروینیزمەکان بانگەشەی بۆ دەکەن و، پێویستە بەدیهێنەرێکی زیرەکی هەبێت.

کاتێك لەوە تێگەیشتم مووچڕکم بە لەشدا هات، بەتایبەت کاتێك زانیم روانین شتێکە و بینین شتێکی ترە. چونکە سەرەڕای ئەوەی کە روانین چالاکییەکی فیزیایی زۆر ئاڵۆزە، بەڵام بینین (کە واتای ئەوەی دەبینین بیزانین) شتێکی ترە لە جیهانێکی ترەوەیە، جیاواز لە جیهانی ماددە و یاسا سرووشتییەکانی.

ئەم بیرکردنەوەیە چەند پرسیارێکی تری خستە مێشکمەوە؛ بۆ نموونە چۆن خەونەکانمان دەبینین و، واتایان چییە و، چۆن ئەو کەسەی بە کوێری لەدایك بووە خەونەکانی دەبینێت. هەروەها چ جیاوازییەك هەیە لەنێوان میکانیزمەکانی بینینی کارۆکیمیایی لە مێشکدا و ئەوەی لە واقیعدا دەیبینین و، ئەوەی لە

خەونەکانماندا دەیبینین و یان ئەو هەڵاوسانەی بینینەی لەلای نەخۆشەکانی شیروفینیا روودەدات و.. چەندین پرسیاری تر!

ئەگەر پێشتر (وەك نموونە) چەند نهێنییەکی زانیاریم خستبێتەڕوو کە دید و تێڕوانینە نوێکەم نیشانیاندام، دوای ئەوەی پەردەی راهاتنم لادا، بۆم دەرکەوت کە هەر وردەکارییەکی بوونەوەر لە دەوروبەرمان نهێنی هاوشێوەی لەخۆ گرتووە. دەتوانی رابمێنی لە:

هەر رووەکێك لە مێرگێکدا سنووری زیرەکترین کۆمپیوتەر تێدەپەڕێنێت لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ سیستەمی دەوروبەری: هێزی کێش کردن و تیشکی خۆر و ئاو و هەوا...!

ئەو گوڵانەی چێژ لە رەنگ و بۆنی وەردەگرین زۆربەی خواردنی رووەکیمان بۆ دابین دەکەن!

مێشوولەی سەر درەختی میوەکان بەسەر هەموو ئەو کێشانەدا زاڵ دەبێت کە رووبەڕووی ئەندازیارانی فڕین دەبێتەوە، بەوەی کە دوو سەد جار لە یەك چرکەدا باڵەکانی لێکدەدات!

لە نێوان بلورە شەش لایە کریستاڵییەکانی بەفردا دوو دانەی هاوشێوە نابینی، رێك وەك پەنجەمۆری پەنجەکانمان!

جێی خۆیەتی کە مێیینەی باڵندەکان بە دەنگی نێرینەکان مەست بن، بەڵام ئێمەی مرۆڤ بۆچی پێی مەست دەبین، کە جگە لە چەند لەرینەوەیەك لە هەوادا هیچی تر نین؟!

بۆچی بوونەوەریی چەندخانەیی درووست بوون، لەکاتێکدا بوونەوەرە یەك خانەییەکان لەرووی بایۆلۆجییەوە بەتواناترن؟!

بۆچی زۆربوونی رەگەزیی درووست بوو، سەرەڕای ئەوەی کە زۆربوونی ناڕەگەزیی گەرەنتی نەمریی زیندەوەرەکان بوو کە نە پیربیان تووش ببێت نە مردن؟!

لە کۆتایی ئەو نموونانە لەگەڵ خانەی زیندوودا هەڵوەستەیەك دەکەم، کە لە چرکەیەکدا دوو هەزار بەشی پرۆتین درووست دەکات. ئایا دەزانی کە ئەم کردارە بۆ زیرەکترین و بەتواناترین کۆمپیوتەر ملیار ملیار ساڵی دەوێت (واتا نزیکەی ١٠^١٢٧ ساڵ) تا لەرووی تیۆرییەوە لە چاوی بکاتەوە؟!

ئەمانە چەند نموونەیەکن لە سەدان و هەزاران نموونەی تر.

بیرکردنەوە لەو بابەتانە وایلێکردم کە دڵنیابم لەوەی کە (گەشتی عەقڵ) تەواو نەبووە و تەواو نابێت.

بەکارخستنی عەقڵ بۆ دەوروبەرمان وەك ئاڵوودەبوونی کەسی ئاڵوودە وایە، هەرچەند زیاتر بە کاری بێنێت زیاتر ئارەزووی دەکات.

هەر کات پەردەی راهاتنمان دڕاند و بە جۆرێکی تر سەیری دەوروبەرمان کرد، ئەو کات لەو بوونەوە رووناکی دڵنیایی سەرسوڕهێنەرمان پێدەگات!

بەو قسەیەش کۆتایی دێنم کە پێشتریش باسم کرد، بەوەی کە مرۆڤ نابێت باوەڕی وەك ئەو کەسە وابێت کە دەڵێت:

I made up my mind, don't bother me with facts

من بڕوای خۆمم یەکلاکردۆتەوە و لاپەڕەکانم پێچاوەتەوە، بۆیە بە حەقیقەت و راستەقینە نوێکان بێزارم مەکە!

# پێرستە وشە

ئ

## ر



## ز



## ژ

## س



## ش



## ع

# ناوەرۆك

# گەشتی عەقڵ

ئەم کتێبە:

بۆ : ئەو بێباوەڕەی بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێت،
بۆ : ئەو دیندارەی بەدوای یەقینی بیروباوەڕەکەیدا وێڵە،

پێشنیار دەکەم کە ئەم کتێبە بە وردی و تێفکرینەوە بخوێنێتەوە، چونکە خستنەڕووی دیدێکی تەواو نوێیە بۆ چەمکە زانستیەکان و شۆڕشێکە بۆ تێگەیشتن لە چەمکە ئایینییەکان.

د. احمد عكاشه.

دەربارەی بابەتی کتێبەکە کە گۆڤاری (تایم Time) ی ئەمریکی نووسیویەتی:

((لە سەرووی هەموو دۆزینەوە زانستییە سەرسوڕهێنەرەکانی سەدەی بیستەم ئەوەبوو؛ سەلمێنرا کە (خودا) بوونی هەیە)).




**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس



+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice


10.000 دینار